ناوی کتێب: لەگەڵ پەیامبەر (ﷺ)
**ناوی نووسەر: ئەدهەم شەرقاوی**
وەرگێڕانی: خالد تۆفیق پێنجوێنی - ئازاد عەبباس گڵێجاڵی
**دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن**
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
**نۆبەتی چاپ: دووەم ٢٠٢٠**
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
**تیراژ: (١٠٠٠) دانە**
**ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان**
**ژمارە (١١٩٠)ـی ساڵی (٢٠١٨)ـی پێ دراوە.**



**ناوەندی ڕێنوێن**
07701932749 - 07501269689
hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com
سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

مۆڵەتدانی نووسەر بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە

أستاذ صلاح الدين:

لكم مني كل الحب

والحب قد يأتي على هيئة كتاب

هديتي لكم عن طريق مركز رينوين

كتابي "مع النبي"

وبين دفتي المصحف ما يكفي

أن يكون وطناً للجميع

أدهم

# پێڕست

## پێشەکی وەرگێڕ

بسمه تعالی

قسـەکردن لـە بارەی پەیامبـەرەوە، قسـەکردنە لەسـەر دانسـقەترین و ناوازەتریـن مرۆڤـی مێـژوو بـە ڕەهایـی، زیادمـان نەگوتـووە گـەر بڵێین، قسـەکردنە لەسـەر نهێنیی بوون (سـر الوجـود)، بـەو واتایـەی تـەواوی جوانییەکانی بـوون لـە ئەزەلـەوە تا ئەبەد لە نـووری حەقیقەتی موحەممـەدەوە سـەرچاوە دەگـرن، گـەر قسـەکردن لەسـەر «بـوون» ئاریشـەی گـەورەی دونیـای فەلسـەفە و لێکۆڵینـەوە ئایینییـەکان بێـت، دەبێـت لێکۆڵینـەوە لـە جیهانـی نهێنیـی «بـوون» ئاریشـەیەکی تـەواو گەورەتـر بێـت بـە شـێوەیەک هـزری مرۆڤـەکان بێتوانا بـن لـە دەرککـردن بـە نهێنیی نێـو کونـج و کوڵانەکانـی ئـەم دونیـا فراوانـە.

گەرچـی موحەممـەد وەک لایەنـی فیزیکـی (بـە جەسـتە) لەنـاو ئێمـەدا بوونـی نەمـاوە، بەڵام وجـوودی موحەممـەدی لـەوە دەرچـووە وجوودێکـی فیزیکـی بێـت، بەڵکـوو وجوودێکـی حەقیقیـی مەعنەوییـە و نەمـردووە و سـات بـە سـات لەگەڵمانـدا دەژی، ڕۆژانـە لەگـەڵ گوێبیسـتبوونی ئـاوازی بانگـی «أشـهد أن محمـدا رسـول اللـه» و ئاوازی «السـلام علیـک ایها النبي» لـە تەحیاتدا هەسـتی پـێ دەکەین.

موحەممـەد ئاوێنـەی تـەواوی جوانییەکانـی بوونـە، هەڵگـری چەندیـن تایبەتمەندییـە کـە پـەروەردگار بـە هیـچ دروسـتکراوێکی تری

نەبەخشیوە، تاکە دروستکراوە شەپۆلی زێی سەرشێتی گەردوونی بڕی و گەییشتە مەقامی (قاب قوسین)، پێشتر نەبووە هیچ یەکێک لەو سەدوبیستوچوار هەزار خۆشەویستانەی خۆی، تەنانەت لەو مەقامە نزیک بووبن، موحەمەد خاڵی ناوەندە لەنێوان مەخلوق و خالیقدا، ڕێکوڕەوان ئەو مەخلوقەیە کە لە لێکۆڵینەوە فەلسەفی و عیرفانییەکاندا بە مرۆڤی کامڵ (الأنسان الكامل) ناو براوە.

مەولانا لە «فیە مافیە»دا کاتێک باس لە پەیامبەر دەکات، دەیچوێنێت بە خۆر، تەواوی ئەوانی تر کە نوور و ڕۆشناییان لە پەیامبەرەوە وەرگرتووە دەچوێنێت بە چرا. پاشان باس لەوە دەکات، پەیامبەر سەرمەشقی سەرجەم عاریفان و خوداناسان و ئەهلی دڵە، مەقامی هیچ کەس لە خوداناسان و عاریفان بەراورد ناکرێت لەگەڵ مەقامی باڵای موحەمەد، ئەمە هەر ئەو وەڵامەیە مەولانا لە ڕێیەوە مەقامی باڵای پەیامبەر بە شەمس دەناسێنێت، کاتێک پرسیاری لێ کرد: (قل لي أيها الشيخ هل الرسول محمد أعظم أو أبو يزيد البسطامي) «ئەی شێخ پێم بڵێ، ئایا موحەمەدی پەیامبەر مەزنترە یان ئەبوویەزیدی بەستامی؟ مەولانا سەری لەم پرسیارە سووڕما و پێی گوت: چ پرسیارێکە! بەستامی بەرانبەر بە پەیامبەر موحەمەد و پەیامبەرانی تر، چ قورساییەکی هەیە؟

شەمس پێداگری دەکات و دەڵێت: ئەی ئەوە نییە پەیامبەر موحەمەد دەڵێت: (ماعرفناک حق معرفتك يا معروف)، ئەوە پەیامبەرە ڕۆژی حەفتا جار داوای لێخۆشبوون دەکات لە پەروەردگار، لە کاتێکدا بەستامی دەڵێت: (سبحاني سبحاني ما أعظم شأني) کام لەم دوو گوتەیە ڕاستن؟

مەولانا لە وەڵامدا دەڵێت: بەستامی تینوێتییەکەی زۆر نەبوو، بە ئاوێکی کەم تینوێتییەکەی شکا، جامی بەستامی لە یەکەم مەقامی

ویسالدا پڕ بوو و لێی ڕژا، ئەمە لە حاڵێکدا موحەمەدی پەیامبەر لە ڕۆژێکدا حەفتا مەقامی دەبڕی، لە هەر مەقامێکدا بچووکیی مەقامی پێشتری دەبینی. دواتر شەمس بە شێوەیەک کەوتە ژێر کاریگەریی ئەم وەلامەوە لە کتێبی « المقالات»دا بە ڕوونی دەڵێت: کەمترین فەرمودەی پەیامبەر -مەبەست پێی لاوازترینە- بە ڕیسالەی قوشەیری و هیچ کتێبێکی تر ناگۆڕمەوە.

لە ڕووی مەعریفییەوە موحەمەد گەورەترین مامۆستای مرۆڤایەتییە، بەو پێیەی مامۆستا و فێرکاری موحەمەد زاتی پەروەردگارە، کە وایە زانستی پەیامبەر زانستێکی کامڵە و مەعریفەکەیشی مەعریفەیەکی تەواوە و لە مەقامی بالادایە، ڕزگاربوون بە دەست نایەت، مەگەر بە شوێنکەوتنی ڕێگەی زولاڵ و بێگەردیی ئەو نەبێت کە عائیشە لە بارەیەوە دەیفەرموو: كان خلقه القران.

لە تەواوی ئایەتەکانی سەناخوانی ئازیزدا لە قورئاندا ئەوەی زیاتر سەرنجم ڕادەکێشێت، وێنای ئامادەگیی پەیامبەر، حورمەتی ئەو ئامادەگییە لەپاڵ تۆبەکردن وەک کەرەستەیەک بۆ ڕاگرتنی سزای یاخییان و تاوانباران

﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴾

میهرەبانیی موحەمەد لە ئاستێکدایە، نەک تەنها مرۆڤەکان، بەڵکوو تەنانەت دینگەی بێگیانیی مزگەوتێک لە حەسرەت فیراقی ئەو ئاهونالەی وەختە بگاتە ئاسمان، دەبێتە پارێزەری وشترێکی بەستەزمان لە ستەمی خاوەنەکەی، لە یەک کاتدا خۆشەویست و مەعشوقی زەوی و ئاسمان گیاندار و بێگیان، گەورە و بچووک، بە کورتی موحەمەد ئەو مەئوایەیە کە تەواوی بوونەوەران لە سایەیدا هەست بە ئارامی دەکەن، ئەو چیرۆکە ئەزەلییەیە کە دڵنەوازان هیچ

کات لە موتاڵاکردنی تێر نابن.

لە پاڵ موحەمەددا بوونی مەدینە وەک ڕووگەی ڕۆحی و مەعنەوی قورسایی تایبەتی خۆی هەیە بەهۆی خۆشەویستەوە، مەدینە بووە قیبلەی ڕۆحیی زۆرێک لە شاعیران و ئەدەبخوانان، لە دونیابینیی عاشقانی موحەمەددا مەدینە زۆر زیاترە لەوەی تەنها جوگرافیایەک بێت، مەدینە مەنزڵگەی دولبەرە. ئاوازی نەسیمی ژیانە، شەونمی دڵی تەڕی هۆزانڤانانە، لە ئاستی پێوەندی لەگەڵ ئەوانی تر. خۆشەویست بیووە ئاوێنە و عەکسی نووری ئەخلاقی باڵا و نووری نەبووەتی بەسەر هاوەڵانیدا دەبەخشیتەوە، ڕێک وەک ئەوەی مەحویی شاعیر دەڵێت:

بە نووری عەکسی پێغەمبەر ئەوەندە مونعەکیس بووبوون
غەریبی تازە هاتوو ئەیوت ئەمە پێغەمبەرستانە

چاوی دڵی «عەبدوڵڵای کوڕی مەکتوم»ی نابینا لە بینینی قەلبی خۆشەویست تێر نەدەبوو، عوکاشەی هاوەڵی ئاواتەخوازە بەشێک لە جەستەی دولبەری دڵی ببینێت، تا پڕ بە دەم هاواری «جسمي لجسمك فداء» بڵێتەوە، ئیتر لەم دۆخە زمان بە تەواوی دەشکێت، قسەیەک بۆ گوتن نییە مەحوی گوتەنی:

چ مەدحێکت بکەم لائیق بە تۆ یا خیر خلق الله
منی بێخێری نالائیق کە جبریلت ئەناخوانە

خالید تۆفیق پێنجوێنی
سلێمانی ـ بەهاری ٢٠١٨
kh.tufeeq12@gmail.com
07507738407

# خێر و چاکە

بوخاری لە خۆشەویستەوە دەگێڕێتەوە فەرموویەتی، پیاوێک بڕیاری دا ببەخشێت و خێرەکەی بەخشییە دزێک، خەڵکی کردیانە مقۆمقۆ و گوتیان، بەخشینەکەی داوەتە دزێک.

گوتی: خودایە سوپاس بۆ تۆ... دەبێت ببەخشم، دواتر خێرەکەی بەخشییە ئافرەتێکی زیناکار، خەڵکی کەوتنە مقۆمقۆ و بە سەرسامییەوە گوتیان، ئەم شەو خێرەکەی بەخشییە ئافرەتێکی لەشفرۆش، گوتی: خودایە، سوپاس بۆ تۆ... دەبێت ببەخشم.

ئەم جارە خێرەکەی بەخشییە دەوڵەمەندێک، خەڵکی کەوتنە مقۆمقۆ و بە سەرسامییەوە گوتیان، هاوکارییەکەی بەخشییە دەوڵەمەندێک، کابرا گوتی: خودایە، سوپاس بۆ تۆ لەسەر هاوکاریی دز و لەشفرۆش و دەوڵەمەند! پێیان گوت: بەخشینت بە دزەکە، بەڵکوو ببێتە مایەی دەستهەڵگرتن لە دزیکردن. بەخشینت بە زیناکار، بەڵکوو ببێتە مایەی دەستهەڵگرتن لە زینا. بەخشینت بە دەوڵەمەند، بەڵکوو ببێتە پەندێک و ببەخشێت لەوەی کە خودا پێی بەخشیوە.

## وانەی یەکەم

سروشتی خەڵکییە گەر ئارامت گرت لەسەر وەڵامنەدانەوەی خراپەی ئەوانی تر، بە ترسنۆک ناوت دەبەن. ماڵ و سامانت بەخشی، بە خۆدەرخەر و ڕیاباز ناوت دەبەن. هاوڕێیەتیی زانایانت کرد، دەڵێن: بۆ خۆدەرخستن خۆی نزیک دەکاتەوە. لەگەڵ تاوانبارێک تەوقەت کرد، دەڵێن: وەک ئەو وایە... لەگەڵ هاوسەرەکەت باش بوویت دەڵێن: وەک مەڕ وایە. هاوکار و هاوبەش نەبیت لە خراپەکانیاندا، دەڵێن گۆشەگیر و دۆگمایە. لە وەرگرتنی بەرتیل هاوبەشیان نەبیت، دەڵێن: گەمژەیە. باڵاپۆشیت کرد، دەڵێن: نەزانە. ئاگای لە مۆدێل نییە. ڕووت دابپۆشی، دەڵێن: ناشیرینییەکەی دەشارێتەوە. گوێڕایەڵیی خێزانت بیت، دەڵێن: کەسایەتیی لاوازە. خۆت بە، ڕێگە مەدە کاریگەریت لەسەر دروست بکەن، بتگۆڕن لەپێناو ڕەزامەندیی ئەوانی تر، سازش مەکە لەسەر ئامانجەکانت. دەبینیت زۆرینەی خەڵکی ڕازی نین لە پەروەردگاریان، ئیتر چۆن لە یەکتر ڕازی دەبن.

## وانەی دووەم

دەستی خەڵکی بگرە بەرەو لای پەروەردگار... تێبگە لەوەی پەروەردگار پەیامبەرانی ناردووە بۆ ڕێنوێنیکردنی خەڵکانی خراپ. گەر خەڵکی هەموویان باش بوونایە، ئەوا پێویستیان بە پەیامبەران نەدەبوو، تەنانەت خەڵکە تایبەتەکانیش پەروەردگار پەیامبەری بۆ ناردوون.

فیرعەونی بانگەشەکاری خودایەتی ﴿ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾. پەیامبەرێکی گەورەی بۆ نارد، بۆ ئەوەی گوتەیەکی نەرم بدات بە گوێیدا: قولا لينا. ئەوانەی دەیانگوت: بتەکان کچی خودان... باشترین دروستکراوی خۆی وەک پەیامبەر بۆ ناردن.

بەو شێوە لە تاوانی ئەوانی تر مەڕوانە، وەک ئەوەی پەروەردگاری ئەوان بێت، وەک بەندەیەکی سادە لە تاوانی ئەوانی تر بڕوانە، زەکاتی هیدایەت و ڕێنوێنیی پەروەردگارت ئەوەیە دەستی ئەوانی تر بگریت بەرەو لای پەروەردگار هیدایەت و ڕێنموویت بە ئازایەتیی خۆت نییە، منەتی پەروەردگارە لە سەرت. وەک لێقەوماوێک لە ئەنجامدەرانی تاوان بڕوانە.

بە دڵنیاییەوە نەخۆشی ئاسانترە لە گومڕایی، نەخۆشی مایەی دەستکەوتنی پاداشتە، بەڵام گومڕایی دەرئەنجامێکی مەترسیداری هەیە!

## وانەی سێیەم

ڕاستە ئێمە فەرمانی ئەوەمان پێ کراوە بڕیار لەسەر ڕووکەشی بابەتەکان بدەین، بەڵام دەبێت زیرەکتر بین لەوەی بابەتە ڕووکەشەکان بە هەڵەمان بەرن، هەندێک تاوانبار، خودا و پەیامبەریان خۆش دەوێت، زیاتر لەو کەسانەی کە بە ناوی ئایینەوە بازرگانی دەکەن... ئەو تاوانبارانە ڕادەستی ئارەزووەکانیان بوون و شەیتانەکانیان بەسەریاندا زاڵ بوون. بوخاری لە فەرموودەی عومەری کوڕی خەتتابەوە دەگێڕێتەوە: لە سەردەمی پەیامبەردا پیاوێک هەبوو ناوی عەبدوڵڵا بوو، نازناوی گوێدرێژ بوو، بەکەیف و قسەخۆش بوو، پەیامبەری دەهێنایە خەندە، شەرابی دەخواردەوە، پەیامبەر بەم هۆیەوە شەلاقی لێ دا، دواتر دوو جاری تر بەهۆی شەرابخواردنەوە شەلاقی لێ درا، بۆ جاری سێیەم پیاوێک لە هۆزەکەی گوتی: نەفرەتی خودای لێ بێت، بۆچی ئەوەندە ئەو کارە دووبارە دەکاتەوە.

پەیامبەر (دروودی خودای لێ بێت) فەرمووی: نەفرەتی لێ مەکەن، سوێند بە پەروەردگار، نەمزانیوە تەنها ئەوە نەبێت، کە خودا و پەیامبەری خۆش دەوێت، دڵەکان هەڵگری نهێنیگەلێکن، جگە لە خودا

هیچ کەسی تر ئاگاداری نییە. ئەوەی بالاپۆش نییە لەشفرۆش و بەدخوو نییە، ئەوەی گوێ لە مۆسیقا دەگرێت، ڕقی لە قورئان نییە، بەرگری لە تاوانباران ناکەم و بەهانەیان بۆ ناهێنمەوە، تەنها دەڵێم: دەستی ئەوانی تر بگرن بەرەو لای پەروەردگار.

## وانەی چوارەم

گەر ئێمە بە شێوەیەکی جوان و ڕەوشتێکی هێمنانە مامەڵە نەکەین، ئەوا بە دڵنیاییەوە نموونەیەکی خراپی خەڵکانی دیندار پێشکەشی ئەوانی تر دەکەین، بەم شێوەیە ئەوانی تر واز لە تاوانەکانیان ناهێنن بۆ ئەوەی ببنە دیندارێکی خوورەق و دڵڕەق، گەر نەبینە نموونەیەکی جوان بۆ ئەوەی ئەوانی تر چاومان لێ بکەن، بە دڵنیاییەوە نابێت لۆمەیان بکەین لەسەر ئەوەی نایانەوێت وەک ئێمە بن، مەبنە مایەی ئەوەی خەڵکی ڕقیان لە پەروەردگار ببێتەوە، تەوقەیەکی دۆستانەی کەسێکی ئەهلی مزگەوت لەگەڵ نوێژنەکەرێک، ڕەنگە ببێتە مایەی ڕاکێشانی بەرەو مزگەوت. ڕەنگە زەردەخەنە و وتەیەکی جوانی بالاپۆشێک ببێتە مایەی گۆڕینی سفورێک بۆ بالاپۆش، وتەی شیرینی خواپەرستێک ڕەنگە ببێتە مایەی ڕێنوێنیی مرۆڤێکی یاخی. گەر هەوڵەکانت لەنێو خەڵکیدا دەنگیان نەدایەوە... بە دڵنیاییەوە پاداشتی بانگەوازت چنگ دەکەوێت، بڕوانە ئەو هاوەڵەی پێشوو هاوکارییەکانی بەخشییە خەڵکانی زیناکار، دز و دەوڵەمەند.

خودا پێی نەگوت، گەر بتبەخشیایە داوێنپاکێک باشتر بوو، گەر بۆ مرۆڤێکی دەستپاک بوایە باشتر بوو، گەر بۆ هەژارێک بوایە باشتر بوو، بەلام لە ڕێگەی خەوێکی ڕاستەقینەوە هەواڵی پێ درا، کە بەخشینەکەی وەرگیراوە، بەڵکوو بەهۆی ئەم بەخشینەوە ئافرەتی زیناکار واز لە تاوانەکەی بهێنێت و کابرای دز واز لە دزییەکەی و بابای دەوڵەمەندیش بە خۆیدا بچێتەوە، چاو لە بەخشندەیی بەرانبەری بکات.

## جورەیجی خوداپەرست

بوخاری و موسلیم لە فەرموودەیەکدا دەگێڕنەوە، خۆشەویست فەرموویەتی جورەیج پیاوێکی خوداپەرست بوو... لە کوخێکدا سەرقاڵی خوداپەرستی بوو، ڕۆژێک دایکی سەردانی کرد، جورەیج نوێژی دەکرد، دایکی بانگی لێ کرد: جورەیج... جورەیج لە دڵی خۆیدا گوتی پەروەردگارا، نوێژەکەم یان دایکم! بەردەوام بوو لە نوێژەکەی، دواتر دایکی بەجێی هێشت. ڕۆژی دوایی بە هەمان شێوە دایکی هاتە لای و بانگی لێ کرد جورەیج گوتی: پەروەردگارا، دایکم یان نوێژەکەم، بەردەوام بوو لە نوێژەکەی وەڵامی دایکی نەدایەوە، دایکی بەجێی هێشت. بۆ ڕۆژی سێیەم دایکی هاتەوە، بە هەمان شێوە بانگی لێ کرد، جورەیج گوتی: پەروەردگارا، نوێژەکەم یان دایکم، بەردەوام بوو لە نوێژەکەی، دایکی نیگەران بوو، گوتی: پەروەردگارا، نەیمرێنی هەتا ڕووی داوێنپیسانی پێ نیشان دەدەیت.

بەنی ئیسرائیل لەنێو خۆیاندا بە سەرسامییەوە باسیان لە خوداپەرستیی جورەیج دەکرد، ئافرەتێکی قەشەنگی خراپەکار گوتی: گەر ئارەزوو بکەن لە خشتەی دەبەم، چەند جار خۆی بۆ نمایش کرد... جورەیج بە هیچ شێوەیەک لای نەکردەوە بە لایدا... دواتر لەگەڵ شوانێک دەستی تێکەڵ کرد و دووگیان بوو، دوای

ئەوەی منداڵەکەی بوو گوتی، ئەو منداڵەم لە جورەیج بووە، بەم هۆیەوە خەڵکی هێرشیان کردە سەر جورەیج و کوخەکەیان ڕماند و ئازاریان دا.

جورەیج گوتی: ئێوە چیتانە و چیتان دەوێت؟

گوتیان: زینات لەگەڵ ئەو ئافرەتە بەدڕەوشتە کردووە و ئەو منداڵەت لێی بووە.

جورەیج: منداڵەکە لەکوێیە؟

منداڵەکەیان هێنا...

جورەیج: مۆڵەتم بدەن نوێژ بکەم.

دوای تەواوبوونی لە نوێژ، منداڵەکەیان هێنا و جورەیج دای بە سکی منداڵەکەدا و گوتی: ئەی منداڵ باوکت کێیە؟

منداڵەکە کەوتە زمان و گوتی: فلانە شوانە.

دوای بینینی ئەم ڕووداوە سەرنجڕاکێشە، خەڵکی دەستیان کرد بە ماچکردنی جورەیج و دەستپێداهێنانی و گوتیان کوخەکەت لە ئاڵتوون بۆ دروست دەکەینەوە.

جورەیج گوتی: تەنها وەک ڕابردوو بۆم دروست بکەنەوە.

## وانەی یەکەم

نزا لە منداڵەکانتان مەکەن، نەبادا بەر ساتی گیرابوونی نزا بکەوێت، عومەری کوڕی خەتتاب جارێکیان پیاوێکی بەساڵاچووی بینی، دەستی شەلەل بوو، پێی گوت: دەستت چییەتی؟

کابرای بەساڵاچوو گوتی: لە سەردەمی جاهلیەتدا باوکم نزای لێ کردم دەستم شەلەل لێی بدات، نزاکەی گیرا بوو شەلەل لێی دا.

عومەر گوتی: ئەمە نزای باوکانە لە جاهلیەتدا، دەبێت نزایان لە ئیسلامدا چۆن بێت؟

وەرن با پێکەوە لەبری ئەوەی نزایان لێ بکەین، نزایان بۆ بکەین. کاتێک کیژۆڵەیەک لە ماڵدا قاپێک دەشکێنێت، پێی دەڵێن: خودا دڵت بشکێنێت، مەترسییەکی گەورەیە، گەر ئەم نزایە بەر ساتی گیرابوونی نزا بکەوێت. ئایا قاپێک نرخی دڵێکی هەیە؟

بۆچی لەبری ئەوە نەڵێن: سەلامەتیت؟ خودا باشت بۆ بکات.

گەر خوشک و برایەک بەشەڕ هاتن. دایک لە ساتی توورەیی و نیگەرانیدا دەڵێت، خودا تۆڵەتان لێ بکاتەوە. چی دەبێت گەر ئەم نزایە بکەوێتە ساتی گیرابوونی نزاوە؟ کێ لە ئێمە توانای تۆڵەی پەروەردگاری هەیە.

چی دەبێت گەر لەبری ئەمە بڵێن، خودا دڵتان یەک بخات؟

وەرن با پێکەوە دەستەواژەی (چاوت کوێر بێت)، بگۆڕین بۆ «خودا دڵت بکاتەوە». وەرن با پێکەوە دەستەواژەی (خودا توورەیی خۆیت بەسەردا برێژێت) بگۆڕین بۆ «خودا ڕێنوێنیت بکات». وەرن با پێکەوە زمانمان خاوێن بکەینەوە، پێش ئەوەی منداڵەکانمان وتە خراپەکانمان لێوە وەربگرن.

## وانەی دووەم

مرۆڤی داوێنپیس هیواداره هەموو خەڵکی داوێنپیس بن، مرۆڤی دز ئاواتەخوازە خەڵکی هەمووی دز بێت، ئیتر بەم شێوەیە لایەنگرانی پووچ و گومڕایی نیگەرانن لە چاکسازیی ئەهلی حەق و ڕاستی.

بوونی مرۆڤی دەستپاک، گورزێکی کردارییە لە ڕووی دزەکان.

بوونی مرۆڤی داوێنپاک، گورزێکی توندە لە پشتی خەڵکانی داوێنپیس.

بوونی کارمەندی بەڕەوشت، گورزێکی ئازاربەخشە لە ویژدانی فەرمانبەری بەرتیلخۆر.

ئەهلی حەق و ڕاستەقینە باسی ئەهلی باتیل دەکەن بە کەموکورتییەکانی ئەوان.

هەر لەبەر ئەوەیە دەیانەوێت وەک ئەوان بن.

گەندەڵکارانی بەنی ئیسرائیل، نیگەران بوون بە چاکی و چاکسازیی جورەیجی خوداپەرست، هەر بەم هۆیەوە ئافرەتێکی لەشفرۆشیان نارد بۆ ئەوەی جورەیجیش وەک ئەوانی لێ بێت.

موشریکەکانی ئەو کات نیگەران بوون لە تەوحیدی ئیبراهیم (سەلامی خودای لێ بێت)، لەبەر ئەوەی ئیبراهیم ڕەتی کردەوە وەک ئەوان بێت، فڕێیان دایە نێو ئاگرەوە.

لادەرەکانی هۆزی لوط (سەلامی خودای لێ بێت)، نیگەران بوون بە سەلامەتیی ئەخلاقیی لوط و گوتیان ﴿ أَخۡرِجُوٓاْ ءَالَ لُوطٖ مِّن قَرۡيَتِكُمۡۖ إِنَّهُمۡ أُنَاسٞ يَتَطَهَّرُونَ ٥٦ ﴾ (النمل)، «خێزانی لوت لە شاری خۆتان دەربکەن، چونکە ئەوان چاویان لە داوێنپاکییە».

## وانەی سێیەم

ئیماندار کاتێک دووچاری ناڕەحەتی و سەختییەک دێت، پەنا بۆ نوێژ دەبات، چونکە ئەو پێی وایە تەواوی کێشەکانی زەوی چارەسەکەرەکەیان لە ئاسمانە. جورەیج تەواوی ناسۆرییەکان ڕوویان لێ کرد، تۆمەتی داوێنپیسی و خستنەوەی منداڵێک کە لە پشتی ئەو نییە درایە پاڵی. لە وەڵامی تەواوی ئەم تۆماتانە گوتی: لێمبگەڕێن، با نوێژکەم بکەم، لە ڕێی دوو ڕکعەت نوێژەوە، ئاسمان پیلانی زەمینی پووچەڵ کردەوە و منداڵێکی شیرەخۆر بۆی کەوتە گۆ.

خوبەیبی کوڕی عەدیی (ڕەزای خودای لێ بێت)، بە دیلی کەوتە دەستی قورەیشییەکان، کاتێک ویستیان بیکوژن، پێی گوتن:

لێمبگەڕێن، با نوێژ بکەم.

خوبەیب باش دەیزانی جوانترین شتێک مرۆڤ ژیانی پێ کۆتا بهێنێت نوێژە، بڕوانە خۆشەویستیی تەواوی ئادەمیزادەکان، کاتی نوێژ دەهات بە بیلالی دەگوت: «ارحنا یا بلال»، دڵخۆشمان بکە ئەی بیلال.

خودایە، چەندە جیاوازە نێوانی ئەو کەسەی بە لۆژیکی «دڵخۆشمان بکە»، مامەڵە لەگەڵ نوێژدا دەکات، لەگەڵ ئەو کەسەی «لە کۆڵمان بەرەوە»، مامەڵە دەکات.

## وانەی چوارەم

هیچ کات تۆمەتی بێبەڵگە بەڕاست مەزانە، سروشتی خەڵکی وایە، هەندێکیان تۆمەت بۆ هەندێکی تریان هەڵدەبەستن، ئاگادار بە، هیچ لە بارەی کەسێکەوە مەڵێ، کە خیانەتت لێ نەبینیوە.

لە بارەی ئابڕووی ئافرەتێکەوە مەدوێ، لەبەر ئەوەی خەڵکی لە بارەیەوە شتێک دەڵێن.

تاوانبار ئەو کەسەیە هەر شتی بینی، بیگێڕێتەوە.

مرۆڤ گوزارشتە لە ئابڕوو، بەفیڕۆدانی ئابڕووی کەسێک، وەک بەفیڕۆدانی خوێنی وایە، زیاد لەوەیش گەر تۆمەتێکت بۆ ساغ بووەوە، بیر بکەرەوە لەوەی پەروەردگار داپۆشەری خراپە و تاوانەکانە، ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە تاوانی ئەوانی تر دادەپۆشن.

کەموکورتیی مرۆڤێک مەدرکێنە، کە پێویست بە باسکردنی ناکات.

گەر پرسیارت لێ کرا لە ئامۆژگاری و ڕاوێژدا، لە ڕاستیدا خیانەتە ئەوەی دەیزانی نەیخەیتە ڕوو.

داپۆشینی کەموکورتیی ئەوانی تر شتێکە و گرفتارکردنی ئافرەتێکی داوێنپاک بە پیاوێکی خراپ بەهۆی شاردنەوەی ڕاستییەکانەوە شتێکی ترە.

## وانەی پێنجەم

لەگەڵ خودا بە، بۆ ئەوەی خودا لەگەڵت بێت.

خۆشەویست بە ترسولەرزەوە لە تاریکایی شەودا مەککەی بەرەو مەدینە جێهێشت، دواتر بە ڕۆژی ڕووناک بە سەربەرزییەوە لە هەر چوار دەرگایەوە گەڕایەوە مەککە.

یوسف بە ستەم و نارەوا خرایە زیندانەوە، دواتر بوو بە عەزیزی میسر.

لاوانی ئەشکەوت بە مەبەستی پارێزگاری لە ئایینەکەیان بەرەو چیا هەڵهاتن... خەویان لێکەوت، دواتر پەروەردگار لەسەر حاڵێک زیندووی کردنەوە، کە تەواوی دانیشتوانی شارەکەیان هاتبوونە سەر ئایینی ئەوان.

خەڵکی زۆر لەوە بێتواناترن، زیانێکت پێبگەیەنن کە خودا ڕەزامەندیی لەسەر نەبێت.

ناتوانن سوود و قازانجێکت پێ بگەیەنن، خودا ڕەزامەندیی لەسەر نەبێت.

ئەوەی توانای ڕۆزیدانی خۆی نییە، ئیتر چۆن توانای ڕۆزیدانی ئەوانی تری هەیە.

ئەوەی مردنی خۆی بەدەست نییە، زۆر لەوە لاوازترە داوای ژیانی لێ بکرێت.

کەوایە با دڵەکانمان پەیوەست بێت بە پەروەردگارەوە.

# ئاسیای کچی موزاحیم

ئەبویەعلا لە موسنەدەکەیدا لە ئەبوهورەیرەوە دەگێڕێتەوە، خۆشەویست فەرموویەتی: «فیرعەون چوار مێخی بە هەردوو دەست و هەردوو پاچی هاوسەرەکەیدا داکوتی، کاتێک ئەوانەی ئازاریان دەدا لێی دوور دەکەوتنەوە، فریشتەکان سێبەریان بۆ دروست دەکرد. بەوپەڕی سۆزەوە داوای لە پەروەردگاری کرد ﴿ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾ ﴾ (التحريم)»، تۆ لای خۆت لە بەهەشتداماڵێکم بۆ دیاری بکە و ڕزگارم بکە لە فیرعەون و کردەوەی ئەو لە کۆمەڵی ناهەقانیشم ڕاهی کە، پەروەردگار ماڵەکەی خۆی لە بەهەشت نیشان دا.

## وانەی یەکەم

پەروەردگار لەنێو ماڵەکانی خۆیاندا دژایەتیی ستەمکار و ملهوڕان دەکات، هەر لەو کۆشکەی فیرعەون تێیدا پڕ بە دەمی هاواری کرد ﴿ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾ گوتی: «ئەمن پەروەردگاری هەرە پایەبەرزتانم» پەیامبەرێکی لێوە دەرچوو، کە عەرشی فیرعەونی هێنایە لەرزە.

هەر لە ژووری نوستنەکەی فیرعەون، یەکێک لە گەورەترین

ئافرەتانی مێژوو دەرکەوت... پەروەردگار ویستی پەیامی بێتوانایی خۆی پێ بگەیەنێت. فیرعەون لەپێناو لەناوبردنی موسادا هەزاران منداڵی سەربڕی، کاتێک موسای دۆزییەوە بە ناچاری لە کۆشکەکەی خۆیدا پەروەردەی کرد، کارێکی کرد هەزاران ئافرەتی میسر کڕنووشیان بۆ برد، بەڵام بێتوانا بوو لەوەی هاوسەرەکەی خۆی ڕازی بکات کڕنووشی بۆ بەرێت، گەرچی ستەمکاران ببنە خاوەنی جەستەی ئەوانی تر... لە کۆتاییدا دڵەکان بە دەستی پەروەردگارن.

## وانەی دووەم

چەندە ساویلکەن ئەوانی پێیان وایە ئایین ئەفیوونی گەلانە. ئەو ساویلکانە پێیان وایە ئایین کەرەستەیەکی سڕکردنە، خەڵکانی هەژار و لێقەوماو لەپێناو ئارامگریی خۆیان بەکاری دەهێنن.

وەک مرۆڤی تینووی تامەزۆری ئاوی نێو بیابان، بەدوای تراویلکەدا وێڵە بە ئومێدی گەیشتن بە ئاو، بە هەمان شێوە ئەو هەژارانە بە ئومێدی بەدەستهێنانی بەهەشت ئەم ژیانە تێدەپەڕێنن، بڕوانە لە ئاسیای خانمی یەکەمی میسر...

هاوسەری گەورەترین پاشا، پاشایەک خەڵکی لەجیاتی پەروەردگار دەیانپەرست.

دەیتوانی وەک خانمی یەکەمی میسر شاهانە بژی و فەرمان دەربکات، بەڵام بە یەقین و دڵنیایی زانیی تەنها ئەوەی لای پەروەردگارە، چاکە و بۆ هەمیشەیی دەمێنێتەوە.

لەبەر تینوویەتی نەبوو، کاتێک بڕوای هێنا بە ڕووبارەکانی بەهەشت، لەبەر برسیەتی نەبوو، کاتێک بڕوای هێنا بە میوەکانی بەهەشت.

لەبەر تەنگەبەریی خانووکەی دونیای نەبوو، کاتێک داوای کرد

پەروەردگار لە بەهەشتماڵێکی پێ بەخشێت.
ئەو خانمی کۆشک و خانمی وڵات و خانمی خانانی نێو خەڵکی بوو.
گەیشتە ئەو یەقینەی، دەوڵەمەندیی ڕاستەقینە، دەوڵەمەندیی دڵەکانە.
دەوڵەمەندیی ڕاستەقینە، ناسینی پەروەردگاری جیهانیانە.
گەیشتە ئەو دڵنیاییەی، هەموو ماڵەکانی دونیا لەچاو ماڵی بەهەشتدا جگە لە تەنگەبەریی هیچی تر نین.
وەک ئەوەی بە زمانی حاڵ بە فیرعەون بڵێت: تەواوی موڵک و دەسەلاتەکەت بۆ خۆت...
وازم لێ بهێنە و لێم بگەڕێ بۆ پەروەردگاری خۆم بڕێم.

## وانەی سێیەم

دوای ئەوەی خۆری ئیسلام بەنێو ئاسمانی جیهاندا گەشایەوە، لە بیلالی حەبەشییان پرسی، چۆن ئارامت دەگرت لەسەر ئەو سزا توندانەی ئومەییەی کوڕی خەلەفە؟
بیلال لە وەڵامدا گوتی: «شیرینیی ئیمانم تێکەڵ بە تاڵیی ئازار کرد. ئیتر ئارامم دەگرت!»
ئیمان کەشتییەکی سەرسووڕهێنەرە.
گەر دڵی خەڵکی پێوەی پەیوەست بوو، ئیتر حاڵیان بە تەواوی دەگۆڕێت.
ئارامگریی بیلالی ئیماندار، مایەی سەرسامییەکەی ئەوتۆ نییە.
بیلال پیاوە، جەستەی پیاوان بەهێزترە.
زیاتر خۆی لەبەر ئازار ڕادەگرێت، زیاد لەمە بیلال پێشتر بەندە بوو، ڕاهاتبوو لەسەر نارەحەتی و ئازار و سزای گەورەکانی، بەڵام ئەوەی جێی سەرسووڕمانە، ئارامگریی ئافرەتێکی خانەدانی

خاوەنشکۆی وەک ئاسیایە، تەواوی تەمەنی لەنێو کۆشکدا بەسەر بردووە، فیرعەون لەسەر سەکۆیەکی دارین، هەردوو دەست و قاچەکانی بە مێخ داکوتی، شاخێکی سەخەتی بەهێز کاتێک نوێڵەکان بەردەکان دادەتاشن بە ئارامییەوە خۆی ڕادەگرێت.

ئارامگر وەک ئەو درەختانەی کە دەمی تیژی موشارەکان نایان گریەنێت.

جەستەیەکی نەرم لەسەر زەوی بە توندی ئازار دەدرێت، ڕۆحێکی پڕ شکۆ بەرەو ئاسمان دەفڕێت، پێش ئەوەی ڕۆحی بەرەو ئاسمان بفڕێت، بە زەردەخەنەوە دەڕوانێتە جێگەکەی لە بەهەشت، وەک ئیبن کەسیر دەگێڕێتەوە، فیرعەون بەم هەڵوێستەی ئاسیا تەواو نیگەران بوو، شێتی گرتی و گوتی: ئەوە ئێستایش زەردەخەنە دەکەیت؟ فیرعەون بێئاگا بوو لەوەی، ئەوماڵەی پێشتر داوای کردبوو، پەروەردگار بۆی ئامادە کردووە.

## وانەی چوارەم

پەروەردگار دەیتوانی لەو سزایە ڕزگاری بکات، ئەو خودایەی فریشتەی نارد و سێبەری بۆ کرد بێتوانا نەبوو لە ناردنی فریشتەیەک بۆ ڕزگارکردنی ئاسیا لە دونیادا، کاری خۆی چاندن تا لە قیامەتدا بیدووریتەوە. پەروەردگار ویستی بازرگانییەکەی لەگەڵ خودا گەشە پێ بدا.

لە بیرت نەچێت، کاتێک سزا و نارەحەتی دووچاری ئەهلی ئیمان هاتن، گومانت بەرانبەر بە خودا بۆ دروست نەبێت، مرۆڤە گێلەکان کاتێک دەبینن لە جەنگێکدا ناحەق سەر دەکەوێت، دەڵێن: ئەی خودا لە کوێیە؟ پەروەردگار دەستی هەندێک لە خەڵکی بەرانبەر هەندێکی تر واڵا کردووە، ئەمە لە بێتوانایی پەروەردگارەوە نییە، کاتێک

پەروەردگار ڕێگە بە ستەمکاران دەدات لە بێدەسەڵاتییەوە نییە.

بەڵکوو ئەم ژیانە تاقیکردنەوەیە و هیچی تر، ستەمکار چۆن تاقی دەبێتەوە گەر ئازادیی نەبێت لە ئەنجامدانی ستەمەکەی؟ مرۆڤی دادپەروەر چۆن سەرکەوتوو دەبێت گەر دەرفەتی ئەنجامدانی دادپەروەریی نەبێت. هیچ کات بووە ڕێگەی بەهەشت بە گوڵ تەنرا بێت؟ ڕێگەی بەهەشت هەمان ڕێگەیە، کە نووح بۆ ماوەی نۆسەدوپەنجا ساڵ تێدا نارەحەتی کێشا.

ڕێگەی بەهەشت هەمان ڕێگەیە بەهۆیەوە یەحیا بە موشار دوولەت کرا.

لە هەمان ڕێگەدا ئیبراهیم بە ئاگر سووتێنرا. ئیسماعیل خۆی ڕادەستی چەقۆی باوکی کرد. چیرۆکی بەهەشتە، بەهەشت بەنرخە.

## وانەی پێنجەم

هەر کەس خیانەتی لە پەروەردگاری کرد، چاوەڕێی وەفای بەرانبەر خەڵکی لێ مەکە!

فیرعەون پێشتر مافی پەروەردگاری نەپاراست، بە لاتەوە نامۆ نەبێت بێڕەچاوکردنی پێوەندیی نزیکی و هاوسەرداریی ئاسیای هاوسەری لە سێدارە دا.

ئومەییەی کوڕی خەلەف بێ ڕەچاوکردنی چەندینساڵی خزمەتی بیلال بێبەزەییانە کەوتە سزادانی، ئەوەی مافی پەروەردگاری نەپاراست، ئیتر چۆن مافی بەندەکەی دەپارێزێت.

پێشینان جوانیان گوتووە: بترسە لەو کەسەی لە خودا ناترسێت.

چاوەڕوانی ئەدەب مەکە لەو کەسەی ئەدەبی بەرانبەر پەروەردگار نییە.

هەر کەس مافی پەروەردگاری نەپارێزێت، بە دڵنیاییەوە مافی

خەڵکیش ناپارێزێت.

هەر لەبەر ئەوە خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێت)، دەفەرموێت: (اذا جاء کم من ترضون دینه وخلقه فزوجه) «هەر کەس هاتە داخوازیی کیژەکانتان، لە ئایین و ڕەوشتی ڕازی بوون، بیدەنێ.» هەر کەس هەوڵی ڕازیکردنی پەروەردگار بدات، بە دڵنیاییەوە هەوڵی ڕازیکردنی ئەوانی تر دەدات، لەبەر ئەوە ئاگادار بە، کیژەکەت بدە بە خەڵکی لەخوداترس، گەر خۆشی ویست، ڕێزی لێ دەگرێت. گەر خۆشی نەویست، بێڕێزیی پێ ناکات.

# قەرز و دانەوەی

بوخاری لە فەرموودەی ئەبووهورپیرەوە دەگێڕێتەوە، باسی پیاوێکیان کرد لە بەنی ئیسرائیل، داوای هەزار دیناری کرد لە پیاوێکی تر، ئەویش گوتی: چەند شاهیدێکمان بۆ بهێنە بۆ ئەوەی ببنە شاهید.

کابرا گوتی: خودا بەسە بە شاهیدی.

کەفیلێکمان بدەرێ.

خودا بەسە بە کەفیل.

ڕاست دەکەیت...

کابرا قەرزەکەی پێ دا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، کابرای قەرزوەرگر ڕۆیشت، کارەکانی جێبەجێ کرد، کاتێک وەختی دانەوەی قەرزەکە هات، بەرەو دەریا بەڕێ کەوت بۆ ئەوەی خۆی بگەیەنێتە لای هاوەڵەکەی...

کابرا بەلەمی دەست نەکەوت بۆ ئەوەی بگاتەوە لای خاوەن قەرزەکەی، ناچار دارێکی هەڵکۆڵی و هەزار دینارەکە و نامەیەکی خستە ناوی و بە جوانی دایپۆشی و گوتی: پەروەردگارا، تۆ ئاگاداری من هەزار دیناری فلانە کەس قەرزدارم، داوای کەفیلی لێ کردم، وەڵامم دایەوە، خودا کەفیلمە، ئەویش بەوە ڕازی بوو،

خودایە خۆت ئاگاداری، داوای شاهیدی لێ کردم، منیش وەڵامم دایەوە: خودا شاهیدە، ئەویش ڕازی بوو. پەروەردگارا، خۆت ئاگاداری ئەوەی لە توانامدا بوو کردم بۆ ئەوەی بەلەمێک بەدەست بهێنم، ئەمانەتییەکە بگەیەنمەوە، بەڵام بێسوود بوو. پەروەردگارا، من ئەم ئەمانەتە ڕادەستی تۆ دەکەم.

دارە هەڵکۆڵراوکەی فڕێ دایە دەریاوە، چاوەڕێی کرد تا لە چاوان ون بوو، پاشان ڕۆیشت کابرای خاوەن قەرز لەسەر دەریا چاوەڕێی وەرگرتنەوەی پارەکەی بوو، بە دەم چاوەڕوانینەوە چاوی کەوت بە کۆتەرەدارێک لە قەراغ دەریادا، بردییەوە بۆماڵەوە بە ئومێدی ئەوەی بەکەڵکی شتێک بێت، کاتێک لە ماڵەوە کردییەوە پارە و نامەکەی تێدا دۆزییەوە! دوای ماوەیەک کابرای قەرزدار بە هەزار دینارەوە هاتەوە لای و پێی گوت: سوێند بێت زۆر هەوڵم داوە بۆ ئەوەی بەلەمێک دەست بخەم و لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا پارەکەت بۆ بگێڕمەوە، بەڵام بێهودە هیچم دەست نەکەوت. خاوەن قەرز: تۆ هیچت بۆ ناردووم؟

هەواڵم پێ دایت بەلەمێکم دەست نەکەوت بۆ ئەوەی بێمە لات.

ئەوەی لەناو دارەکەدا بوو خودای گەورە بۆی گەیاندیت.

کابرا بە هەزار دینارەکەوە گەڕایەوە!

## وانەی یەکەم

خەڵکی بۆ خۆیان، کار و ئاتاجیان بە یەکترە. جارێکیان عومەری کوڕی خەتتاب گوێی لێ بوو کابرایەک نزای دەکرد و دەیگوت پەروەردگارا، پێویستییەکانم مەخەرە ژێر دەستی هیچ یەکێک لە دروستکراوەکانت.

عومەر پێی گوت: وایدەبینم تۆ بەم کارەت نزای مردن لە خۆت

دەکەیت، خەڵکی بێنیاز نین لە یەکتری و هەمیشە پێویستیان بە یەکترییە، ئەوەی دێتە لات دیارە گومانی خێری پێتە، ئەوەندە بەسە بۆ گەورەیی مرۆڤ لە جێی گومانی باشی خەڵکیدا بێت. گەرچی مرۆڤەکان زۆر پێویستیان بە پارەیە، بەڵام بەخشین تەنها لە ڕێی پارەوە نییە هەموو شتێک زەکاتی خۆی هەیە.

زەکاتی دەوڵەمەندی، سۆزدارییە بەرانبەر هەژاران.

زەکاتی زانست، بەخشینیەتی بەوانی تر.

زەکاتی عەقڵ و ئاوەز، ئامۆژگاریی و بەخشینی ئەزموونە بەوانی تر.

زەکاتی جەستە، کردەوەی باش و هاوکاریکردنی ئەوانی ترە، ڕێگەنیشاندانی نابینایەکە.

## وانەی دووەم

هەر کەسێک ماڵ و پارە لە خەڵکی وەر بگرێت بە نیازی دانەوەی، پەروەردگار بۆی دەگێڕێتەوە، هەر کەس ماڵ و پارەی خەڵکی وەر بگرێت بە نیازی فەوتاندنی، خودای گەورە دەیفەوتێنێت.

گەمژەترین کەس ئەو کەسەیە، چاکەی ئەوانی تر پشتگوێ دەخات.

ئاگادار بە، مەبە مایەی ڕێگری و بڕینی چاکە لەوانی تر، زۆرێک لە خەڵکی بەهۆی نەگێڕانەوەی پارەکانیان، قەرز نادەن بەوانی تر، بەهۆی سوک تەماشاکردنی کچەکانیان، زۆرێک لە خەڵکی ئامادە نین بێ مارەیی کچەکانیان بدەنە شوو. بەهۆی خیانەت و ڕێگرییەوە زۆرێک لە خەڵکی ئامادە نین ڕێبوارانی سەر ڕێگا هەڵبگرن. داپیرەکان جوانیان گوتووە: هەر کەس متمانەی پێ کردی، خیانەتی لێ مەکە، گەرچی خیانەتکاریش بێت.

## وانەی سێیەم

تۆ بڕوانە لەم چیرۆکەدا چی سەرسامی کردیت؟ سەرسام بوویت بەو پیاوەی کە ڕازی بوو بە کەفیلی و شاهیدیی پەروەردگار، یان بەو پیاوەی کە پارەکانی خستە مەترسییەوە لەپێناو ئەوەی پەیمانەکەی بباتە سەر؟ چەندە قەشەنگە کاتێک مرۆڤە ڕەسەن و جوامێرەکان پێکەوە مامەڵە دەکەن، پیاوێکی مەرد بەبێ بوونی شاهید و کەفیل، ماڵەکەی دا بە قەرز.

مەردێک لە ڕێی کۆتەدارێکەوە، هەوڵی گێڕانەوەی ماڵەکەی دەدات.

## وانەی چوارەم

هەمیشە نییەتی خێرت بێت، تا پەروەردگار ڕێگاکانت بۆ ڕووناک بکاتەوە. کاتێک مرۆڤی قەرزدار نیەتی گێڕانەوەی ئەمانەتەکەی هەیە، پەروەردگار کۆتەرەدارەکان دەکاتە پەیام و دەریایش دەکاتە پەیامبەر. نیەتی خێرت هەبێت ببیتە کەسێکی باش پەروەردگار هاوسەرێکی باشت پێ دەبەخشێت. نیەتی خێرت بێت، پەروەردگار ڕێنموییت دەکات بۆ لای خەڵکانێک فێرت دەکەن، نیەتی خێرت بێت لەوەی دەستپاک بیت، پەروەردگار ڕێنموویی دەکات بۆ لای کەسانی ئیماندار. پەروەردگار خێری لە دڵی هەر یەکێک لە بەندەکانی بینی، بە دڵنیاییەوە دەرگای خێری بە سەردا دەکاتەوە.

## وانەی پێنجەم

گەر کەسێک پەنای دای بە پەروەردگار، تۆیش پەنای بدە.

کەسێک داوای لێ کردی، لەبەر خاتری پەروەردگار هاوکاریی بکە و پێی بدە.

خەڵکی ڕاهاتوون لەسەر ئەوەی داواکاری و شەفاعەتی خەڵکانی گەورە و بەڕێز ڕەت نەکەنەوە. چەندە گەورەیە ئەوەی لای پەروەردگار بۆت دەبێتە تکاکار.

لە ڕاستیدا داواکاریی شاهید و نووسینی گرێبەست نەنگییەکی تێدا نییە، بە پێچەوانەوە کارێکی دروست و باشە، چونکە دونیا ژیان و مردن و ستەم و خیانەت و هەموو ئەم بابەتانەی تێدایە...

وریا بە لە پاراستنی مافەکانی خۆت نیگەران مەبە، لەو کەسەی داوای تۆمارکردنی مافەکەیت لێ دەکات...

بڕوانە درێژترین ئایەت لە قورئاندا، ئایەتی قەرزە، پەروەردگار هانی ئیمانداران دەدات لەسەر نووسین و بوونی شاهید لەنێوان هەردوولا، بەڵام پەروەردگار هەر لەو ئایەتەدا بانگەشەیەک دەخاتە ڕوو، گەورەتر لە گرێبەست و بوونی شاهید، ئەویش بریتییە لە ئەخلاق وەک دەفەرموێت: ﴿ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ ٱلَّذِى ٱؤْتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ ﴿٢٨٣﴾ ﴾ (البقرة) «جا مەگین لێک خاترجەم بن کە ئەوسا بارمتەی ناوێ با قەرزدار ترسی خودای لە دڵدا بێت و قەرزەکەی خۆی بداتەوە.»

# هەور

ئیمامی موسلیم لە فەرمودەی خۆشەویستەوە دەگێڕێتەوە، جارێکیان پیاوێک لە دەشتێکدا بوو گوێی لە دەنگێک بوو فەرمانی کرد بە هەور برۆ باخچەی فلانەکەس ئاو بدە.

هەور فەرمانەکەی بەجێ هێنا و لە شوێنی مەبەست بارانی باراند، کابرا کە ڕووداوەکەی بینی، شوێن هەورەکە کەوت، گەیشتە ئەو شوێنەی کە بارانی لێ باری، بە خاوەن زەوییەکەی گوت: ئەی بەندەی خودا ناوت چییە؟

گوتی: ناوم فلانە کەسە... دروست ئەو ناوە بوو لە دەنگی پێشتر بیستبووی

ئەی بەندەی خودا بۆچی پرسیاری ناوم دەکەیت؟

گوێم لە دەنگێک بوو بەو هەورەی دەگوت برۆ باخچەی فلانەکەس ئاو بدە -ناوی تۆی هێنا- تۆ چی دەکەیت لەم باخچەیە.

ئەوەی لەم باخەوە بەرهەم دێت دەیکەم بە سێ بەشەوە، بەشێکیان دەکەمە خێر و بەشەکەی تریان خۆم و منداڵەکانم دەیخۆین، بەشێکی تری دەگێڕمەوە بۆ ناو باخەکە.

## وانەی یەکەم

هەر کەسێک ئەرکەکانی پەروەردگار بپارێزت،
پەروەردگار کاروبارەکانی ئاسان دەکات.
ئەوەی لە بەردەستدایە بخەرە خزمەتی پەروەردگارەوە،
پەروەردگار گەردوونت بۆ ڕام دەکات.
بۆ پەروەردگار بە، وەک ئەوەی پێی خۆشە،
بۆت دەبێت وەک ئەوەی خۆت پێت خۆشە.
یاساکانی گەردوون حوکم بەسەر خەڵکیدا دەکەن،
حوکم بەسەر پەروەردگاردا ناکەن.
پەروەردگار لەپێناو یەکێک لە بەندە باشەکانی،
یاساکانی گەردوونی دەگۆڕێت.
پەروەردگار بە ڕاسان دەبەخشێت بەهۆی کاری چاکەیانەوە
هەروەک چۆن بە پەیامبەران دەبەخشێت بەهۆی پلەی پەیامبەرییانەوە.
پەروەردگار کاری ئەوە،
بۆ خۆشەویستانی هەر ئەوە،
ئاگری پڕتاوی سووتێنەر بۆ ئیبراهیم،
دەبێتە فێنکی و سەلامەتی،
نەهەنگی نێو دەریا،
بووە هاودەمی پڕ سۆزی یونس،
چەقۆی تیژی کوشندەی،
بۆ ئیسماعیلی بەندەی،
کردە مایەی سەلامەتی،
بۆ بەندەیەکی خۆشەویستی،

هەورێکی گێڕا،
پەروەردگار ئیرادەی وا بوو ئەو ڕۆژە زەوی هیچ کەس ئاو نەدرێت، بەڵام یەکێک لە بەندەکانی شایستەی ئەوە نییە بارانی لێ بگیرێتەوە... ئا بەمشێوەیە پەروەردگار یاسای جیهانی لەپێناوی بەندەیەکی خۆشەویستی خۆیدا گۆڕی. لە ڕاستیدا کاری هەورە باران بەسەر زەوی و تەواوی ئەوانی تردا ببارێنی... ئیتر کاری پەروەردگارە هەورێکی تایبەت بۆ مرۆڤێکی تایبەت... بەندەیەک کە باوەڕ و نیەتی خۆی بۆ پەروەردگار سوڵحاند، پەروەردگاریش دونیای بۆ ئەو سوڵحاند.

## وانەی دووەم

ناو و ناوبانگی ڕاستەقینە... ناوبانگی سەر زەوی نییە.
لە ڕاستیدا ناوبانگی ڕاستەقینە ناوبانگی ئاسمانە...
تۆ بڕوانە جوتیارێکی هەژاری نەناسراو لەسەر زەوی، بەڵام ناسراو لای پەروەردگاری...
لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە فەرمان بە هەور دەکرێت زەوی ئەو دۆستەمان ئاو بدە...
ئای! چ بەختەوەرییەکی گەورەیە، پەروەردگاری جیهانیان ناوت بهێنێ...
هەندێک جار گەر هونەرمەندێک ناومان بهێنێ لە خۆشیدا بەرەو ئاسمان دەفڕین.
گەر وەزیرێک ناومان بهێنێ، لە خۆشیدا زەوی نامان گرێتە خۆی.
گەر سەرۆکێک ناومان بهێنێ، لە خۆشی و بەختەوەریدا زمانمان دەشکێت...

ئەمە حاڵی ناوهێنانی بەندەیک بێت لە لایەن بەندەیەکی ترەوە، دەبێت حاڵمان چۆن بێت کاتێک فەرمانێک لە لایەن پاشای پاشایان و پەروەردگاری جیهانیانەوە دەردەچێت «زەویی ئەو دۆستەم ئاو بدەن»!

## وانەی سێیەم

لە کۆنەوە گوتوویانە (کارکردن عیبادەت و پەرستشە). ئەمە راستە، بەڵام ئەو کارەی مافی پەروەردگاری تێدا ناپارێزرێت لە راستیدا خوداپەرستی نییە، بەڵکوو شەیتانپەرستییە...

هەندێک لە خەڵکی زەنگی کاتژمێرەکەیان رێک دەخەن بۆ نوێژی بەیانی، هەندێکی تریان رێکی دەخەن بۆ گەیشتن بە کاروباری رۆژانەی خۆیان...

ج جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان ئەو دوانە، لەنێوان ئەوەی کە دەزانێت بۆ پەرستش دروست کراوە، لەگەڵ ئەوەی پێی وایە تەنها بۆ کارکردن دروست کراوە...

پەرستش کاتی خۆی و کار و فەرمانیش کاتی خۆی... هەر کەس پەرستشەکانی بفەوتێت لەپێناو کاری دونیای، بە دڵنیاییەوە مافی پەروەردگاری پشتگوێ خستووە و پێی وایە خۆی رۆزی خۆی دەدات.

ئەو رۆزییەی دەتەوێت بەهۆی کارەوە بە دەستی بهێنی لای پەروەردگارە... سەیرە چۆن دەکرێت شتگەلێک لە پەروەردگار داوا بکەین کە حەزمان لێیەتی، بە رێگەیەک مایەی رەزامەندیی پەروەردگار نییە ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ﴿٢٦٨﴾ ﴾(البقرة) «شەیتان ئێوە لە نەداری دەترسێنێ بۆ خراپە هانت دەدا. خودایش بەڵێنی لێخۆشبوون و خۆشی ژیانت پێ دەدات.»

هەڵبەت کاتێک کارکردن پەرستشە، مافی پەروەردگاری تێدا بپارێزرێت. ئەو کەسەی مافی خاوەن کارەکەی پشتگوێ دەخات بە بیانووی پەرستشەوە، حاڵی باشتر نییە لەو کەسەی لەپێناو کاردا واز لە نوێژەکانی دەهێنێت. خۆشەویست جوانی فەرمووە: (لأن يأخذ أحدكم أحبله فيحتطب على ظهره، خير له من أن يسأل الناس أعطوه أو منعوه).

«کەسێک لە ئێوە گوریسەکەی هەڵبگرێت و چیلکە و چەوێڵ بهێنێت و بیفرۆشێت باشترە لەوەی داوا لە خەڵکی بکات پێی دەدەن، یاخود نا.»

لەبارەی ئەو کەسەی لەنێو مزگەوت سەرقاڵی پەرستشە و براکەی بژێویی دەکێشێت، دەفەرموێت براکەی باشترە... هیچ کات بابەتەکە بەو شێوەیە نەبووە: خوداپەرستی بکەم یان کار بکەم.

عیسای مەسیح (سەلامی خودای لێ بێت)، یەکێک لە گەورە پەیامبەران سەرقاڵی کاری دارتاشی بوو. شوعەیب سەرقاڵی مەڕداری بوو، بەهۆی پیرییەوە کچەکانی چاودێریی ئاژەڵەکانیان دەکرد. کاتێک یەکێک لە کچەکانی بەخشییە موسا مارەییەکەی کارکردنی چەند ساڵە بوو... ئەمە حاڵی پەیامبەران بێت، ئیتر دەبێت خەڵکانی خوار ئەوان چۆن بن.

## وانەی چوارەم

پاداشت لە ڕەگەزی هەمان کارە، هەر کەس زەوییەکەی بەکار بهێنێت بۆ ڕەزامەندیی پەروەردگار، خودا لە کاتی سزادانی ئەوانی تر زەوییەکەی دەپارێزێت. دڵنیا بە و متمانەت هەبێت هەر پارە و ماڵێک بخەیتە خزمەتی پەروەردگارەوە، بەرەکەتی فراوانی تێ دەکەوێت... پەیمانی خۆشەویستە (مانقص مال من صدقة) «دارایی هیچ کەس بە بەخشین کەم ناکات.»

دڵنیا بە ئەو چرکە ساتانەی دەیبەخشیت لەپێناو شەونوێژدا، پەروەردگار لە بەرانبەردا وزەیەکت پێ دەبەخشێت زیاتر لە وزە و چالاکی ئەوانەی بە درێژایی شەو نوستوون.

بابەتێک هەیە ئێمە زۆر جار پشتگوێی دەخەین، ئەویش (بەرەکەت) ـە زۆر جار گوێی پێ نادەین... هیچ کات شتەکان بە چەندایەتی نین، بەڵکوو بە چۆنایەتین... هەمووان نموونەی ئەوەمان لە پێش چاوە، خەڵکانێک بە ڕێگەی حەرام ماڵ و دارایی پێکەوە دەنێن، بەڵام هەمیشە گلەییان لەسەر کەمی و بێبەرەکەتییە... بە پێچەوانەوە دووچاری سەرسوڕمان دێین لە کەسانێک، بە ڕێگەی حەڵاڵ سەرچاوەیەکی داهاتی کەمیان لە بەردەستە، بەڵام بە شێوەیەک بێ کەموکورتی بەشیان دەکات... هەر بۆیە عومەر فەرموویەتی: داوا لە پەروەردگار ناکەم بۆ ئەو ڕۆزییەی دیاریکراوە و تەواو بووە لە دابەشکردنی، داوا دەکەم لەوەی بەرەکەت بخاتە ڕۆزیمەوە.

# موغیس و بورەیرە

بوخاری دەگێڕێتەوە، جارێکیان خۆشەویست بە عەباسی مامی گوت: «ئەی عەباس سەرت سووڕ نامێنی لە خۆشەویستیی موغیس بۆ بورەیرە و ڕقی بورەیرە لە موغیس؟» بورەیرە کۆیلەی یەکێک لە ئەنسارییەکان، مێردەکەی ناوی موغیس بوو... بورەیرە تامەزرۆی ئازادی بوو موکاتەبەی گەورەکەی کرد لەپێناو ئازادبوون و ڕزگاری لە کۆیلایەتی، چووە لای عائیشەی دایکی ئیمانداران بۆ ئەوەی هاوکاریی بکات لەو برە پارەیەی کە بۆ ئازادکردنی دەستنیشان کراوە... دوای ئازادبوونی، بیری لە هاوسەرگیرییەکەی کردەوە، بەپێی شەریعەت هەر ئافرەتێکی کۆیلە، ئازاد بوو لە کۆیلایەتی، سەربەستە لەوەی لەگەڵ مێردە کۆیلەکەی دەمێنێتەوە، یاخود لێی جیا دەبێتەوە. بورەیرە بڕیاری دا لە موغیس جیا ببێتەوە، موغیس بورەیرەی زۆر خۆش دەویست، لەسەر کۆڵانەکانی مەدینە دەهاتە سەر ڕێگەی، بورەیرە بە گریانەوە لێی دەپاڕایەوە کە بگەڕێتەوە بۆ لای، بەڵام هەموو ئەم پاڕانەوە و لاڵانەوانە دڵی بورەیرەی نەرم نەکرد، کاتێک موغیس بێئومێد بوو لە گەڕانەوەی بورەیرە بۆ لای، هاتە لای پەیامبەر بۆ ئەوەی لای بورەیرە شەفاعەتی بۆ بکات... پەیامبەر بورەیرەی بانگ کرد و پێی گوت: ئەی بورەیرە گەر بگەڕێیتەوە بۆ لای باشترە، ئەو هاوسەری تۆیە، باوکی کوڕەکەتە.

بورەیرە: ئەی پەیامبەری خودا، ئەوەی پێمدەڵێیت فەرمانە؟
پەیامبەر: نەخێر، تەنها داوایەکە و هیچی تر.
بورەیرە: ئەی پەیامبەری خودا، هیچ پێویستم بە پیاوەکەم نییە.

## وانەی یەکەم

خۆشەویستیی یەکلایەنە جگە لەسەرشۆڕی، هیچی تری بە دواوە نییە، ڕاستە پەروەردگار دڵێکی پێ بەخشیوین، هەندێک جار لە بەردەم گورزی خۆشەویستدا تووشی شکان دێت... لە هەمان کاتدا ئیرادەیەکی پێ بەخشیوین، تا بەهێز بین و هیچ کات سازش لە ئیرادەی خۆمان نەکەین، دڵی خۆت پێشکەشی ئەو کەسە بکە کە خۆشت دەوێت، بەڵام لە بیر نەکەیت، سواڵی خۆشەویستیی نەکەیت. جارێک تاقی بکەوە، جارێکی تر هەوڵ بدە ئاگادار بە بزانە کەی و لەکوێ ڕادەوەستی. لە کۆنەوە گوتویانە: هەندێک جار پێویست ناکات پەڕەکە هەڵبدەیتەوە، بەڵکوو پێویستە بە یەکجاری کتێبەکە بگۆڕێت.

## وانەی دووەم

ئافرەتان کاڵایەکی فرۆشتن نین بۆ ئەو کەسەی مارەیی زیاتر دەدات...

گەورەترین ستەمە ئافرەت ناچار بکرێت بە هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێک و دڵی لای پیاوێکی تر بێت...

کوشتنی دڵەکان بەئازارتر و بەسوێترە لە کوشتنی جەستەی مرۆڤەکان.

واز بهێنە لە خووی عەرەبە پێشینەکان، ئەوان هیچ کات ئامادە نەبوون کیژەکانیان بدەنە دڵخوازەکانیان...

ڕێگەی پەیامبەری خۆشەویست بگرە، جوانی فەرمووە: لم یر للمتحابین غیر النکاح... «هیچ شتێک هێندەی هاوسەرگیریی بۆ ئەوینداران

بەسوود نییە.»

## وانەی سێیەم

مەرد بە، جوامێربە، ئازاری دڵێکی پڕ سۆز مەدە.
ئەو دڵەی بەڕاستی خۆشی دەوێت، قەدری بگرە.
خەڵکی هەموویان دڵیان هەیە.
گەر ئەویندار ی خۆت نەخوازیت،
ئەویندار ی یەکێکی تر دەخوازیت.
زۆر دابونەریت
وەک بت وان، پێویستیان بە شکاندنە.
دڵی ئەوانی تر مەشکێنە
گونجاوترە
دابونەریتەکان بکەینە قوربانی لەپێناویان.

## وانەی چوارەم

تکا بکە بۆ ئەوانی تر
پاریزگاریی دڵ لە پاریزگاریی جەستە گرینگترە.
شکانی دڵان بەسوێترە لە شکانی ئێسکەکان.
مرۆڤ ئێسکی دەشکێ، زوو شیفای دێت
دێتەوە سەر پێ.
شکانی دڵ بەسوێیە، ئازارێکی بێکۆتایە
کورد گوتەنی: شوێنی گوللە چاک دەبێتەوە، شوێنی قسە چاک نابێتەوە.

هەر کات توانیت دوو دڵ یەک بخەیت، دوودڵ مەبە، نرخی ڕاستەقینەی مرۆڤەکان بەوە نییە چییان هەیە، بەوەیە کە پێشکەشی دەکەن. نرخی

درەخت لە دارەکەی نییە، بەڵکوو لە بەرەکەیەتی، نرخی کتێب لە پەڕەکانیدا نییە، لە وشەکانی نێو پەڕەکاندایە... هەر بەم شێوەیە هەندێک خەڵکی بەهۆی کردەوەکانیانەوە گەورەترن لەوانی تر... بڕوانە ئەوانەی ناویان لە مێژوودا تۆمار کراوە، خزمەتێکیان پێشکەشی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی کردووە...

یەکیان دەرمانێکی دروست کرد
یەکیان کتێبێکی نووسی
ئەویان زانستێکی داهێنا
ئەویان جەنگێکی کوژاندەوە
ئەوی تریان ڕێگەی شەق کرد
دڵی ئەوانی تری خۆش کرد
ژیانی خەڵکی کۆتایی دێت
جوانییەکانی وەک بەردی نێو دەریا
ژیان جێمەهێڵە بێ ئەوەی
شتێکی جوان بۆ خۆت بکەیت بە سەرمایە.

## وانەی پێنجەم

هیچ کات واز لە تکاکردن بۆ ئەوانی تر مەهێنە بە بیانووی ئەوەی تکات ڕەت دەکرێتەوە...

بە تەنها هەوڵەکانت شەرەف و هەنگاوێکی گەورەیە...

ئێمە لەسەر هەوڵەکانمان پاداشت وەردەگرین، نەک لەسەر ئەنجامی کارەکانمان، وەک لە فەرموودەی خۆشەویستدا هاتووە: لە ڕۆژی قیامەتدا پەیامبەر هەیە دێت و هیچ کەسی لەگەڵ نییە...

نیگەران مەبە گەر داواکەت ڕەت کرایەوە، تۆ بڕوانە داوای ئەو هەموو پەیامبەرە ڕەت کرایەوە، چۆن داوای تۆ ڕەت ناکرێتەوە، گەر داوەکەت

ڕەت کرایەوە، وا هەست مەکە سووکایەتیت پێ کراوە، هەر چەند هەوڵ بدەیت ناگەیتە پلەوپایەی پەیامبەر (درووودی خودای لێ بێت)، تۆ بڕوانە موحەمەدی پەیامبەر تکا دەکات لە ئافرەتێکی بەندە، بەڵام داواکەی ڕەت دەکاتەوە، پەیامبەر ڕەتکردنەوەی ئەم داوایەی بە بێڕێزی وەرنەگرت، نەبووە نەیار، دوای ئەوەی داوای ڕەت کرایەوە...

پاداشتی شەفاعەت و داواکاریی بە خۆبەزلزانی بەتاڵ مەکەوە.

## وانەی شەشەم

هیچ کارێکی چاکە بە بچووک مەزانە...

پەیامبەر لە هەموو کەس پەرستشی زیاتر بوو... هێندە بەڕۆژوو دەبوو وەک ئەوەی بڵێیت تەواوی ساڵ بەڕۆژوە... هێندە شەونوێژی دەکرد، وەک ئەوەی هیچ شەوێک ناخەوێت، بەڵام هیچ کات داواکاریی بۆ ئەوانی تر ڕەت نەکردووەتەوە...

هەر کەس پێویستی خەڵکی جێبەجێ بکات پەروەردگار پێداویستییەکانی جێبەجێ دەکات...

تۆ لە پەیامبەر سەرقاڵتری؟

بە دڵنیاییەوە نەخێر...

بە پێوەرە ئاینییەکە ئەو پەیامبەری ئوممەت بوو، ئەرکی ڕێنماییکردنی ئوممەتی لەسەر شان بوو، لە چوارچێوە سیاسییەکەیشدا سەرۆکی دەوڵەت بوو، ئەرکی بەڕێوەبردنی دەوڵەت و کاروباری خەڵکی لەسەر شان بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا بەشێک لە کاتەکانی بۆ خەڵکانی سادە و هەژار تەرخان کردبوو، بەوپەڕی میهرەبانییەوە شەفاعەت بۆ پیاوێک دەکات لای خێزانەکەی و بۆ بەندەیەک لای گەورەکەی... کاتێک دێیتە ئاستی خەڵکانی سادە زۆر گەورەتر دەبیت لەوەی خۆت بیری لێ دەکەیتەوە.

# گۆزەی ئاڵتوون

بوخاری دەگێڕێتەوە خۆشەویست فەرموویەتی: پیاوێک زەوییەکی لە کەسێک کڕی... دواتر کابرای کڕیار گۆزەیەک زێڕی لەناو زەوییەکەدا دۆزییەوە، کابرای کڕیار چووە لای فرۆشیار و پێی گوت، من زەویم لە تۆ کڕیوە، ئاڵتوونم لە تۆ نەکڕیوە، فەرموو زێڕەکەت وەربگرە و موڵکی تۆیە.

کابرای فرۆشیار گوتی: من زەوی و ئەوەی لەنێویدایە بە تۆم فرۆشتووە، دواتر بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەیان، چوونە لای پیاوێک بۆ ئەوەی داوەرییان لەنێواندا بکات، کابرای داوەر گوتی: منداڵتان هەیە؟ یەکیان گوتی: من کوڕێکم هەیە، ئەوەی تریان گوتی: منیش کچێکم هەیە.

داوەر: کەوایە لێکیان مارە بکەن و ئەو زێڕە بکەنە مارەیی و خەرجیی هاوسەرگیرییان.

## وانەی یەکەم

نموونەی وەرع و خۆپارێزی لەم چیرۆکەدا تەواو سەرنجڕاکێشە... لای هەردوو لایەنی کڕیار و فرۆشیار... پێشینان گوتوویانە: وەرع بریتییە لە دوورکەوتنەوە لە نۆ بەش لە دە بەشی حەڵاڵ لە ترسی

کەوتنە حەرامەوە، بەڵام پێموایە ئەمە دوورە لە جوانیی بابەتەکە و جەوهەری ڕوونکردنەوەکان و جۆرێک لە بێتوانایی هەیە، لە جوانترینی ئەوەی لە بارەی زوهدەوە گوتراوە، گوتەی ئیبن تەیمییە (ڕەحمەتی خودای لێ بێت)، دروست لەم بارەوە دواوە قەشەنگی گوتووە: الزهد ترک مالا ینفع فی الاخرة... «زوهد دوورکەوتنەویە لە هەر شتێک کە سوودی بۆ دواڕۆژ نییە.»

وەرع بریتییە لە دوورکەوتنەوە لەو شتەی کە دەترسیت لە دواڕۆژدا زیانت پێ بگەیەنێت، بە وازهێنانان لە زۆرێک لە حەڵاڵەکان مرۆڤ ناگاتە پلەی وەرع و خۆپارێزی...

کاتێک پەروەردگار شتێکی حەڵاڵ کرد، بە دڵنیاییەوە هیچ زیانێکی بۆ مرۆڤەکان نییە، بەڵام هەندێک جار بابەتە حەڵاڵەکان ناڕوونییەکیان پێوە دیارە... ئیتر ئا لێرەوە دەوری خۆپارێزی دێتە پێش، ئەو پیاوەی زەوییەکەی کڕی، خۆی پاراست لەوەی گۆزە زێڕەکە هەڵبگرێت، پێی وابوو بەو کارە شتێک هەڵدەگرێت کە مافی ئەو نییە، کابرای کڕیار بڕوای وا بوو بەو گرێبەستی کڕینە، تەنها زەوییەکەی کڕیوە نەک گۆزە زێڕەکە، کابرای فرۆشیار خۆی پاراست لە وەرگرتنی، چونکە پێی وابوو زەوییەکە و چی لەناویدایە فرۆشتوویەتی... چ قەشەنگە! خەڵکی پێش گرێبەستەکان بە خۆپارێزی مامەڵە لەگەڵ یەکتری بکەن... چ قەشەنگە! مرۆڤەکان پێش یاساکان ڕەچاوی بنەما ئەخلاقییەکان بکەن... دواتر دەبێت دڵنیا بین لەوەی ئەوەی یاسا پێمان دەدا و مافی ئێمە نییە، بە دڵنیاییەوە حەڵاڵ نییە وەک ئەوەی خۆشەویست دەفەرموێت: (إنكم تختصمون إلي، وإنما أنا بشر، ولعل بعضكم أن يكون ألحن بحجته من بعض)، «ئێوە کێشە و ئاریشەکانتان دێننە لای من، منیش مرۆڤم لەوانەیە هەندێکتان قسەزانتر و ڕەوانبێژتر بێت لە هەندێکی

ترتـان، مـن بـەوەی دەیبسـتم بڕیـار دەدەم، هـەر کـەس شـتێکم بـۆ بچڕی لـە براکـەی بـا وەڕینەگرێت، چونکـە مـن پارچەیـەک لـە ئاگری بـۆ دادەبـڕم.»

## وانەی دووەم

وەک لـەم چیرۆکـەدا دیـارە بابـەتی موڵکایەتیی تایبـەت، مێژوویيەکی کۆنـی هەیـە بـە کۆنـی مێـژووی مـرۆڤ، شـیوعییەکان هەمیشـە ئـەوە دەدەن بـە گوێماندا، گوایـە موڵکایەتیی تـاک لـە ڕابـردووی کۆندا بوونی نەبـووە، هـەوڵ دەدەن بیسـەلمێنن یەکەمیـن سیسـتەم کـە مرۆڤایەتـی ناسـیویەتی و پێی ئاشـنا بووە سیسـتەمی شـیوعیەتی سـەرەتایی بووە، کـە تێیـدا هیـچ کـەس خاوەنـی هیـچ نەبـووە، شـیوعیەت و هاوبەشـی لـە هەمـوو شـتێکدا بوونـی هەبـووە، زەویـوزارەکان موڵکی هیچ کـەس نەبـوو، خاوەنداریەتییەکـەی دەگەڕایـەوە بـۆ کـۆی گشـتیی ئەندامانـی کۆمەڵگە... بە هەمـان شـێوەی زەویـوزار، ئافرەتانیش هاوبـەش بـوون، پیـاوان مافیـان بەسـەر تـەواوی ئافرەتانی کۆمەڵگەوە هەبـووە، هەمـوو ئـەم ئەگەرانـە، ئەگـەری نـەزۆک و بێبەڵگـەن... بـە پێچەوانـەوە ئیسـلام بـە بەڵگـەی ڕوون و ئاشـکرا تـەواوی ئـەم بانگەشـانە ڕەت دەکاتـەوە... ئیسـلام تیشـک دەخاتـە سـەر ئـەم بابەتـە، بـاس لـەوە دەکات یەکەمیـن مرۆڤێـک لەسـەر زەوی دەرکـەوت ئادەمـە و تـەواوی مرۆڤایەتـی لـە نەوەکانـی ئـەوەوە سـەرچاوەیان گرتـووە... بەهـۆی ناکۆکـی لەسـەر مافداریـی لـە پێشـینەیی هەریەکیـان لـە بەرانبـەر ئافرەتێـک، قابیـل هابیلی کوشـت... شـیوعیەت و هاوبەشـیی سێکسـی لە کوێیی مێژوودا هەبـووە، وەک ئـەوەی ئـەم هـزرە نەزۆکـە باسـی لێـوە دەکات؟ وەک ڕوونـە پێـش ڕووداوی کوشـتنەکە دادگاییـەک هەبـووە، هـەر یـەک لـە هابیـل و قابیلـی ناچـار کـردووە قوربانییەکانـی خۆیـان پێشـکەش

بکەن، قابیل جوتیار و هابیل خاوەن مەڕومالات بوو، نە مەڕەکانی هابیل و نە کشتوکاڵ و شینایی قابیل گشتی نەبوون، هەر یەکیان موڵکی خاوەنەکانیان بوون... لەشفرۆشی یەکەمین کارێک نەبووە لە مێژوودا، وەک ئەوەی ئەوان گومان دەبەن، بەڵکوو هەر لە مێژووەوە خەڵکی سەرقاڵی کار و فەرمان و چاندن و ئاڵوگۆڕی کەلوپەل بوون وەک جۆرێک لە کڕینوفرۆشتنی ئێستا... موڵکایەتیی تاک هیچ کات هۆکاری بەریەککەوتن و ڕووبەڕووبوونەکان نەبووە، بە پێچەوانەوە حەسوودیی و چاوبڕینە موڵکی یەکتر، هۆکاری بەریەکەوتنی ئەوانی ترە. ئاریشەکان بەوە چارەسەر نابن موڵک و ماڵ بکرێتە هاوبەشی تەواوی مرۆڤەکان، بەڵکوو چارەسەری بە پەروەردەکردنی دەروون و پاڵفتەکردنیەتی، بەڕاستی ئەمە لۆجیکێکی نەزۆکە وەک ئەوەی پێی وایە چارەسەرکردنی دەستریژیکردنەسەر ئافرەتان بەوە دەبێت، تەواوی ئافرەتان هاوبەش بن.

## وانەی سێیەم

پەروەردگار بە شێوەیەکی دادپەروەرانە ڕزق و ڕۆزی بەسەر مرۆڤەکاندا دابەش کردووە، نەوەک بە شێوەیەکی یەکسان، بەو پێیەی عەدل و دادپەروەری بنەمایەکی پیرۆزتر و گەورەترە لە یەکسانی، پەروەردگار عەقڵ و ژیریی بەخشیوە بە هەندێک لە مرۆڤەکان و ماڵ و دارایی بەخشیوە بە هەندێکی تریان، لوقمانی حەکیم بەندەیەکی هەژار، پەروەردگار ئاوەز و ژیرییەکی بێسنووری پێ بەخشی، هەندێک جار سەروەت و داراییەکی زۆر دەبەخشێت، هەندێک جار خێزان بەبێ منداڵ، ئافرەت بەبێ خووڕەوشتی جوان، کەم وایە پەروەردگار تەواوی خۆشی و جوانییەکانی دونیا پێکەوە ببەخشێتە بەندەکانی.

بڕوانە خەڵکانی هەژار و دەستکورت لە کاتی پێویستیدا داوای هاوکاری و یارمەتی لە کەسانی دەوڵەمەند دەکەن، بە هەمان شێوەیە، پێویستە خەڵکی لە کاتی بوونی کێشە و گرفت داوای هاوکاری لە خەڵکانی ژیر و عاقڵمەند بکەن و سوود لە ئەزموونی عەقڵیی ئەوانی تر وەربگرن... هەر یەک لە کڕیار و فرۆشیاری زەوی بە پارێزی خۆیان لە سنوورەکانی پەروەردگار کەوتنە ناکۆکییەوە، هەر یەکەیان هەوڵی دەدا زۆرترین سازش بۆ ئەوی تریان بکات... دواتر ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی بابەتەکەیان بەرنە لای کەسێکی ژیر و هۆشیار.

کابرای هۆشیار و خاوەن ئاوەز بە شێوەیەکی ژیرانە کۆتایی بەم دۆخەی نێوانی هەردووکیان هێنا، ئەم وانەیە ئەوەمان پێ دەڵێت، مرۆڤ دەبێت لە ژیاندا وریا بێت، بزانێت کێشە و گرفتەکانی دەخاتە بەردەمی کێ و لای کێ...

هەندێک لە خەڵکی کێشە بچووکەکان گەورە دەکەن، بابەتەکانت لێ ئاڵۆز دەکەن، وەک ئەوەی پەندەکە دەڵێت:

ویستی کل بکاتە چاوی، بەڵام چاوی کوێر کرد.

## وانەی چوارەم

ج قەشەنگە ناکۆکی نێوان مرۆڤە ڕەسەن و جوامێرەکان، مرۆڤە تەندروستەکان، مافی خۆیان و ئەوانی تریشان دەوێت، مرۆڤە بەرچاوتەنگەکان و هەلپەرستەکان مافی خۆیان و ئەوانی تریش دەخۆن. مرۆڤە ڕەسەنەکان جۆرێکی ترن، تەنانەت پێویستیان بە دادوەر نییە لەنێوانیاندا، وەک ئەوەی لە چیرۆکەکەدا ئاماژەی پێ کراوە، پیاوێکی ژیر هەمیشە سەرقاڵی داوەریکردن و چارەسەرکردنی کێشە و گرفتەکانی خەڵکی بوو... کاتێک پیر بوو،

تەمەنی چووە سەرەوە، ئیتر توانای کاری نەما، دڵگران بوو لەوەی کە ماڵەکەی چۆڵە، خەڵکی سەردانی ناکەن... کوڕە تاقانەکەی پێی گوت، نیگەران مەبە، ئیتر لە ئێستا بەدواوە من دەبمە دادوەر و کاروبارەکانی خەڵکی بەڕێ دەکەم، باوکەکە بە کوڕەکەی گوت: ڕازیم، بەڵام پرسیارت لێ دەکەم، گەر دوو کەس دەستقونجاوێک و بەخشندەیەک کێشەیان هێنایە لات چی دەکەیت؟

کوڕەکە: پارە لە بەخشندەکە وەردەگرم بۆ بابای دەستقونچاو.

باوک: گەر دوو کەسی ڕەزیل کێشەیان هێنایە لات؟

کوڕ: خۆم پارەیان پێ دەدەم کێشەکەیان چارەسەر دەکەم.

باوک: گەر دوو مرۆڤی بەخشندە کێشەیان هێنایە لات؟

کوڕ: بە دڵنیاییەوە دوو کەسی بەخشندە پێویستان بە داوەری نییە!

باوک زۆر خۆشحاڵ بوو بە توانایی عەقڵیی کوڕەکەی.

## وەڕازێنی کچەی فیرعەون

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە موسنەدەکەیدا دەگێڕێتەوە، خۆشەویست فەرموویەتی: لەو شەوەی چوومە ئاسمانەکان، بۆنێکی خۆش هات بە سەرمدا، گوتم ئەی جوبرەئیل ئەم بۆنە خۆشە چییە؟

جوبرەئیل: ئەمە بۆنی وەڕازێنی (قژداهێنەر، جوانکار)ی کچی فیرعەون و منداڵەکانیەتی

گوتم: ئەمانە چین و کێن؟

جوبرەئیل: جارێک ئەم ئافرەتە قژی کچەی فیرعەونی شانە دەکرد و لەپڕ شانەکەی لە دەست کەوتە خوار.

گوتی: بە ناوی خودا.

کچەی فیرعەون: مەبەستت باوکمە؟

-نەخێر خودای من و خودای باوکی تۆ.

-هەواڵ دەدەم بە باوکم.

بەڵێ، کچەی فیرعەون هەواڵی دا بە باوکی.

فیرعەون بانگی کرد و پێی گوت جگە لە من خودایەکی تر هەیە؟

بەڵێ، پەروەردگاری من و تۆیە!

فیرعەون فەرمانی کرد قورقوشم بکوڵێنن و ئافرەت و منداڵەکانی تێبکەن.

ئافرەتەکە بە فیرعەونی گوت: داوکارییەکم لێت هەیە!

فیرعەون: بڵێ چییە؟

پێمخۆشە دواتر ئێسکی خۆم و منداڵەکانم لە پارچە قوماشێکدا کۆ بکرێتەوە بخرێتە ژێر خاکەوە.

فیرعەون: ئەوە مافی تۆیە لەسەر ئێمە!

دواتر بە فەرمانی فیرعەون یەک لەدوای یەک لە پێش چاوی دایکی خرانە نێو ئاگرەوە، تا هاتە سەرەی منداڵە شیرەخۆرەکەی، ئافرەتەکە بە سۆزەوە سەیری منداڵە شیرەخۆرەکەی کرد، وەک ئەوەی شێوازێک لە ساردبوونەوەی پێوە دیار بێت. منداڵە شیرەخۆرەکە هاتە زمان و گوتی: ئەی دایکە خۆت فڕێ بدە، سزای دونیا ئاسانترە لە سزای قیامەت.

## وانەی یەکەم

ژمارەی ئەو منداڵە شیرەخۆرانەی لە مەلۆتکەییدا قسەیان کردووە زیاتر لە گێڕانەوەیەکی لەسەرە، گێڕانەوەی موسلیم باس لەوە دەکات، ژمارەیان سیانە... یەکەمیان عیسای کوڕی مەریەم و دووەمیان منداڵی شوانەکەی چیرۆکی جورەیجی خوداپەرست و ئەو منداڵەی وەڵامی نزاکەی دایکی دایەوە کە دواتر باس لە چیرۆکەکەی دەکەین... گێڕانەوەی ئیمام ئەحمەد باس لە چوار حاڵەت دەکات... لەگەڵ ئەمانە ئەو منداڵەی کە شایەتی پاکداوێنی یوسفی پەیامبەری دا، گەرچی ئەم گێڕانەوەیە ئیسرائیلییە، بەڵگەیەک نییە لە ئیسلامدا ئەم گێڕانەوەیە ڕەت بکاتەوە، وەک ئەوەی خۆشەویست دەفەرموێت:

حدثوا عن بني اسرائيل ولاحرج... «لە بەنی ئیسرائیلەوە بگێڕنەوە

کێشـەیەک نییـە.» منداڵانـی هاوەڵانـی ئوخـدود وەک ئـەوەی موسـلیم لـە سـەحیحی خۆیدا دەگێڕێتـەوە بەمشـێوەیە ژمارەیان دەبێتـە شـەش.

## وانەی دووەم

پەنهانکـردن و شـاردنەوەی بیروبـاوەڕ بابەتێکـی ئاسـایی و ڕێگەپێدراوە، گـەر بەهـۆی ڕاگەیاندنیـەوە مەترسـییەکی گـەورەی لـێ بکەویتـەوە، وەک دەبینین قورئـان ستاییشـی کەسـێکی ئالی فیرعـەون دەکات، کـە ئیمانەکـەی دەشـارێتەوە، وەک دەفەرموێـت: ﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ ﴿٢٨﴾ ﴾ (غافر) پیاوێک لـە خزمانی فیرعـەون -کـە بـاوەڕی بـە خـودا هەبـوو، بـەڵام باوەڕەکـەی خـۆی ئەشـاردەوە، گوتـی چلـۆن پیـاوێ وەهـا دەکـوژن، ئێـژێ: خـودا پەروەرندەمـە؟»

شـاردنەوە و پەنهانکردنـی ئیمـان لـە دۆخێکـی مەترسـیداری ئـاوادا بەسـوودترە لـە ئاشـکراکردنی لـە چەند ڕوویەکـەوە.

یەکـەم: بـەم کارەی پارێزگاریـی لـە ژیانـی خـۆی کـرد، بەهـۆی باوەڕهێنانـی بـە موسـاوە فیرعـەون هاوسـەرەکەی لەنـاو بـرد، زیـاد لەمـە هـەر کەسـی تـری دووچـاری مـەرگ دەکردەوە، گـەر ئیمانـی بـە موسـا هێنابـا.

دووەم: ئەوەی نزیکە لە کۆشک دەزانێت چی تێدا ڕوو دەدات.

ئـەوەی فیرعـەون پلانـی بـۆ دادەڕێـژا، لـە ڕاسـتیدا چاوێـک لەنێـو کۆشـکی دوژمـن بەسـوودترە لـە هەڵکیشـانی هـەزار شمشـێر بـە ڕوویـدا.

سـێیەم: زۆر جـار ئاشـکراکردنی ئیمـان جگـە لـە خاوەنەکـەی سـوودی بـۆ هیـچ کـەس نییـە، سـوودی بـۆ خاوەنەکـەی ئەوەیـە بـە کوشـتنی دەچێتـە ڕیـزی شـەهیدانەوە، وەک

ئاسیای خێزانی فیرعەون، زۆر جار دەربازکردنی دەعوە و بانگەواز زۆر گرینگترە لە دەربازکردنی تاکەکان، هەڵبەت هەڵەین گەر پێمان وابێت، ئەو کاتەی ئاسیا ئیمانی ئاشکرا کرد بێئاگا بووە و خۆی بە هیلاک بردووە، یاخود پێمان وابێت وەڕازێنی کچەی فیرعەون دەرئەنجامی سزاکانی لە پێش چاو نەگرتووە، وەک ئەوەی خۆشەویست دەفەرموێت: «گەورەی شەهیدان حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب و پیاوێک بەرەنگاری دەسەڵاتدارێکی ستەمکار دەبێتەوە و دەکوژرێت.» هەڵبەت ئەو هەوڵەی وەڕازێن و خۆڕاگری و ئارامگرییەکەی سەرچاوەی هێزی ئیمانە، وەڕازێن بەپێی لۆژیکی ئەمڕۆ لە خزمەتکارێک زیاتر هیچی تر نەبوو، فیرعەونیش بەو هەموو هێز و دەسەڵاتەی خەڵکی بە خودایان دەزانی و دەیانپەرست، سەیرە خزمەتکارێکی سادە بە ئاشکرا تەحەدای فیرعەون بکات، بەڕاستی ئازایەتییەکی تەواو بێوێنەیە.

## وانەی سێیەم

ئیمان کاتێک لە دڵی مرۆڤ جێگیر دەبێت،

خاوەنەکەی لە پێکهاتەی گۆشت و خوێنەوە دەگۆڕێت بۆ شاخێکی پتەو، کە بۆ هیچ کەس ناچەمێتەوە.

مسوڵمان لە هەموو سەردەمێکدا بەمجۆرەیە

ئاسیا ئافرەتێکی نەرمونیانە و ئارام دەگرێت لەسەر ئازاری لەخاچدان.

قژداهێنەرێکی لاواز بەهۆی هێزی ئیمانەوە وەک شاخێکی پتەو خۆڕادەگرێ.

بیلالی ئازا لمی داخکراوی بیابان کار لە دەروونی ناکات، بەردی

ئومەییەی کوڕی خەلەف ورەی ئەوی خاو نەکردەوە.

به دەنگێکی دلێر له بەرانبەر ئازاری ستەمکاراندا
ئاوازی ئەحەد ئەحەدی دەچڕی.
ساحیرانی چیرۆکی موسا
بەرەنگاری موسا بوونەوە.
دوای ئەوەی ئیمانیان هێنا
دەست و قاچیان به ڕاست و چەپ قرتێنرا
به ڕووی فیرعەوندا وەستانەوە

بە زاری پڕ لە ئیمانەوە هاواریان کرد: ﴿ إِنَّمَا تَقْضِي هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ ﴿٧٢﴾ ﴾ (طه).

«تۆ هەر تەنیا له ژینی ئەم دونیایەدا دەستت دەڕوا.»

خۆشەویست بە ڕوونی باس لە ئازاری مسوڵمانانی پێشین دەکات، وەک ئەوەی بوخاری دەگێڕێتەوە: ئوممەتانی پێش ئێوە پیاو دەگیرا چاڵێکیان لەسەر زەوی بۆ هەڵدەکەند و تێیاندەکرد، دواتر بە موشار دەیانکرد بە دوو بەشەوە، یان بە شانەی ئاسنین، گۆشتی جەستەیان دەرنی، بەڵام ئەمە نەدەبووە هۆکاری وازهێنانیان لە ئایین، هەموو ئەم ئازارانە دەبێتە شیرینی و ئامانجی گەیشتن بە بەهەشت، هەموو ئەمانە بەخشینی پەروەردگارە بە بەندە تایبەتەکانی.

پەروەردگارت پاراستیتی
لەوانەیە ئارام نەگریت لەسەر تاقیکردنەوە
هەر بۆیە لەسەری هەڵگرتیت

دەخلیت بم، کاتێک دووچاری تاقیکردنەوە دێیت، خۆت بە دەستەوە نەدەیت.

دروشمی هەمیشەییت لە ڕووی تەواوی ملهوڕاندا، با گوتەی

ساحیرانی تۆبەکار بێت لە دژی فیرعەون ﴿ فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ إِنَّمَا تَقۡضِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَآ ٧٢ ﴾ (طـه)

«تۆ هەر تەنیا لە ژینی ئەم دونیایەدا دەستت دەڕوا.» ئارامگریی خوداویستانی نەتەوەکانی پێشوو بهێنەوە یادی خۆت.

## وانەی چوارەم

ئەوەی دەبەخشێت ڕقی لە پارە و دارایی نییە

ئەو ئافرەتەی بالاپۆشە

مانای وا نییە

ڕقی لە بەرگی جوان و مۆدێلە.

ئەو جەنگاوەرەی بە تامەزرۆییەوە

ڕوو دەکاتە مەیدانی جەنگ

لەپێناو بەدەستهێنانی شەهیدی

مانای ئەوە نییە ژیانی خۆش ناوێت

وەڕازین کاتێک منداڵەکانی

لە پێش چاوی دەکوژرێن

خاوەنی هەستی دایکایەتی بوو.

ئەوان باش دەزانن ئەوەی لای پەروەردگارە، دەمێنێتەوە. چەندە بیروباوەڕێکی سەیرە لە ساتێکی هەستیاری ئاوادا کە تراژیدیای مردنی منداڵەکانی بە چاوی خۆی دەبینێت، داوا لە فیرعەون دەکات ئێسکی خۆی و منداڵەکانی کۆ بکاتەوە پێکەوە بیاننێژێت. بە دڵنیاییەوە گەر هەستی دایکایەتی نەبوایە، ئامادە نەبوو ئەو داوایە لە فیرعەونی ملهوڕ بکات

## وانەی پێنجەم

ملهوڕەکان لە هەموو کات و سەردەمێکدا یەک جۆر مامەڵەیان هەیە، ناو و کەرەستەکانی مامەڵەکردنیان دەگۆڕێت، بەڵام هەموویان بە جیاوازیی قۆناغەکان خاوەنی یەک لۆژیک و یەک جۆر بیرکردنەوەن، فیرعەون دەکوژێت و لەسێدارە دەدات، ستەمکاران ئیبراهیم فڕێ دەدەنە نێو ئاگرەوە، ئومەییە و ئەبوجەهل توندترین ئازاری ئیمانداران دەدەن.

شێوازی جیاواز دەگرنە بەر، یەکیان ماڵ و دارایی ئیمانداران داگیر دەکات و ئەوی تریان دەیانخاتە زیندانەوە، یەکێکی تریان دەستدرێژی دەکاتە سەر ئابڕوویان، ئەوی تریان ماڵیان دەڕوخێنێت یەکێکی تر نەوەکانیان دەکوژێ ملهوڕەکان بە گەمژەییان شوێنپێی یەکتری هەڵدەگرن... زۆربەیان هەمان دەرئەنجامیان هەیە بە درێژایی مێژوو لە داهاتوویش هیچ کات ملهوڕەکان کۆتایی نایەن.

## بەڵەک و کەچەڵ و نابینا

بوخاری و موسلیم لە خۆشەویستەوە دەگێڕنەوە: سێ کەس لە بەنی ئیسرائیل هەبوون بەڵەک و کەچەڵ و نابینایەک پەروەردگار ویستی تاقییان بکاتەوە، فریشتەیەکی لەسەر شێوەی پیاوێک ناردە لایان، فریشتەکە هاتە لای بەڵەککە و پێی گوت: چی دەخوازیت؟

خەڵکی بێزم لێ دەکەنەوە، ئاواتەخوازی پێست و ڕەنگێکی جوانم.

فریشتە دەستی بە جەستەیدا هێنا و بووە خاوەنی پێست و ڕەنگێکی جوان.

فریشتە: چ ماڵێک دەخوازیت؟

- وشتر

- فریشتە وشترە مێیەیەکی هەراشی ئاوسی لەسەر گوانی دایە و پێی گوت، خودا پیت و فەڕی تێ بخات، پاشان هاتە لای کەچەڵەکە و پێی گوت چی دەخوازیت؟

- خەڵکی بێزم لێ دەکەنەوە دەمەوێت قژێکی جوانم هەبێت.

فریشتە دەستی هێنا بە سەریدا و بووە خاوەنی قژ و پرچێکی جوان.

پاشان فریشتە پێی گوت: دڵت چ ماڵ و دارایییەک دەخوازێت؟

- گوتی: ڕەشەوڵاخ... مانگایەکی ئاوسی پێ بەخشی و پێی گوت

خودا پیت و فەڕی تێ بخات.

پاشان فریشتەکە هاتە لای کابرای نابینا و پێی گوت چی دەخوازیت؟

- ئاواتە خوازم پەروەردگار دوو چاوی ساغم پێ بدا تا خەڵکی پێ ببینم.

فریشتە دەستێکی هێنا بەسەر چاویدا و چاوی چاک بووەوە، پاشان پێی گوت: دڵت چ ماڵ و داراییەک دەخوازێت؟

- مەڕ.

فریشتە مەڕێکی زاوی بەرخ بەبەری پێ دا.

ئیتر وەردەوردە ئاژەڵەکان زۆر بوون، ئەوانیش بەرهەمیان دەهێنا،

هەر یەکیان دەوڵەمەند بوون، ئەویان بووە خاوەنی دۆڵێک وشتر و ئەوی تریان بووە خاوەنی دۆڵێک ڕەشەوڵاخ. ئەوی تریان بووە خاوەنی دۆڵێک گەلەڕان. دوای ماوەیەک فریشتەیەک لە شێوەی ئەوسای بەڵەکەکە هاتەوە بۆ لای و پێی گوت: پیاوێکی هەژاری داماوی لێقەوماوم، سەر لە هیچ لایەک دەرناکەم و هیچ چارە و دەرەیەکم نییە، جگە لە خودا و هیمەتی تۆ نەبێت، جا تو بیت ئەو کەسەی کە ئەم شێوە جوانە و ئەم لەشە جوانە و ئەم ماڵە جوانە زۆرەی پێ داویت، وشترێکم بدەرێ تا لەم سەفەرەمدا خۆمی پێ بگەیەنمە ماڵ و مەنزڵی خۆم.

کابرا گوتی: خاوەن بەش زۆرن بەر تۆ ناکەوێ!

فریشتەکە گوتی: وەک ئەوەی بتناسم وایە، ئەرێ تۆ ئەو پیاوە بەڵەکە نەبوویت، خەڵکی بێزی لێ دەکردیتەوە و ئەو هەژارە نەبوویت کە خودا دەوڵەمەندی کردیت؟

- نەخێر من ئەم دەوڵەمەندی و جوانییەم لە باوباپیرانەوە بۆ

ماوەتەوە، ئەوانیش هەر هەبوون.

فریشتە: گەر درۆ دەکەیت خودا وەک جاری جارانی خۆت لێ بکاتەوە.

پاشان لە شێوە و شکڵی پێشووی کەچەڵەکە چوو بۆ لای و پێی گوت:

چی بە بەڵەکەکە گوت دیسان بەمیشی وا گوت، بەڵەکەکە چیی بە فریشتەکە گوت، دیسان کەچەڵەکەیش ئەوەی پێ گوت، فریشتەکەیش گوتی: ئەگەر درۆ دەکەی، خودا وەک جاری جارانی خۆتت لێ بکاتەوە! دواتر لە شێوە و شکڵی پێشووی نابیناکەدا هاتەوە بۆ لای و پێی گوت، پیاوێکی هەژاری داماوی ڕێبواری لێ قەوماوم، سەر بە هیچ لایەکدا دەرناکەم، سا مەگەر بە پشتیوانیی خودا و دواتر هیمەتی تۆوە بگەمەوە ماڵ و مەنزڵی خۆم، جا تور ئەو خودایەی کە چاوەکانی چاک کردیتەوە، مەڕێکم بدەرێ، بەڵکوو لەم سەفەرەدا پێی بگەمەوە ماڵەوە، کابرا گوتی: ئای! منیش وەک ئێستای تۆ نابینا بووم، دەزانم نابینایی چەند بەسوێیە، خودا چاوی چاک کردمەوە، سەرەڕای ئەوە هەژاریش بووم، دەیشزانم هەژاری چەند ناخۆشە، کە وایە بە ئارەزووی خۆت چیت دەوێت بۆ خۆت ببە، چی دەهێڵیتەوە بۆ من ئارەزووی خۆتە، هەر چی ببەیت لە پێناوی خودادا، دەست ناهێنمە ڕێگەت.

فریشتەکە گوتی، ماڵی خۆت بۆ خۆت، من فریشتەم و پێویستم بە ماڵ نییە، ڕووداوەکە ئاوایە تۆ و بەڵەک و کەچەڵ لە لایەن پەروەردگارەوە تاقی کرانەوە، خودا لە تۆ ڕازی بوو، لێت خۆش بوو، بەڵام لە هەر دوو هاوڕێکەت نیگەران و ناڕازییە.

## وانەی یەکەم

تاقیکردنــەوە تەنها سـزا و کەموکورتـی نییـە، هەندێـک جـار تاقیکردنــەوە بـە شـتی بـاش دەبێت، وەک ئـەوەی مـاڵ و دارایـی و جوانییەکـت پـێ دەبەخشـێت، دووچـاری تاقیکردنـەوەت دەکات، سـەرکەوتن لـە تاقیکردنـەوەی ئاسـتەنگ و کەموکورتیـەکان بـە ئارامگرییـە، سـەرکەوتن لـە تاقیکردنـەوەی خێـر و خۆشـی بـە سـوپاگوزارییە.

سـولەیمان کاتێـک زانیـی بەڵقیـس دێتـە لای، تـەواوی وەزیرەکانـی لـە مـرۆڤ و پەرییـەکان کۆ کـردەوە، داوای لـە دەوروبەرەکـەی کـرد عەرشـی بەڵقیسـی بـۆ ئامـادە بکـەن.

ئەوەی جنۆکەیەکی بەتوانا پێی نەکرا،
مسوڵمانێکی ئیماندار ئەنجامی دا.
ئیماندارێک کە ناوی گەورەی پەروەردگاری دەزانی،
ناوی (الله) هەر کات بەندەکانی
داوای لێ بکەن وەڵامیان دەداتەوە.

ڕووداوێـک لـە ماوەیەکـی کەمـدا عەرشـی سـولەیمان لـە بەردەمیـدا ئاوارە بـوو.

سـولەیمان هەمـوو ئەمانـەی وەک تاقیکردنەوەیەکـی پـەروەردگار بینـی، دووچـاری خۆبەزلزانیـی و لووتبـەرزی نەهـات بەوپـەڕی خاکیبوونـەوە دروشـمی ﴿ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾ ﴾(النمـل) «ئەمەیـش چاکـەی پەروەرنـدەی منـە ویسـتی تاقیـم بکاتـەوە ئاخـۆ شـوکورانەبژێرم یـان پێنـەزان.»

سـەرکەوتن لـە تاقیکرنـەوەی دەوڵەمەندیـدا ئەوەیـە شـوێنەواری

نیعمەتەکانی پەروەردگارت پێوە دیار بێت و هاوکاری و دەستگیرۆیی ئەوانی تر بکەیت. دۆڕان و شکستهێنان لە تاقیکردنەوەی دەوڵەمەندیدا ئەوەیە، کە وەک هەژاران بژیت و دواتریش خودا وەک دەوڵەمەندان لێپێچینەوەت لەگەڵ بکات. سەرکەوتن لە تاقکیردنەوەی دەسەڵات بەرپاکردنی و دادپەروەریی و یارمەتیدانی هەژارانە. شکست و کەوتن تێیدا ئەنجامدانی ستەم و نادادییە دژی ئەوانی تر.

کاتێ هێز و دەسەڵاتت تووشی سەرکێشی کردیت، بیر بکەرەوە لە هێزی پەروەردگار بە سەرتدا.

کاتێک هاوسەرگیریت دوا دەکەوێت دڵنیا بە تاقیکردنەوەی پەروەردگارە.

پەرروەردگار دەیەوێت بزانێت چی دەکەی، ئارام دەگریت هەتا ئەوەی هاوسەرت پێ دەبەخشێت، یاخود پەنا بۆ داوێنپیسی و کاری نەشیاو دەبەیت.

کاتێک بەخشینی منداڵ دوا دەکەوێت چاوەڕوانی پەروەردگارە لێت، دەیەوێت بزانێت چی دەکەیت، ئارام دەگریت یاخود کوفری نیعمەت؟

بە خۆتدا دەچیتەوە و داوای لێخۆش بوون
لە پەروەردگارت دەکەیت
یان نیگەران دەبیت و
هانا بۆ ساحیر و فاڵگر و
دەجالەکان دەبەیت؟
بیر بکەوە
کاتێک بەخشینی منداڵ
بە زەکەریا دوا کەوت
پەروەردگار لە میحرابی نوێژدا

مژدەی بەخشینی کۆرپەی پێ دا.
ئێمە ئەو میللەتەین
لە کڕنووشدا
داوا لە پەروەردگار دەکەین
لە میحرابەکاندا وەڵاممان دەدرێتەوە.

## وانەی دووەم

گرینگیی سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی پەروەردگار بە زمان و ئەندامەکانی جەستە بە شێوەیەک هیچ کامیان جێگەی ئەوی تریان ناگرێتەوە. پەروەردگار دەیەوێت بە ڕوونی سوپاسگوزاری لە زاری خۆتەوە ببیستێت، هیچ کەس هێندەی پەروەردگار حەزی بە سوپاسگوزاریی نییە، دەیەوێت ببینێت چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو ناز و نیعمەتانە دەکەیت کە پێی بەخشیویت.

ڕوژدی و ڕەزیلی
لە گرتنەوەی ماڵ و دارایيدا نییە
بۆچوونێکی بەسوود دەزانی و
دەرینابڕیت، ئەمەیش هەر ڕەزیلییە.
بێدەنگبوونت لە گەواهییەک
بەهۆیەوە مافێک دەگێڕییەوە
بۆ خاوەن مافەکەی ڕەزیلییە.
دەتوانیت کێشەی نێوان
دوو هاوسەر چارەسەر بکەیت و
ئەنجامی نادەیت، ڕەزیلییە.
زەرفێکی قورسی دەستی پیرە پیاوێک
لە ڕێگەیەکدا دەبینیت و هاوکاریی ناکەیت

به هەمان شێوە ڕەزیلییە
ڕێبوارێکی پەڕاگەندە
لە ڕێگە هەڵناگریت، ئەوەیش ڕەزیلییە
ناوی پەیامبەرەکەت دەبرێت و
دروودی لەسەر نادەیت ڕەزیلییە
بە ڕوونی لە دەرئەنجامی ڕەزیلی بڕوانە لەم چیرۆکەدا.

کابرای گول بووە خاوەنی دونیایەک وشتر، بەڵام ئامادە نەبوو تاکە وشترێک ببەخشێتە کەسێک کە بەزەلیلی لێی پاڕایەوە «دوای خودا هیچ کەس شک نابەم جگە لە تۆ»، پەروەردگار تەواوی وشترەکانی لێ سەندەوە، بڕوانە دوارۆژی کابرای کەچەڵ بە کوێ گەیشت لەگەڵ ئەوەی خاوەنی دۆڵێک مانگا بوو، بەڵام بەرچاوی تەنگ بوو لە بەخشینی تەنها مانگایەک، بابای ژیر کە ڕابردووی خۆی وەبیر هاتەوە، بە ژیری مامەڵەی کرد پێی گوترا پەروەردگار بەرەکەت بخاتە ماڵ و دارایتەوە.

هەندێک جار بەهۆی تاکە هەڵوێستێکەوە بۆ هەمیشە لە لووتکەی سەربەرزیدا دەمێنیتەوە. بە پێچەوانەوە دەکرێت تاکە هەڵوێستێک ببێتە مایەی لووتشکاندی هەمیشەیت. ژیانی مرۆڤ گوزارشتە لە هەڵوێست، هۆشیار بە لەوەی کە تێیدا بکەویت.

## وانەی سێیەم

دەوڵەمەندی واتای خۆشەویستی پەروەردگار نییە بۆ مرۆڤەکان، ئەو کەسەی ماڵ و سەرمایەی هەیە مانای وا نییە خۆشەویستی پەروەردگارە.

گوزارشتێکی جوان لەم بارەیەوە گوتراوە
پەروەردگار تەواوی دونیای بەخشییە سولەیمان و نەمرود

گەر ماڵ و دارایی نرخێکیان هەبا و پێوەری جیاوازیی نێوان مرۆڤەکان بوایە
به دڵنیاییەوە پەروەردگار پێکەوە
نەیدەبەخشییە پەیامبەرێکی وەک سولەیمان
و ملهوڕێکی وەک نەمرود.
پادشا و دەسەڵاتدارانی ڕۆم
بە کەوچکی ئاڵتوونی نانیان دەخوارد
لەسەر ڕایەخی ئاوریشم دەنوستن
موحەمەدی ئازیزیی پەروەردگار
چەند ڕۆژ لەسەر یەک لە ماڵەکەیدا ئاگر نەدەکرایەوە.
لە ڕۆژی خەندەقەدا بەردێکی بە سکیەوە بەستبوو
بە منداڵی لە بەرانبەر بڕێک پارەی کەمدا شوانیی بۆ دەوڵەمەندەکانی قورەیش دەکرد
سەرداری مرۆڤایەتی بە هەژاریی ژیا
بە هەژاری دونیای جێ هێشت
کاتێک وەفاتی کرد قەڵغانەکەی ڕەهنی بابایەکی جوولەکە بوو.
چەندە سەیرە بەڕێزترین و ئازیزترین
دروستکراوی خودا بەمشێوەیە ژیاوە.
جوانترین قوتابخانەی فێرکردنی ئاکارە کۆمەڵایەتییەکان لە کاتی بوونیدا سوپاسی پەروەردگاری دەکرد. لە نەبوونیشدا ئارامیی دەگرت. پەروەردگار خاوەنی ڕاستەقینەی تەواوی بوون و جیهانە کاتێک دەرگات بە سەردا دەکاتەوە و پێتدەبەخشێت، بە دڵنیاییەوە شتانێکت پێ دەبەخشێت کە تۆ خاوەنی نیت... کاتێک لێتدەگرێتەوە و پێتنابەخشێت بە دڵنیاییەوە شتانێکت لێ دەگرێتەوە کە تۆ خاوەنی نیت، هیچ کات چاوت لە دەستی خەڵکی نەبێت... بە درێژایی مێژوو

بە پێچەوانەی مسولمانانەوە بێباوەڕان خاوەنی زۆرترین ماڵ و داریی بوون، لە ڕاستیدا دەوڵەمەندی لۆمەکراو نییە. خۆشەویست دروست وێنای ئەم بابەتە دەکات، کاتێک باس لەوە دەکات باشترین ماڵی حەلاڵ ئەو ماڵەیە کە لای مرۆڤی مسولمانە.

وریا بە کاتێک کەمدەست و هەژاریت وا هەست نەکەیت هۆکارەکەی تووڕەیی پەروەردگارە لە تۆ... کاتێک نەخۆشی و بیماریی بەرۆکت دەگرێت، وا هەست نەکەیت پەروەردگار دەیەوێت سزات بدات... پەروەردگار حەکیمە بە حیکمەتی خۆی پێتدەبەخشێت و لێتدەگرێتەوە.

مرۆڤی مسولمان ناگاتە پلەی ئیمانی باڵا تا ئەو بڕوایەی لا دروست نەبێت، کە پێدان و لێگرتنەوەی پەروەردگار بەخشینە.

## وانەی چوارەم

پزیشکی ڕاستەقینە لە ئاسمانە، پەروەردگار پیرەژنێکی نەزۆرکی، لە ساتێکی کەمدا ئامادە ساز کرد، بۆ ئەوەی پەیامبەرێک بهێنێتە دونیاوە.

ئەیوبی ئازیز و پەیامبەر چەندین ساڵ بە ئازاری بیمارییەوە ناڵاندی، پەروەردگار بە میهرەبانییەوە پێی فەرموو ﴿ ٱرْكُضْ بِرِجْلِكَ هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴿٤٢﴾ ﴾ (ص) «پای خۆت بکوتە بە زەمیندا، کە ئەمە سەرچاوەیە بۆ مەلەکردن دەست دەدا و چاکیشە، دەشکرێ لێی بخۆیەوە.» جارێکی تر گەڕایەوە ژیانی ئاسایی خۆی.

دۆستی پەروەردگار زەکەریا بە نزای پڕ بەزەیی دەستی ئاتاجی بۆ پەروەردگار بەرز کردەوە بە نزای﴿ رَبِّ لَا تَذَرْنِى فَرْدًا ﴿٨٩﴾ ﴾ (الأنبیاء) پەروەرندەم هەر بەتەنێم مەهێڵەوە، پێویستی و بەندایەتیی خۆی دەسەلمێنێت پەروەردگار بە دەم داواکەیەوە هات و یەحیای پێ بەخشی.

بابای بەڵەک تەواوی پزیشکەکان دەستەوسان بوون لە چارەسەری پەروەردگار بە فەرمانی (کن)، شیفای بۆ نارد هەر یەک لە بابای کەچەڵ و نابینا بە هەمان شێوە. دیوێکی تری ئەم بابەتە بەهەندوەرگرتنی بابەتی بەدەمەوەچوونی پزیشک و چارەسەرە، هەڵبەت بابەتی پشتبەستن بە پزیشک و زانستی پزیشکی پێچەوانەی پشتبەستن بە پەروەردگار نییە... گەر پەروەردگار مەیلی هەبێت لەسەر دەستی یەکێک لە مرۆڤەکان شیفای بۆ دەنێرێت، بە دڵنیاییەوە گەر ویستی نەبێت تەواوی پزیشکانی دونیا ناتوانن چارەسەری بکەن، لەگەڵ ئەوەی ئێمە هانا بۆ پزیشکەکان دەبەین، وەرن با پێکەوە بیر لە پزیشکی شیفادەری ڕاستەقینە بکەینەوە، لە ڕاستیدا پەروەردگار بە گرینگییەوە تیشکی خستووەتە سەر پێویستیی کەرەستە دونیاییەکان بۆ مسوڵمانان.

شیفادەری ڕاستەقینە پەروەردگاری جیهانە.

دەرمانەکات بخۆ، چون هۆکاری شیفای نەخۆشییەکانە.

پێش بەکارهێنانی هەر دەرمان و چارەسەرێک بە زمان و بە دڵ نزای شیفا بۆ پەروەردگار بەرز بکەرەوە، وەک خۆشەویست فێری کردوین (أنت الشافي؛ لا شفاء إلا شفاؤک، شفاء لا یغادر سقما) «شیفادەر بەڕاستی هەر خۆتی، شیفا و چاکبوونەوە هەر لای تۆیە، شیفایەکی تەواو کە هیچ دەردێک نەهێڵێ.»

## مەی

نەسائی دەگێڕێتەوە خۆشەویست فەرموویەتی: (خۆتان بپارێزن لە مەی، چونکە دایکی تەواوی تاوانەکانە). لە ڕابردوودا پیاوێکی خوداپەرست هەبوو، ئافرەتێک گرِی عیشقی بۆ کابرای خوداپەرست تاوی سەندبوو، جارییەکەی خۆی نارد بۆ لای کابرای خوداپەرست. کەنیزەکە پێی گوت: پێویستمان پێتە بۆ ئەوەی گەواهییەکمان بۆ بدەیت، کابرای خوداناس لەگەڵ کەنیزەکەدا کەوتە ڕێ تا گەیشتنە کۆشکێک. کەنیزەکە تەواوی دەرگاکانی داخست تا گەیشتە ژوورێک، ئافرەتی دڵسووتاو بە ئامادەیی خزمەتکارێک و جامێک مەی لە چاوەڕوانیدا بوو.

ئافرەتەکە گوتی: سوێند بێت بانگهێشتم نەکردوویت بۆ گەواهیدان، بانگم کردوویت بۆ ئەوەی لەگەڵم بخەویت، یان ئەو پێکە مەیە بخۆیتەوە، یاخود ئەو منداڵە بکوژیت.

کابرای خوداناس بە ناچاری گوتی: پێکێک لەو شەرابەم بدەرێ، پێکێکی خواردەوە و دواتر گوتی: زیاترم پێ بدە... ئەوەندەی پێنەچوو تا کەوتە تاوان لەگەڵ ئافرەتەکە و دواتریش منداڵەکەیشی کوشت. خۆتان لەمەی بپارێزن پەروەردگار ئیمان و مەیخۆری لای مرۆڤێک کۆ ناکاتەوە.

## وانەی یەکەم

بەختێکی باشمان هەیە گەر ژیان هەمیشە دوو هەڵبژاردنی چاکە و خراپەمان بخاتە بەردەست... بەخشینی هەڵبژاردنێکی لەو شێوەیە بەخششێکی پەروەردگارە و دەکرێت هەموو کات بەردەست نەبێت.

هەندێک جار هەڵبژاردنەکان دەمانخەنە نێوان دوو حاڵەتەوە، شیرینەکەیان تاڵترینیانە. ڕێک وەک ئەوەی پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب دەفەرموێت: بلیمەت ئەو کەسە نییە خێر لە شەڕ جوودا دەکاتەوە، بلیمەت ئەو کەسەیە ئاسانترینی نێوان دوو خراپە دەزانێت.»

هەڵبژاردنی سووکترینی خراپەکان بە هەمان شێوەیە، بنەمایەکی گرینگی زانستی ئوسوڵ و شەریعەتە، بەڵام ئەوە ئارەزوو و بیرکردنەوەی ئێمە نییە کە خراپەی کەمترین زیان دەستنیشان دەکات، هەڵبەت ئەم بابەتە لە ڕێی دەرئەنجام و دەرهاویشتەکانی ئەو بابەتەوە دەستنیشان دەکرێت وەک ئەوەی کابرای خوداناس پێی وابوو خواردنەوەی پێکێک شەراب کەمترین زیانی هەیە لە تەواوی تاوانەکانی تر، بەڵام دەرئەنجامەکەی بە پێچەوانەوە بوو... لە ڕاستیدا گەر بکرێت مرۆڤ هیچ یەکێک لە خراپە و تاوانەکان هەڵنەبژێرێت، ئەمە بنەڕەت و باشترینە هەندێک جار ئەوەی وای دەبینی خراپەیەکی بچووکە لە ڕاستیدا دەرگا و دەلاقەی خراپەیەکی گەورە و ئاگرێکی بڵێسەدارە.

تۆ بڕوانە کابرای خوداناس پێی وابوو مەترسی خواردنەوەی مەی سووکترە لە زینا و کوشتن... بێئاگا لەوەی دوای نۆشکردنی مەی دەکەوێتە تاوانی کوشتن و داوێنپیسییەوە بە ئاسانی کەوتە نێو ئەو تاوانەی کە سەرەتا خۆی لێ دەپاراست.

## وانەی دووەم

ئەوانـەی هەمیشـە چەنـد هەڵبژاردەیەکـی دیاریکـراو دەخەنـە بەردەسـتت، دەیانەوێـت عەقڵـت زیندانـی بکـەن لەنێـوان تەنهـا دوو هەڵبژاردنـی سـنووردارردا... دەیانەوێـت پێتبڵێـن، ئـەوەی بەردەسـتە تەنهـا هەڵبـژاردن نییـە کـە ئـەوان بـۆت پێشـنیار دەکـەن... زۆر جـار ئەم بابەتـە لـە ژیانماندا ڕوودەدات، نموونەیەکـی سـادە، گەر سـەردانی هاوڕێیەکت بکەیـت و پرسـیارت لـێ بکا: چـا دەخۆیتـەوە یـان قـاوە... هەڵبـەت هاوڕێکـەت لێرەدا تـۆی خسـتە نێوان دوو هەڵبـژاردەوە، کـە سـێیەمی نییـە... هیـچ هەڵبژاردنێک نییـە جگـە لـە چـا، یـان قـاوە.

هەندێک جـار ئـەو ڕێگەیـە، یاخـود ئـەو دوو هەڵبژاردنـەی دەخرێتە بەردەسـتت هەردووکیـان هەڵـەن... دەیانەوێت ناچـارت بکـەن یەکێک لـە ڕێگاکان هەڵبژێریـت بـە گومانـی ئـەوەی یەکەمیـان زیانـی لـەوەی دووەمیـان کەمترە... زۆر جـار دەکرێـت ڕێگـەی سـێیەم هەبێت، بـەڵام تـۆ لـەو سـاتەدا هەسـتی پـێ نەکەیـت و عەقڵـت بـە لایـدا ناچێـت بـەو پێیـەی لـە ڕیـزی ئـەو هەڵبژاردنانـەدا نەبـووە کـە خراوەتـە بەردەسـتت.

بلیمـەت بـە لـە کاتـی کێشـە و ڕووداوەکانـدا بـە وریایـی مامەڵـە بکـە، بیـر لـە هەڵبژاردنـی سـێیەم بکـەرەوە، جیـاواز لـە لیسـتی ئـەو هەڵبژاردنانـەی خراوەنەتـە بەردەسـتت.

## وانەی سێیەم

پەروەردگار ژیانی بێڕۆح و ئاوەزی بەخشییە تەواوی ڕووەکەکان، ڕۆحی بێئاوەزی بەخشییە ژیانی ئاژەڵان. ئاوەز و ڕۆحی بەخشییە ژیانی مرۆڤەکان.

مرۆڤ بەبێ ئاوەز دەبێتە ئاژەڵ جگە لە تێرکردنی ئارەزووەکانی

هیچ ئامانجێکی تری نییە. عەقڵ بۆیە وا ناونراوە، چوون دەبێتە جڵەوگیری مرۆڤ، مانای ئەوەی جڵەوگیریی دەکا لە ئەنجامدانی کارێکی نەشیاو کە شایستەی پێگە و مەقامی مرۆڤ نییە هەر بەم هۆیەوە مرۆڤی شێت هیچی لەسەر نییە، هەر کارێک ئەنجام بدات کەس لۆمەی ناکات. مرۆڤ بەهۆی عەقڵەوە بەرپرسیارە بەرانبەر کار و کردەوەکانی...

هەڵبەت ئەمە لە کاتێکدایە گەر نا ئامادەیی ئاوەز قەدەری پەروەردگار بێت. بە پێچەوانەوە هەر کەس بە دەستی خۆی ئەم دۆخە، واتە نائاگایی عەقڵ بەرهەم بهێنێت بەرپرسیارە لە تەواوی کار و جووڵەکانی خۆی، هەر کەس، مەی بخواتەوە و سەرخۆش بێت و کەسێک بکوژێت... بە دڵنیاییەوە بەم هۆیەوە دەکوژرێتەوە... تێناگەم بۆچی هەندێک کەس دەیانەوێت خۆیان بخەنە ریزی ئاژەڵانەوە؟

پەروەردگار بەهۆی عەقڵەوە رێزی لە تەواوی مرۆڤەکان ناوە، ئیتر پێچەوانەکەی کارەساتێکی گەورەیە...

دەگێڕنەوە کاتێک عەبدولڕەحمان داخل سەقەری قورەیش گەیشتە ئەندەلووس، گۆزەیەک مەیان پێشکەش کرد، لە وەڵامدا گوتی: من پێویستم بە شتێکە عەقڵ و ئاوەزمی پێ زیاد بکەم، نەوەک پێی کەم بکەم... لەگەڵ ئەوەی مەیخواردنەوە بە یەکێک لە تاوانە گەورەکان هەژمار دەکرێت، بەڵام بابای مەیخۆر بە هۆیەوە لە ئیسلام ناچێتە دەر، خۆشەویست وێنای دڵی مرۆڤمان بۆ دەکات بە خانوویەک، کە تێیدا ئیمان و مەی پێکەوە لەژێر سەقفی ئەو خانووەدا کۆنابنەوە، بوونی یەکێکیان دەبێتە مایەی دەرپەڕاندنی ئەوی تریان.

## وانەی چوارەم

دونیا خانەی تاقیکردنەوەیە، بەم هۆیەوە لێوانلێوە لە نارەحەتی و تاقیکردنەوە، مرۆڤ دووچاری دوو جۆر لە تاقیکردنەوە دێت، ئەوەی بە سروشتی خۆی پێی خۆشە، ئەوەیشی پێی ناخۆشە، واتە هەندێک جار تاقیکردنەوە بەدبەختیی مرۆڤ لەو بابەتەوە سەرچاوە دەگرێت کە بە سروشتی مرۆیی خۆی حەز بە بوونی دەکات. یوسفی جوانخاس (سەلامی خودای لێ بێت)، دووچاری هەر دوو تاقیکردنەوەکە هات، پەروەردگار بە هەردوو جۆرەکە گرفتاری کرد، خۆشەویستی زۆر و ڕقلێبوونەوەی زۆر

ڕقلێبوونەوەی زۆر فڕێی دایە بیری کەنعانەوە

خۆشەویستیی زۆر فڕێی دایە کونجی زیندانەوە

سەیرە! ئەمە حاڵی خەڵکییە لەگەڵ یوسفی ڕاستگۆ... دەبێت حاڵی یوسف چۆن بێت لەگەڵ خەڵکی؟ یوسف لە تەواوی تاقیکردنەوەکاندا سەرکەوتوو بوو لە ڕقلێبوونەوەی براکانی ئارامی گرت، لە خۆشەویستیی شەیتانەی زولەیخا ئارامی گرت... بەهۆی ستەم و ڕقی زۆری براکانیەوە وەک ئەوان ڕەفتاری نەکرد و نەهاتە ئاستی براکانیەوە... خۆشەیستیی زۆری هاوسەری عەزیز دەستەمۆی نەکرد. بڕوام وایە بەڵای تاقیکردنەوەی ڕق ئاسانترە لە بەڵای تاقیکردنەوەی خۆشەویستی.

گەر دووچاری ئەو کەسانە بووین کە ڕقمان لێیان بێت

هەواڵمان پێ نادات بەوەی دڵمان دەیخوازێت

گەر گرفتار بووین بەو کەسەی خۆشمان دەوێت

دەکرێت ڕامانبکێشێت بەرەو حەرامێک کە بە فیترەت مەیلمان بۆی هەیە

یوسف گەنجێکی جوانخاسی هەڵکەوتوو وەک هەموو پیاوێکی تر ئارەزووی ئافرەتی دەکرد، بە ئاسایی ئەو فیترەتەی کە پەروەردگار مرۆڤەکانی لەسەر دروست کردووە.

ئارامی گرت و دەستی گرت بە ڕێنوێنی پەروەردگارەوە

ئارامگریی لەسەر هاوژینی عەزیز قورستر بوو لە ئارامگریی لەسەر ستەمی براکانی.

## دوو قاچی دارین

موسلیم لە سەحیحەکەیدا دەگێڕێتەوە، خۆشەویست فەرموویەتی:
ئافرەتێکی کورتەبالای بەنی ئیسرائیلی لەنێوان دوو ئافرەتی بالابەرزدا پێکەوە ڕێیان دەکرد، دواتر لە دار دوو قاچی بۆ خۆی دروست کرد و (بالای خۆی بەرز کرد) و پاوانە و پامورەی پڕ بە پێی لەپێ دەکرد، پڕی کردبوو لە میسک کە بۆنخۆشترین بۆنە، دوایی ڕۆیشت بۆ لای دوو ئافرەتەکە و لەگەڵیاندا ڕێی دەکرد، نەیانناسییەوە، لەگەڵ ڕێکردندا پامورە و پاوانەکانی دەجوولاند، بۆنی میسکی بلاو دەکردەوە.

### وانەی یەکەم

ئافرەتێکی دەشتەکی کچەکەی لە سەروبەندی هاوسەرگیریدا بوو، ئامۆژگاریی دەکرد و دەیگوت: با هاوسەرەکەت جگە لە جوانیت هیچی ترت نەبینێت، جگە لە بۆنی خۆش هیچ بۆنێکی ترت لێ نەکات، باش بزانە چاکترین بۆن بۆنی خۆشە، ئەم ئامۆژگارییە پوخت و کورتکراوەیە گشتگیرە، ئەزموونی چەند ساڵەی ئەم دایکەیە بۆ کچەکەی.

خۆڕازاندنەوە گەورەترین داواکاریی پیاوانە لە ئافرەتان.

خۆبۆنخۆشکردن قەشەنگترین خۆڕازاندنەوەیە.

دەبێتە لوتکەی سەرنجڕاکێشانی پیاو، چاو و لووت و دڵی پیاو داگیر دەکات.

ئەوەی لەم فەرموودەیەدا هاتووە لە بارەی سەرکۆنەکردنی بۆنخۆشییەوە

لە ڕاستیدا ئەم سەرکۆنەکردنە بەهۆی خودی بۆنە خۆشەکەوە نییە، بەڵکوو بەهۆی جێگە و چۆنێتیی بەکارهێنانیەوەیەتی، ئافرەت بەرپرسیارە لەوەی جگە لە هاوسەر و مەحرەمەکانی جوانییەکەی بۆ هیچ کەسی تر نەخاتە ڕوو.

وەک لە فەرموودەی خۆشەویستدا هاتووە: «هەر ئافرەتێک بۆنی خۆش بدا لە خۆی و لە ماڵ بچێتە دەر، بۆ ئەوەی خەڵکی بۆنی خۆشی هەڵبمژن، ئەوە زیناکارە.» هەڵبەت ئەم فەرموودەیەی خۆشەویست لە بابی ترساندن و قێزەونکردنی بابەتەکەیە، نەوەک مەبەستی زینای ڕاستەقینە بێت، کە بە هۆیەوە بکەرەکەی سزا دەدرێت.

لە ئیسلامدا بابەتێکی هەستیار هەیە کە پێی دەگوترێت (سد الذرائع)، حیکمەتی ئیسلام دووربینە، چاوەڕێی ئەوە ناکات ئاگر بکەوێتەوە، پاشان هەوڵی کوژاندنەوەی بدات. ئیسلام کار لەسەر ئەوە دەکات هەر لە سەرەتاوە ئاگرەکە نەکەوێتەوە هەر شتێک ببێتە هۆی ڕوودانی خراپەیەک بە دڵنیاییەوە ئەو شتە خۆیشی خراپە.

## وانەی دووەم

وەک ئاشکرایە ئافرەتان زۆرترین گرینگی دەدەن بە سیمای ڕووکەشی خۆیان، دەکرێت ئەم گرینگیدانە بەهۆی دوو هۆکارەوە بێت.

یەکەم: بوونی ئەو غەریزەیە لای ئافرەتان دڵخوازیی ئەوەن پیاوان هەمیشە دڵیان بە لای ئەوانەوە بێت.

دووەم: ئافرەت مەیلی زیاتر بە لای پیاودا هەیە وەک ئەوەی پیاو بە لای ئافرەتدا هەیەتی.

هەڵبەت ئەم دوو تایبەتمەندییەی ئافرەتان خراپ نین، بەڵکوو فیترەتی پەروەردگارە. دروستکراوەکان کاریگەریی ئەو مادەیەیان لەسەر دەمێنێت کە پێی دروست کراون.

ئادەم و ڕەگەزی پیاو بە گشتی لە قوڕ دروست کراون، هەر لەبەر ئەوە پیاوان هەڵگری کەمترین سۆز و میهرەبانین.

حەوا، واتە ئافرەتان بە گشتی لە ئادەمەوە خەڵق کراون، هەر بەم هۆیەوە زۆرترین هەستیان بەرانبەر پیاوان هەیە.

بە پێچەوانەوە مەیلی پیاو بەرانبەر ئافرەت مەیلی گشتە بەرانبەر بەش.

بە پێچەوانەوە مەیلی ئافرەت بۆ پیاو مەیلی بەشە بۆ گشت

هەر لەبەر ئەم هۆکارە ئافرەت هیچ نیگەرانییەک لە ژیانی لەژێر سایەی پیاودا نابینێتەوە.

نیگەران نییە لەوەی پیاوەکەی گرینگیی پێ بدات و چاودێریی بکات و سۆزی پێ ببەخشێت.

ئافرەت لەژێر سایەی پیاوەکەیدا هەست بە لاوازی ناکات، بەو پێیەی ئەو بۆ کار و زەحمەتکێشان دروست نەکراوە.

بە پێچەوانەوە پیاو بە سروشتی خۆی نیگەرانییەکی زۆر دەبینێتەوە، گەر هاوسەرەکەی بژێویی ئەو بکێشێت.

ئەستەمە پیاو خۆی ڕابهێنێت لەسەر ئەوەی هاوسەرەکەی بژێویی دابین بکات.

ئەو فیترەتەیە کە پەروەردگار مرۆڤەکانی لەسەر دروست

کـردووە.

ئەمە واتای ئەوە نییە پیاو دڵی ئافرەت ناخوازێت،
مەبەسـتمان ئەوەیـە ئەسـتەمە پیـاو هاوسـەرەکەی بکاتـە تـەواوی ژیانـی.

بـە پێچەوانـەوە ئافـرەت تـەواوی دونیـای خـۆی لـە پیاوەکەیـدا دەبینێتـەوە.

## وانەی سێیەم

نابێت ئافرەت فیترەتی بەسەر ئایینەکەیدا زاڵ بکات.
کاری ئایین نییە هەست و غەریزەی مرۆڤەکان خەفە بکات.
کاری ئایین پاڵفتەکردن و پەروەردەکردنی غەریزەی مرۆڤەکانە.
ئافرەت بە سۆز و نەرمی و نازدارییەوە دروست کراوە.
هەمیشە دڵخوازی پیاوانە.
ئەمـە واتـای ئـەوە نییـە خـۆی بخاتـە بـەر هەسـتی ئـارەزووی پیـاوان.
کاتێک ئیسلام فرەژنیی بۆ پیاوان حەڵاڵ کردووە،
ئەمە واتای ئەوەیە پەروەردگار هێزی ئەوەی بەخشیوە پێیان
کە توانای مامەڵەکردنیان لەگەڵ ئافرەتێکی زیاتر هەبێت.
ئەمە ئەو چیرۆکەیە کە
پیـاوان هەرچەنـدە هـەوڵ بـدەن ناتوانـن بـۆ ئافرەتانـی ڕوون بکەنـەوە.
ئافرەتانیش هەرچەندە هەوڵ بدەن ناتوانن لەو هەستەی پیاوان تێبگەن
ئافرەتان بە فیترەت دڵیان تەنها یەک پیاو دەخوازێت
ئافـرەت گـەر هونـەری نـاز و لـە خشـتەبردنی هاوسـەری خـۆی

بزانێت
دەتوانێت پیاوەکەی دەستەمۆی خۆی بکات.
ئافرەت پێچەوانەی سروشتی خۆی دەجوولێتەوە گەر خۆی بخاتە بەرچاوی پیاوانی تر.
ئافرەت مافی ئەوەی هەیە لەگەڵ یەک پیاو هاوسەری خۆی، ژیانێکی قەشەنگ بکات.

## وانەی چوارەم

ئارەزووی پیاوانە، جگە لە قەشەنگی و بۆنی خۆش و جوانی لە هاوسەرەکانیان، شتێکی زیاتر بە دی نەکەن.
ئافرەتان پاداشت کراون لەسەر ڕاگرتنی دڵ و داوێنپاکی هاوسەرەکانیان هەر یەک لە ژنان و پیاوان خۆشحاڵن بە بوونی قەشەنگی خۆڕازاندنەوە بۆ یەکتر وەک ئیبن عەبباس دەڵێت: من خۆم بۆ هاوسەرەکەم دەڕازێنمەوە وەک چۆن ئەو خۆی بۆ من دەڕازێنێتەوە.
پیاوان پاداشت کراون لەسەر ڕاگرتن و گرینگیدان بە دڵی هاوسەرەکانیان.
ساردی و پشتگوێخستنی پیاوان ئەو مافە بە ئافرەتان نادات دڵیان بدەنە پیاوانی تر.
بە هەمان شێوە کەموکورتیی ئافرەت ئەو مافە ناداتە پیاوان بە حەرام و نارەوا دڵیان بە لای ئافرەتانی ترەوە بێت.
ئەوەی پێویستە لە سەرمان داخستنی دەرگای فیتنە و خراپەیە.
ئافرەتێک سەبارەت بە پیاوەکەی بیر دەکاتەوە،
بۆچی دەبێت پیاوان لە تۆ زیاتر گرینگی بە ڕووکەشیان بدەن؟
هاوژینەکەت لە پیاوانی تر دەڕوانێت و دەپرسێت:

بۆچـی پیـاو و هاوسـەرەکەی مـن بـەو شـێوەیە گرینگـی بـە ڕووخسـاری خـۆی نـادات؟
پیاویش بە هەمان شێوە
بۆچی ئافرەتان لە تۆ زیاتر گرینگی بە جوانیی خۆیان دەدەن؟
هاوسـەرەکەت ئافرەتانـی تـر دەبینێت و ڕەخنـەی ئـەوە دەگرێت بۆچـی ئافرەتانـی تـر بـەو شـێوەیە نیـن؟
ئـەو هاوسـەرگیرییەی تێیـدا ژن و پیـاو ئـارەزووی سێکسـی و سـۆزداریی یەکتـر بـە تـەواوی پـڕ دەکەنـەوە تـەواوی کێشـەکانی تـر ئاسـانن.
ئـەو هاوسـەرگیرییەی ئـەم جـۆرە لـە تێربوونـی سێکسـی و سـۆزداریی تێـدا نایەتـە دی، دەیـان کێشـەی گـەورە بـە دوای خۆیـدا دەهێنێـت.
وەک یاسـا و بنەمایەکـی ئازایانـە ئـەم قسـەیەم لـێ وەربگـرن، گەورەترین کێشـەکانی ماڵ لە سیسـەمی نوسـتنەوە سـەرچاوە دەگرن.

## وانەی پێنجەم

پاژنەی بەرزی جاران لە دوو پارچە دار بوو.
خەڵکی لە هەموو سـەردەمێکدا هەمـان خەڵکیـن ئـەوەی دەگۆڕێت تەنها ئـەو کەرەسـتانەیە کە خەڵکی دووچـاری گرفـت و سەرئێشـەی زیاتـر دەکـەن، خۆشەویسـت ڕاسـتی فەرمـووە: ( لتتبعـن سـنن مـن كان قبلكـم شـبرا بشـبر، وذراعـا بـذراع، حتـى لـو دخلـوا جحـر ضـب لدخلتمـوه)، «ئێـوە شـوێن ڕێبـازی ئەوانـەی پێـش خۆتـان دەکـەون، بسـت بـە بسـت، بـاڵ بـە بـاڵ، هەتـا ئەگـەر بچنـە کونـی بزنمـژەوە شـوێنیان دەکـەون.»
ئافـرەت یەکەمیـن کەرەسـتەی فیتنـە و تاقیکردنـەوەی بەنـی

ئیسرائیل بوو.

ئافرەتان لە خودا بترسن دەرھەق بە پیاوان، ئێوە لووتکەی قەشەنگی و ئارەزووی پیاوانن.

پیاوان لە خودا بترسن دەرھەق بە مافەکانی ئافرەت،

لە بنەڕەتدا کەرەستەکانی جوانکاریی چاوڕوشتن و بۆنی خۆش حەرام نین، حەڵاڵی و حەرامیی ئەم کەرەستانە بەھۆی شێوازی بەکارھێنانیانەوەیە.

بۆنی خۆشی ئافرەتان لە شوێن و کاتی خۆیدا پاداشتی لەسەرە

چاوڕەشکردن لە کاتی خۆیدا نەبێت، تاوانە.

ھەموو شێوەیەکی خۆڕزاندنەوە پاداشتی لەسەرە.

ئەوە نییە خۆشەویست دەفەرموێت: (وفي بضع أحدكم صدقة)، «لە پێوەندیی سێکسیی ھەر یەک لە ئێوە خێر و چاکە ھەیە.»

گوتیان ئەی خۆشەویست: ھەر کەس لە ئێمە ئارەزووەکەی خۆی تێر بکات، پاداشت وەردەگرێت؟

گوتی: گەر لە حەرام تێری بکات سزای لەسەر نییە؟

گوتیان: بەڵێ.

گوتی: کە وایە گەر لە شوێنی حەڵاڵی خۆی تێری کرد پاداشتی ھەیە.

## ساره و فیرعەون

بوخـاری دەگێڕێتـەوە خۆشەویسـت فەرموویەتـی: «پەیامبـەر ئیبراهیـم پێغەمبـەر هیـچ کات ناڕاسـتی نەگوتـووە و نەکـردووە، تەنها سـێ جـار نەبێـت: دوانیـان لەبـەر خـودا بـوو، کـە گوتـی: ﴿ فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ ﴾ (الصافـات) «بـێ سـۆ مـن نەخۆشـم.» هەروەهـا کـە گوتـی ﴿ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ ﴿٦٣﴾ ﴾ (الأنبيـاء)، «گەورەکەیـان ئـەم کارەی کـرد.» دانەیەکـی تریـان دەربـارەی سـارەی خێزانـی بـوو، ئەویـش ئـەوە بـوو کاتێـک هاتـە خاکـی زۆردارێکـەوە (سـارە)ـی لەگـەڵ بـوو، سـارەیش لـە خەڵکـە زۆر جوانـەکان بـوو، ئیبراهیـم پێـی گـوت: ئـەم زۆرداره ئەگـەر بزانێـت تـۆ خێزانـی منـی، ئـەوا لەپێنـاو تـۆدا دەمکوژێـت، جـا ئەگـەر پرسـیاری لـێ کردیـت، پێـی بڵـێ کـە وا تـۆ خوشـکمیت، جـا تـۆ هـەر خوشـکی منـی لـە ئیسـلامەتیدا، مـن نازانـم کـە لـە زەویـدا مسـوڵمان هەبێـت جگـە لـە مـن و تـۆ. کاتێـک کـە چـووە زەوییەکـەوە، یەکێـک لـە دەسـتوپێوەندی زۆردارەکـە بینیـی، ئـەو کەسـە کـە بینینـی هاتـە لای زۆردارەکـە و پێـی گـوت، ئافرەتێـک هاتووەتـە خاکەکـەت شـیاو نییـە بـۆ هیـچ کەسـێک بێـت تەنهـا بـۆ تـۆ نەبێـت، ناردی بـە دوایـدا و بۆیـان هێنـا. ئیبراهیـم (سـەلامی لەسـەر بێـت) هەسـتا بـۆ نوێژکـردن، جـا کاتێـک سـارە چـووە ژوورەوە بـۆ لای زۆردارەکـە، زۆردارەکـە لـە تـاودا خـۆی

بۆ ڕانەگیرا و دەستی بۆ ڕاکێشا، کەچی دەستی گیرا، گیرانێکی توند، ئەویش بە سارەی گوت: داوا لە خودا بکە دەستم بەردا و ئیتر هیچ زیانێکت پێ ناگەیەنم، ئەویش دوعای کرد، کەچی دەستی هێنایەوە، ئەم جارەیان توندتر لە جاری یەکەم دەستی گوشرایەوە، وەک جاری یەکەم پێی گوتەوە، ئەویش دوعای کرد، کەچی هەر دەستی بۆ بردەوە، ئەم جارەیش لە هەر دوو جارەکەی تر توندتر دەستی نوقێنرا! ئیتر گوتی: داوا لە خودا بکە دەستم بەر بدات، سوێندت بۆ دەخۆم زیانت پێ نەگەیەنم، ئەویش داوای لە خودا بۆ کرد و دەستی کرایەوە، ئەو کەسەی بانگ کرد، کە ئافرەتەکەی بۆ هێنا بوو، پێی گوت: ئەمە شەیتانە مرۆڤ نییە بۆت هێناوم، بیبە دەرەوە لە خاکەکەی من و هاجەرەیشی پێ بدە. فەرمووی: ئینجا ڕۆیشتن... هاتەوە و دەرکەوت، ئیبراهیم کە بینیی بەرەو پیری چوو، پێی گوت: ها چی بووە؟ سارەیش گوتی: خێر بوو، خودا دەستی ئەو بەدکارەی لەسەر لادایـن و کارگوزارێکیشی پێ داین.

## وانەی یەکەم

ئەم فەرموودەیەی خۆشەویست بابەتی عیسمەت و پارێزراویی پەیامبەرانمان بۆ پشتڕاست دەکاتەوە. زانایان لە بارەی پارێزراویی پەیامبەرانەوە دوو بۆچوونی دیاریان هەیە:

بۆچوونی یەکەم: پارێزراوی پەیامبەران بە شێوەیەکی ڕەهایە لە کاروبارەکانی دین و دونیادا بە هیچ شێوەیەک پەیامبەران هەڵە ناکەن.

بۆچوونی دووەم: بەشێکی تر لە زانایان پێیان وایە پارێزراویی پەیامبەران بە تەنها لە کاروباری ئایین و گەیاندنی پەیامی خوداییدا خۆی دەبینێتەوە، دەگونجێت لە کاروبارە دونیاییەکاندا بکەونە هەڵەوە.

پێموایە بۆ چوونی یەکەم لە ڕاستییەوە نزیکترە.

ئەوەندەی لە ئیسلام شارەزاییم هەیە، پێموانییە بگونجێت بە هیچ شێوەیەک پەیامبەران درۆ بکەن، تەنانەت گەر لە کاروباری دونیایش بێت. هەڵبەت گەر بگونجێت پەیامبەران ناڕاست بڵێن لە کاروبارەکانی دونیادا بەم هۆیەوە دەرگایەکی گەورە دەکەینەوە بۆ گفتوگۆکردن لە بارەی پاڵدانی بابەتی ناڕاست بۆ لای خودی پەیامبەران.

ڕاستیی ئەوان زۆر لەوە گەورەترن کارێکی لەم شێوەیان بدرێتە پاڵ. پەروەردگار زۆر لەوە حەکیمترە لە کاروباری ئایین بیانپارێزیت و لە کاروباری دونیا نەیان پارێزێت.

سەبارەت بە ناڕاستییەکەی ئیبراهیم لە بارەی پەروەردگارەوە، وەک ئاشکرایە هەردوو ئەم هەڵوێستە لە بابی ئیقامەی حوجە و خستنەڕووی بەڵگەوەیە. ئەو ناڕاستییەی بە فیرعەونی گوت لە بارەی سارەی خێزانیەوە دروست بڵێین هیچ ناڕاستییەکی تێدا نییە، وەک ئاشکرایە مسوڵمان برای مسوڵمانە، سارە لە ڕووی ئایینەوە خوشکی ئیبراهیمە.

بە هەمان شێوە لە ژیانی پەیامبەردا هەندێک قسەی توێکڵداری بەکار هێناوە.

وەک لە سەرچاوەکانی سیرەدا هاتووە:

لە ڕۆژی هیجرەتی خۆشەویست لەگەڵ ئەبوبەکر بەرەو مەدینە دەشتەکییەک لێی پرسین لە چ هۆزێکن؟

پەیامبەر (دروودی خودای لێ بێت) فەرمووی: ئێمە لە ئاوین!

دەشتەکی-هۆزەکانی عەرەب زۆرن!

خۆشەویست مەبەستی ئەوە بوو ئەو لەو ئاوەیە کە مرۆڤی لێ دروست کراوە

## وانەی دووەم

زۆر گوتراوە لە بارەی مەترسیی درۆکردنەوە، هەوڵ دەدەین تیشک بخەینە سەر ئەو شوێنانەی درۆکردن تێیاندا ڕێگەی پێ دراوە، ئیسلام لە سێ کاتدا ڕێگەی داوە بە درۆکردن:

یەکەم: درۆکردن لەگەڵ دوژمنان... سەربازێکی مسوڵمان بە دیل دەگیرێت، پرسیاری لێ دەکەن لە بارەی سوپای مسوڵمانانەوە. لۆژیکی نییە بە ڕاستی وەڵام بداتەوە، زانیاری لە بارەی سوپای مسوڵمانانەوە بخاتە بەردەستی دوژمن... وەک دیارە دروستیی درۆ لە دۆخێکی ئاوادا بە مەبەستی دوورخستنەوەی مەترسییە لەسەر سوپای مسوڵمانان.

درۆکردن بە مەبەستی ڕێکخستنەوە و ئاشتەوایی نێوان دوو کەس ڕێگە دراوە بابای نێوەندگیر بە مەبەستی چاکسازی لە نێوانیان شتانێک بڵێت کە هیچ کامیان نەیانگوتووە. حیکمەت لە ڕێگەپێدانی ئەم جۆرە لە درۆکردن نەهێشتنی گرفتە کۆمەڵایەتییەکان و دەستەبەرکردنی کۆمەڵگەیەکی تەندروستە.

سێیەم: درۆی ژن بۆ پیاوەکەی و پیاو بۆ ژنەکەی.

ئەم جۆرە لە درۆکردن خۆی لە موجامەلە و مامەڵەی دروست و ناز و نەوازشی نێوان ژن و مێرددا دەبینێتەوە... درۆی مەبەستدار لەپێناوی فێڵ و تەڵەکە ناچێتە نێو چوارچێوەی دۆخە ڕێگەپێدراوەکەوە... بابەتەکانی غەزەل و خۆشەویستی و پێداهەڵدانی بەوەی جوانترین ئافرەتی دونیایە، گەرچی بەو شێوەیە نەبێت، ئەم بابەتە بۆ پیاویش بە هەمان شێوەیە.

پیاوێک پرسیاری لە هاوسەرەکەی کرد، سوێندت دەدەم بە پەروەردگار منت خۆش دەوێت؟ بە ڕاستی وەڵامم بدەرەوە:

ئافرەت: لەبەر ئەوەی سوێندت دام بە پەروەردگار... ڕاستیت پێ دەڵێم، خۆشم ناوێیت!

پیاوەکەی گلەیی و دادی بردە لای عومەری کوڕی خەتتاب

عومەر ناردی بە شوێن ئافرەتەکەدا.

ئافرتەکە گوتی: ئەی ئەمیری بڕواداران من ڕاستییەکەیم پێ گوتووە، دەتەوێت درۆی لەگەڵ بکەم؟

عومەر: بەڵێ، درۆی لەگەڵ بکە، هەموو ماڵەکان لەسەر خۆشەویستی بونیاد نراون مرۆڤەکان لەسەر بنەمای خۆشەویستی و بەدەمەوەچوونی یەکدی مامەڵە دەکەن.»

## وانەی سێیەم

بەرەبەیانی شەوێکی گەردەلوول و باراناوی چوومەوە درەوە بۆ نێو دارستان.

بینیم زۆرێک لە دارەکان شکاون

گژوگیاکان بێوەین وەک خۆیانن ماون.

لەم وێنەیەوە ئەو وانەیە فێر بووم هەندێک جار پێویستە مرۆڤ خاکی بێ و سەرفرۆدێنی.

مرۆڤی ژیر هەڵوێستەکان بە هەند وەردەگرێت، هیچ کات ناچێتە نێو کێبڕکێیەکی دۆڕاوەوە.

هەندێک جار پێویستە زۆر بە باشی لە قەبارەی هێزی نەیارەکانمان تێ بگەین،

هەر هەڵەیەک لە هەڵسەنگاندنمان واتای کۆتاییهاتن و لەناوچوونمانە.

زۆر جار تاکە ڕێگەی سەرکەوتن بە سەر

هەندێک لە کێشە و بەریەککەوتنەکان ئەوەیە

له بنەڕەتدا نەچیتە نێو مەیدانی ئەو کێبڕکێیانەوە
هەڵوێستی ئیبراهیم بەرانبەر فیرعەون، هەڵوێستێکی حەکیمانە بوو
باش دەیزانی گەر بەرەنگاری فیرعەون ببێتەوە، ئەوا بە دڵنیاییەوە تیادەچێت.
ئیبراهیم ترسنۆک نەبوو لە پلەی بەرزی شەهیدی هەڵنەدەهات.
باش ئەوەی دەزانی ئەو هاتووە لەپێناو ئەرک و پەیامێکی گەورەتردا
لەوەی خۆی لە بەرەنگاربوونەوەی فیرعەوندا تیابەرێت
کەرەستە دونیاییەکانی گرتە بەر و دەرئەنجامەکەی ڕادەستی پەروەردگاری کرد.
هەر بەم هۆیەوە پەروەردگار هاوسەرەکەی بە سەلامەتی بۆ گێڕایەوە
لەگەڵ ئافرەتێکی خزمەتکار کە دواتر بووە هاوسەری دووەمی ئیبراهیم.

## وانەی چوارەم

ئافرەتی ڕەسەن منەت ناکات بەسەر هاوسەریدا.
سارە قەشەنگترین ئافرەتی سەر زەوی بوو.
هەندێک لە ڕاڤەکارانی قورئان پێیان وایە، جوانیی یوسف ڕەگەزی قەشەنگیی سارەی داپیریەتی لە پاڵ قەشەنگیدا ڕەوشت و خوێنشیرینی لە جوانترین ئاکارەکانی ئەو بوون. دەستباریی هاوسەرەکەی بوو لە سەرخستنی حەق و ڕاستیدا، هیچ کات بەهۆی جوانییەوە منەتی بەسەر ئیبراهیمدا نەکرد. بە هەمان شێوە دایکمان خانمە خەدیجە (خودا لێی ڕازی بێت)، لە نموونەی

ڕەسەنترینی ئافرەتانە بە دەوڵەمەندییەکی بێوێنەوە هاوسەرگیریی لەگەڵ موحەممەدی هەژاردا کرد.

تەواوی داراییەکەی خستنە بەردەستی هاوسەرەکەی، جیاوازیی داریی نێوانیان نەبووە مایەی گرفت بۆ هاوسەرگیرییان.

هەر بەم شێوەیە ناوی چووە نێو مێژووەوە. زیاد لە هەزار ساڵە ناوی بە بەرزی ماوەتەوە، بە شێوەیەک پەیامبەر هێندە ناوی دەبرد و یادی دەکردەوە، عائیشە (خودا لێی ڕازی بێت) غیرەی دەکرد تا کار گەیشتە ئەوەی جارێک عائیشە گوتی:

«ئەو پیرە چییە هەر ناوی دەبەیت، خودا بۆی گۆڕیت بە هاوسەری باشتر لەو!»

ئازیز فەرمووی: سوێند بێت پەروەردگار کەسی لە خەدیجە باشتر پێ نەبەخشیوم، خۆشەویستیی ئەو لەنێو دڵمدایە... هەموو ماڵەکەی پێ دام، لەکاتێکدا هەموو خەڵکی لێیان گرتمەوە، پەنای دام، کاتێک ئەوانی تر وەدەریان نام... باوەڕی پێ هێنام، کاتێک ئەوانی تر بە درۆیان خستمەوە.

## وانەی پێنجەم

مسوڵمان بەنرخ و قەدرگرانە... پارێزگاری لە نرخی مسوڵمان داواکارییەکی شەرعییە.

ئەمە واتای ئەوە نییە ترسنۆکە، مردن لە حیساباتی مسوڵمان کۆتاییەکی مەترسیدار و تۆقێنەر نییە.

مرۆڤەکان قۆچ نین بکرێنە قوربانی... دەبێت هەموو شت بکرێ لەپێناو پاراستنی خوێنی مرۆڤەکاندا.

عەمری کوڕی عاس ناسراو بوو بە زیرەکی و لێهاتوویی لە جەنگ و فتوحاتەکانیدا، زۆرترین ڕێککەوتن و کەمترین جەنگی لەگەڵ

دوژمنەکانی ئەنجام دەدا... هیچ کات نەدەچووە نێو جەنگێکەوە، گەر تاقە دەرگایەک هەبوایە بۆ هەڵهاتنی دوژمن... هەلاّتنی دوژمنی پێ باشتر بوو لە بەرەنگاربوونەوەی.

ئەم ستراتیژەی عەمر واتە خۆپاراستن لە جەنگ و بەرەنگاربوونەوە، پاراستنی خوێنی جەنگاوەرەکانی... ڕوونتر بلّێین گەییشتن بە ئامانج، بەبێ ڕژانی خوێن بووە مایەی سەرسامیی عومەری کوڕی خەتتاب.

عومەر بە خۆشحاڵییەوە دەیگوت: سوێند بێت ئەمە سەرکەوتنی ڕاستەقنەیە.

عومەر سەرسام بوو بەو سەرکردانەی کە خوێنی سەربازەکانیان دەپارێزن... پێی وابوو سەرکردەی بەهێز ئەوەیە بەبێ ڕژاندنی خوێن دەگاتە ئامانجەکانی.

ئەمە ڕاستییەکە دەبێت تەواوی سەرکردە مەیدانییەکان بە تەواوی لە پێش چاویان بێت.

هەمیشە خۆپاراستنی ئیبراهیم و بلیمەتیی عەمریان لە پێش چاو بێت

## گفتوگۆی نێوان موسا و ئادەم (سەلامی خودایان لێ بێت)

بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە، خۆشەویستِ فەرموویەتی: (ئادەم و موسا کەوتنە گفتوگۆ لای پەروەردگار، موسا بە ئادەمی گوت:

« تۆیت پەروەردگار بە دەستی خۆی دروستی کردویت

لە ڕۆحی خۆی فووی پێدا کردیت

فریشتەکان کڕنووشیان بۆ بردیت

لە بەهەشت نیشتەجێی کردیت

دواتر خەڵکی بەهۆی هەڵەی تۆوە هاتنە سەر زەوی؟

ئادەم: تۆ ئەو موسایەی کە پەروەردگار هەڵیبژاردیت

قسەی لەگەڵ کردووی و پەیامی بۆ ناردیت؟

لە خۆی نزیکی کردوویتەتەوە

ئەلواحی پێداویت کە ڕوونکردەوەی هەموو شتی تێدایە

چەندە پێش ئەوەی من دروست بم خودا تەوراتی نووسیوە؟

موسا: چل ساڵ.

ئادەم: لە تەوراتدا دەقی: ﴿ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ﴾ (طه)، «ئادەم لە فەرمانی پەروەرندەی لای دا، لەڕێ دەرچوو»ت بینیوە؟

موسا: بەڵێ.

ئادەم: ئیتر چۆن لۆمەم دەکەیت لەسەر کارێک

کە چل ساڵ پێش دروستبوونم خودا لەسەری نووسیوم.
خۆشەویست فەرمووی: ئادەم موسای بێدەنگ کرد.

## وانەی یەکەم

مرۆڤە جوامێرەکان پێگە و حورمەتی ئەوانی تر دەپارێزن،
تەنها ڕەسەنەکان قەدری ڕەسەنەکان دەزانن.
جوامێر بە، لەبەر تەنها هەڵوێستێک مێژووی قەشەنگی ئەوانی تر مەسڕەرەوە.
مرۆڤی بەڕێز گەر جارێک پێی نەدرا، ڕابردووی پڕ بەخشندەیی ئەوانی تر لە یاد ناکات،
بڕوانە گفتوگۆی ڕەسەن و پڕ لە جوامێریی نێوان ئادەم و موسا (سەلامی خودایان لێ بێت).
کێشمەکێشمیانە لە بارەی گەورەترین و پڕبەهاترین بابەتی بوون: بەهەشت.
لۆمەی موسا لە ئادەم، فەزڵ و گەورەیی ئادەمی لە بیری موسا نەبردەوە.
بەرگریی ئادەم لە خۆی، نەبووە مایەی لەبیرچوونەوەی فەزڵی موسا.
جوامێر و ڕەسەن بە، تەنانەت لە کاتی ناکۆکی لەگەڵ ئەوانی تر، پێگە و کەسایەتییان بپارێزە.

## وانەی دووەم

ئێمە ئوممەتی شوێنکەوتەی پەنهانین
ئەوەی براوامان پێ هێناوە و نەمانبینیوە
زۆر زیاترە لەوەی باوەڕمان پێ هێناوە و بینیومانە

بڕوامان هێناوە بە دۆزەخ و بەهەشت
زیندووبوونەوە و لێپرسینەوە و فریشتە و سیرات
لە ڕاستیدا هەموو ئامانە بابەتی پەنهانن.

وەک قورئان ئاماژەی پێ دەکات، یەکەمین سیفەت لە سیفاتی لە خوداترسان، باوەڕهێنانە بە پەنهان، وێنای ئەم بابەتە دەکات لە سەرەتای سورەتی بەقرەدا:

﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَـٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ۝٣ ﴾ (البقرة) «ئەم کتێبە هیچ گومانی تێدا نییە بۆ ئەوانەی پارێزگارن ڕێنیشاندەرە، ئەو کەسانەی بڕوایان بە نادیار هەیە و نوێژ دەکەن و لەو بژێوییەیش کە پێمان داون دەبەخشن.»

قورئان پێش بابەتەکانی نوێژ و زەکات و بەخشین
تیشک دەخاتە سەر گرینگی باوەڕهێنان بە پەنهان.
پەرستشی بێئیمان جگە لە کۆششی بێ پاداشت هیچی تر نییە
ئەمە گفتوگۆیەکی بوێرانەی جیهانی پەنهانە
موحەمەدی ڕاستگۆ هەواڵی پێ داوین
باوەڕی پێ دەهێنین وەک چۆن باوەڕ بە تەواوی بابەتە پەنهانەکانی تر دەهێنین.
بێ پرسیارکردن لە کەی؟ بۆ؟ چۆن؟

## وانەی سێیەم

بزانە دەکرێت بۆچوونەکانت هەڵە بن! لە ژیاندا بەو شێوەیە مامەڵە مەکە وەک ئەوەی مرۆڤێکی بێ کەموکورتی بێت.

ڕەخنە و تێبینیەکانی تۆ لەسەر خەڵکی جگە لە بۆچوون شتێکی تر نین، ڕاهاتووین لەسەر ئەوەی ڕەخنە لەوانی تر بگرین.

زۆر جار گەر دۆخی ئەوانی تر بزانین و لە زاری خۆیانەوە،

نەک لە خەڵکی ترەوە بیانناسین، تێدەگەین لەوەی بڕیاری هەڵەمان لە بارەیانەوە داوە. موسا (سەلامی خودای لێ بێت)، دەیەوێت ئادەم تێبگەیەنێت کە هەڵەی کردووە... دوای تەواوبوونی گفتوگۆکە ئادەم قسەی موسای بڕی.

شیکاریی بۆ هەڵوێستی ئەوانی تر مەکە و دواتر وەک حەقیقەتێکی ڕەها لە بۆچوونەکەت بڕوانیت.

بە بۆچوونی تەختە بزمار جگە لە تاوانبارێک کە جەستەی ئەو کون دەکات زیاتر شتێکی تر نییە.

گەر تەختە زانیبای لە سەرەوە چەکوش چەندە بە توندی لە بزمار دەدات، بە دڵنیاییەوە لە بزمار نیگەران نەدەبوو.

## وانەی چوارەم

بۆچوون بە بۆچوون وەڵام دەدرێتەوە، بەڵگە بە بەڵگە بەرپەچ دەدرێتەوە.

شمشێر چەندە بەهێز بێت، ناتوانێت بۆچوونێکی ڕاست لەناو بەرێت.

هێز ناتوانێت ڕاستییەکان داپۆشێت، گەرچی بۆ ماوەیەکی کورت بە سەریدا زاڵ ببێت.

بە دەست و مەچەکت نا، بە عەقڵ و ئاوەزت بیر بکەوە.

کاتێک بە گۆچان کارت دەڕوا، بەکارهێنانی شمشێرەکەت گەمژەییە.

لەو جێگەیەکی بە زمانت کارت دەڕوا، بەکارهێنانی گۆچانەکەت گەمژەییە.

بە ڕوانینێکی توند کارت دەڕوا، بەکارهێنانی زمانت گەمژەییە

هەمیشە بەهێز بە و هیچ کات بوودەڵە مەبە

لە یادی نەکەیت بەدەستهێنانی دڵی ئەوانی تر لەپێشترە لە

سەرکەوتن لە هەڵوێستەکان

ئەو مرۆڤەی کار لەسەر ئەوە دەکات هەمیشە لە هەڵوێستەکاندا سەر بکەوێت، هیچ دۆستێکی لە دەور نامێنێت.

## وانەی پێنجەم

پەروەردگار ڕێزی لە ئوممەتی ئیسلام ناوە بەوەی قورئانی پیرۆزی بۆ پاراستوون، پەروەردگار هیچ لە کتێبەکانی پێشووی نەپاراستووە و پەیمانی پاراستنی نەداوە... ئەمە لە بێدەسەڵاتیی پەروەردگارەوە نییە... بە ئیرادەیەکی ئیلاهییە کە خۆی دەیەوێت لە تەوراتدا: ﴿ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ﴾ (طه) بەر چاو ناکەوێت، پەیامبەرێک پەیامبەرێکی تر لە بوونی دڵنیا دەکاتەوە.

بەڵام زانایانی بەنی ئیسرائیل دەستکارییان کرد، هەر وەک چۆن قەشەی نەسرانییەکان دەستکاریی ئینجیلیان کرد.

چەندە نیعمەت و فەزڵێکی گەورەیە کتێبێک دەخوێنینەوە، دڵنیاین لەوەی گوتەی پەروەردگارە لە سەروو حەوت ئاسمانەوە.

ئەم قورئانە کتێبی ژیان و ژیاندۆستییە دابەزیوە بۆ ئەوەی خەڵکانی زیندوی پێ ئاگادار بکرێتەوە.

بۆ مردوان نییە و بازرگانی پێوە ناکرێت، هەڵبەت لێرەدا باس لەوە ناکەین ئایا مردوو سوود لە خوێندنی قورئان دەبینێت یان نا، ئەم بابەتە فراوانە و لێرەدا کاری ئێمە نییە، هیچ گومانی تێدا نییە بە زیندوویی سوود لە قورئان نەبینی بە مردوویی سوودی لێ نابینیت.

## وانەی شەشەم

هەموو ئەو سیفەتانەی پەروەردگار لە قورئاندا داویەتیە پاڵ خۆی، باوەڕمان پێییەتی بەبێ گۆڕین و لەکارخستن، دەست دەدەینە پاڵ

پەروەردگار، بەو شێوەیەی: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ ﴾ (الشوری) «هیچ شتێ وێنەی ئەو نییە هەر خۆی بیسەر و بینایە»، گەر دەست بە واتای قودرەت بێت، وەک ئەوەی هەندێک لە مسوڵمان باوەڕیان پێیەتی، کێشەیەک بۆ باوەڕیان دروست ناکات. تیشک خستنەسەر ئەم بابەتە، پێویستییەکی ئەوتۆی نییە هەمووان بە قودرەتی پەروەردگار دروست بووین، کاتێک پەروەردگار بە ئیبلیسی گوت: چی بووە ڕێگر لەوەی کڕنووش بەری بۆ ئادەم کە بە دەستی خۆم دروستم کردووە.

گەر دەست لێرەدا بە واتای قودرەت بێت، بە دڵنیاییەوە ئیبلیس دەیگوت: منیشت بە قودرەتی خۆت دروست کردووە.

لە حاڵێکدا ئێمە بەم شێوەیە بڕوامان بەم بابەتەیە عوزر بۆ ئەو برا مسوڵمانانامان بهێنینەوە، کە ئەم سیفەتانە تەئویل دەکەن، گومانمان لە ئیمانیان نییە، نیەتیان جگە لە پاکڕاگرتنی خودا شتێکی تر نییە.

هەر کەس مسوڵمانێک تەکفیر بکات بەهۆی باوەڕبوونی بەوەی بە زاهیری قورئان جێگیر بووە، بە دڵنیاییەوە بێئەدەبیی بەرانبەر مەقامی پەروەردگار کردووە.

چ بێئەدەبییەکە مسوڵمان پێی وا بێت پەروەردگار کتێبێکی ناردووە کە ڕووکەشەکەی کوفر و بێباوەڕییە

لێپرسینەوەی تەواوی مرۆڤەکان لەسەر خودایە.

## وانەی حەوتەم

ئەوەی لە بووندا ڕوودەدات پەروەردگار لە لەوحی مەحفووزدا تۆماری کردووە. ئەوەی لە لەوحی مەحفووزدا نووسراوە، بە دڵنیاییەوە ڕوودەدات. کردەوەی مرۆڤەکان کە پەروەردگار بە زانستی ڕەهای خۆی زانستی پێی هەیە، بەرپرسیارێتییان لەسەر بەندەکان لا ناکەوێت.

هەڵەین گەر پێمان وا بێت تەواوی کرداری مرۆڤەکان لە لەوحی مەحفووزدایەم دەنا بە پێچەوانەوە بابەتی پاداشت و سزا دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە، مەحاڵە پەروەردگار لێپێچینەوە لەگەڵ بەندەکانی بکات لەسەر شتێک کە لەسەری نووسیویانە، لە ڕاستیدا زانستی پەروەردگار زانستێکی ڕەهایە و دوورە لە هەڵەوە، بۆ نزیککردنەوەی بابەتەکە ئەم نموونەیە دەخەینە ڕوو:

پەروەردگار منداڵێکی پێ دەبەخشێت، لەژێر چاودێریی خۆتدا پەروەردەی دەکەیت، بە وردی شارەزای ئەخلاق و ڕەوشت و بیروباوەر و بیرکردنەوەی بوویت، بەڵام دوای هەموو ئەمانە پێشبینیی ئەوە دەکەیت کوڕەکەت دزی بکات.

دەکرێت پێشبینییەکەت بێتە دی و لەوانەیە نەیەتە دی، گەر پێشبینییەکەت هاتە دی، واتای ئەوەیە ناچارت کردووە لەسەر دزیکردن؟ تەنها پێشبینییەکەت هاتووەتە دی.

بابەتی زانستی پەروەردگاریش بە هەمان شێوەیە، زانستی سنووررداری ئێمە لە کوێ و زانستی بێسنووری پەروەردگار لە کوێ. زانستی ئێمە حەدەسە و زانستی پەروەردگار یەقین و دڵنیاییە، لە حاڵێکدا مرۆڤەکان ئازادن لە ئەنجامدان و نەدانی کردەوەکانیان مرۆڤەکان مافی ئەوەیان نییە قەدەر بکەنە بەهانە بۆ هەڵە و تاوانەکانیان.

هیچ لە بارەی قەدەری پەروەردگارەوە نازانین، تا ئەو کاتەی ڕوو دەدات، کاتێک مرۆڤ تاوانی کوشتن و دزی ئەنجام دەدات

قەدەرێکی نەسەپێنراوی ئەنجام داوە بە پێچەوانەوە ئایین هیچ بەهایەکی نامێنێت و ئامانجێک نامێنێت لە ناردنی پەیامبەران. پێش دروستبوونیان پەروەردگار زانستی هەیە بە ئەهلی بەهەشت و دۆزەخ پەروەردگار پەیامبەرەکانی دەنێرێت بۆ ئەوەی هانی مرۆڤەکان بدەن بە ئارەزوومەندیی خۆیان هەنگاو بەرەو قەدەرەکانیان بنێن.

## ئەو پیاوەی سەد کەسی کوشت

موسلیم دەگێڕێتەوە خۆشەویست دەفەرموێت: لە ئوممەتانی پێشین پیاوێک نەوەدونۆ کەسی کوشتبوو،

ویستی تۆبە بکات، پرسیاری کرد لە زاناترین کەسی سەردەمی خۆی،

گوتیان: فڵانە خوداپەرست زاناترینە.

هاتنە لای و پێیان گوت: نەوەدونۆ کەسی کوشتووە دەتوانێت تۆبە بکات؟

گوتی: نەخێر...

ڕاهیبی کوشت کردییە سەد.

دواتر پرسیاری کرد لە زاناترین کەسی سەردەمی خۆی.

گوتیان زانایەک لە فڵانە شوێن هەیە.

گوتیان: ئەم پیاوە سەد کەسی کوشتووە، دەتوانێت تۆبە بکات و بگەڕێتەوە لای پەروەردگار؟

گوتی: بەڵێ، هیچ کەس ناتوانێت ڕێگریی تۆبەی لێ بکات.

بڕۆ بۆ فڵان ناوچە خەڵکانێکی خوداپەرست لەوێ هەن، ببە هاوڕێیان و لەگەڵ ئەوان خوداپەرستی بکە، ئیتر مەگەڕێوە بۆ ئەو جێگە خراپەی لێی بووی.

کابرا ملی ڕێگەی گرت لە نیوەی ڕێ مردن بەرۆکی گرت
فریشتەی میهرەبانی و فریشتەی سزا بووە ناکۆکییان
فریشتەی میهرەبانی گوتی: ڕێبواری ڕێگەی تۆبەیە و ڕێی پەروەردگاری گرتووە.
فریشتەی سزا گوتی: لە تەمەنیدا هیچ چاکەیەکی نەکردووە.
فریشتەیەک لە شێوەی مرۆڤێکدا هاتە لایان و گوتی: من داوەریتان دەکەم.
گوتی: نێوان هەردوو ناوچەکە بپێون، کامیان نزیکتر بوو ئەوە بۆ ئەویانە
پێوایان، بینییان نزیکترە لەو ناچەیەی دوای تۆبەکردن بۆی هاتووە
فریشتەی میهرەبانی ڕۆحەکەی لەگەڵ خۆی برد.

## وانەی یەکەم

کاتێک لە بابەتەکانی ئایینەکەت گرفتێک دێتە ڕێت
مەچۆرە لای خوداپەرستان،
ڕووت لە دەرگای زانایان بێت.
پەرستشی خوداپەرست بۆ خۆیەتی و جەهل و نەزانییەکەی بۆ ئەوانی ترە.
خەمساردیی زانا لە پەرستشەکان تاوانەکەی بۆ خۆیەتی
زانستەکەی بۆ ئەوانی ترە.
کاتێک ئۆتۆمبێلەکەت کێشەیەکی بۆ دروست دەبێت
بەدوای باشترین فیتەری ئەو بوارە دەگەڕێیت.
کاتێک دەتەوێت مێزێک دروست بکەیت
دەچیتە لای دارتاشێکی شارەزا

ئایین و بیروباوەڕ بەنرخترە لە تەواوی ئەوانەی تر.
زۆر گرینگە لە خەڵکانی پسۆڕ وەربیگرین
مەرج نییە ئیمامی مزگەوتەکان زانا و فەقیهـ بن
پەرستش گرینگە و مرۆڤ لە پەروەردگار نزیک دەخاتەوە.
زانست شتێکی ترە،
تەنانەت هاوەڵانی پەیامبەر هەموویان ئەهلی زانست و فەتوا نەبوون، هەریەکەیان تایبەتمەندییەکیان هەبووە،
ئوبەی کوڕی کەعب (ڕەزای خودای لێ بێت)، شارەزاترینی هاوەڵان بوو لە قورئانخوێنیدا.
موعازی کوڕی جەبەل (ڕەزای خودای لێ بێت) شارەزاترینیان بوو لە حەڵال و حەرامدا
کاتێک ئەبوبەکری سدیق دوای ئەویش عوسمانی کوڕی عەففان ئەم پرسەیان نەدا بە خالیدی کوڕی وەلید، کەعبیان ڕاسپارد بۆ ئەم کارە، لەبەر پسپۆڕییەکەی.
کاتێک کار هاتە سەر جەنگ و بەرەنگاربوونەوەی هەڵگەڕاوەکان، خالیدی کوڕی وەلید ئەم ئەرکەی گرتە ئەستۆ.
تەواوی کاروبارەکان لەسەر پسپۆڕی وەستاوە.
کاتێک زیبریقانی کوڕی عەدی هاتە لای عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خودای لێ بێت) و شکاتی کرد لە حوتەیئە لەسەر ئەوەی هەجووی کردووە بە

دَعِ المَكـارِمَ لا تـَرحَل لِبُغيَتِهـا
وَاقعُد فَإِنَّكَ أَنتَ الطاعِمُ الكاسي

واز لە کردنی ئەو پیاوەتی و مەردایەتییە بهێنە کە تۆ نیتە
کۆشش مەکە لەپێناو بەدەستهێنانیان
دابنیشە، تۆ ناندراو و پۆشاکلەبەرکراوی

عومەر گوتی: حوتەئییە پسپۆڕی بواری شیعرە و هیچ هەجوویەک لەم شیعرەدا نابینم
زیبریقان گوتی: پیاوەتیی من هەر هێندەیە بخۆم و بپۆشم؟
عومەری ویستی لەم بابەتە بکۆڵێتەوە،
بۆ لێکۆڵینەوە لە شیعرەکەی حوتەیئە
نەینارد بە شوێن موعازی کوڕی جەبەلدا، شارەزاترینی هاوەڵان بە بابەتەکانی حەلاڵ و حەرام
نەینارد بە شوێن ئەبوهورەیرەدا، لە هەمووان شارەزاتر لە بواری فەرموودەدا،
بەڵکوو ناردی بە شوێن حەسانی کوڕی سابتدا
بابەتەکە شیعرە و قسە و فەتوا تەنها لە شاعیران وەردەگیرێت.
حەسان گوتی نەک هەر هەجووی کردووە، بەڵکوو میزی پێدا کردووە، عومەر حوتەیئەی خستە زیندانەوە.

## وانەی دووەم

هەر کەس بڵێت (اللە اعلم)، خودا زاناترە ئەوە فەتوای داوە حکومی شتێکت نەزانی، پێت ئاسایی بێت بڵێی نازانم.
لەبەر ئەوەی لە ڕووت نایە بڵێیت نازانم، یان خودا زاناترە تاوانی خەڵکی مەخەرە ئەستۆی خۆتەوە، شەعبی قازی و زانا و فەقیهـ و فەرموودەناس پرسیاری لێ کرا لە بارەی بابەتێکەوە گوتی (اللە اعلم).
گوتیان تۆ فەقیهی عێراقی، شەرم ناکەیت دەڵێیت نازانم و دەڵێیت (اللە اعلم).
گوتی: فریشتەکان شەرمیان نەکرد کاتێک گوتیان:
﴿ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ﴿٣٢﴾ ﴾ (البقرة) «هەر تۆی لە

کەمایەتی بە دووری، ئێمە بەدەر لەوەی کە تۆ فێرت کردووین هیچ نازانین.»

مالیکی کوڕی ئەنەس ئەوەندە بلیمەت بوو، دەیانگوت کاتێک مالیک لە مەدینەدایە کەس مافی فەتوادانی نییە. پیاوێک لە عێراقەوە کۆمەڵێک پرسیاری لێ کرد، وەڵامی هەندێکیانی دایەوە لە بارەی هەندێکیانەوە بێدەنگ بوو.

کابرا گوتی: ئەی مالیک بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە نادەیتەوە، من چی وەڵامی خەڵکی عێراق بدەمەوە؟

مالیک: پێیان بڵێ مالیک وەڵامەکانی نەزانی.

## وانەی سێیەم

ئاگادار بە! هیچ کات پێتوانەبێت تاوانەکانت گەورەترن لە فراوانیی میهرەبانیی پەروەردگارت.

شەیتان ڕێک ئەمەی دەوێت، دڵنیا بە دەیەوێت تاوانەکانت لە پێش چاو گەورە بکات و میهرەبانیی خودات لەبەر چاو بچووک بکاتەوە، ئەم پیاوە نەوەدونۆ کەسی کوشت، بڕیاری دا تەوبە بکات، جارێکی تر گەڕایەوە سەر تاوانەکەی.

قوربانییەکانی کرد بە سەد، کاتێک پەروەردگار خێری لە دڵیدا بە دی کرد هۆکاری پەشیمانبوونەوەی بۆ سازان

ڕاستگۆ بوو لەگەڵ خودا، پەروەردگاریش سەرفرازیی هێنایە ڕێی، توێشووی پێچایەوە و ڕێگەی گرتە بەرم لە ڕێیەدا مردن تووشی هات. لە گێڕانەوەی بوخاریدا هاتووە، فریشتەکان کاتێک ماوەکەیان پێوا، کابرا ڕێک لە نیوەی ڕێگەدا بوو پەروەردگار فەرمانی کرد بە زەوی بێتەوە یەک، لێک نزیک بێتەوە تا نزیک بێتەوە لەو جێگەی سەفەری بۆ کردبوو، لە ڕاستیدا ئەم تەوبەکارە جگە لە خوێنڕێژێک هیچی تر نەبوو.

لەسەر سادەترین بابەت خوێنی دەڕشت، پیاوێکی کوشت لەبەر ئەوەی فەتواکەی بە دڵ نەبوو، لەدوای هاوەڵ بڕیاردان بۆ پەروەردگار، هیچ تاوانێک هێندەی کوشتن سەخت نییە، کەچی پەروەردگاری لێی خۆش بوو.

پێوەندییە ناشەرعییەکانت گەورەتر نین لە میهرەبانی پەروەردگارت.

بەرتیلوەرگرتنت گەورە تر نییە لە بەزەیی پەروەردگارت.

تاوانی شەرابخۆریت گەورەتر نییە لە لێخۆشبوونی پەروەردگارت.

بڕوانە هاوەڵانی پەیامبەر دۆستانی قۆناغی وەحی و پەیامبەری پێش دەرکەوتنی نوری ئیسلام چۆن بوون؟

عومەر بە تووڕەییەوە لە ماڵ چووە دەر، بۆ ئەوەی پەیامبەر بکوژێت.

عیکرمە ئەو جەنگاوەرە سەرسەختەی پەیامبەر ڕۆژی فەتح سزای مەرگی بە سەردا سەپاند.

خالیدی شمشێری خودا بووە مایەی شکست و تێکشانی مسوڵمانان.

گەر پیلانی ئەو نەبا حەمزە شەهید نەدەبوو

ئەو سوێ بە ئازارە نەدەکەوتە دڵی خۆشەویستەوە.

دواتر هەموویان گۆڕان،

عومەر زەوی پڕ کرد لە دادپەروەری

عیکرمە لە شەڕی یەرمووک بووە فەرماندەی سوپای ئیسلام.

خالیدی شمشێری هەڵکێشراوی پەروەردگار بە فەرمانی ئەبوبەکر لگوتی فارس و ڕۆمی شکاند.

ئێستایشی لەگەڵ بێت کۆمەڵێک لە خەڵکی دەبینین

بە دوژمنانی سەرسەختی ئیسلام ناسراون،
دواتر تۆبە دەکەن و دەبنە گەورەترین بەرگریکاری ئیسلام.
گەر نوقمی تاوان بوویت،
ئاگادار بە، دەرگای میهرەبانیی پەروەردگار کراوەیە.

## وانەی چوارەم

مەبە بەربەست لەنێوان خودا و خەڵکیدا، مەبە مایەی کەلێن لەنێوان خودا و بەندەکانیدا، گوناهکاران پێویستیان بە کەسانێکە دەستیان بگرێت بەرەو پەروەردگار، ئیتر بۆچی خەڵکی لە پەروەردگار دوور دەخەیتەوە. پێش باسکردنی توورەیی لە بارەی گەورەیی میهری خوداوە بۆ گوناهباران بدوێ، بەهەشت فراوانە نیگەران مەبە، جێگەی تۆی تێدا دەبێتەوە.

گوناهباران پێویستیان بە سۆز و بەزەییە، پەیامبەر ڕاهیبێکی بینی لەسەر ئایینە باتڵەکەی شەونوێژ دەکات.

خۆشەویست گریا، گوتیان بۆ دەگریت ئەی پەیامبەر!

فەرمووی ﴿ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴿٤﴾ ﴾ (الغاشية) «لە کارکردندا چەوساوان، گرفتاری ئاورێکی سووتێنەر دەبن، نیگەران بوو، لەوەی کەسێکی شوێنکەوتەی ئایینێکی تر بچێتە دۆزەخەوە، ئیتر چۆن ڕازی دەبێت کەسێکی ئەهلی ئیسلام بچێتە دۆزەخەوە».

سەردانی جوولەکەیەک دەکات لە سەرەمەرگدا،
بانگەوازی دەکات بۆ ئیسلام.
پاشان دەفەرموێت، سوپاس بۆ ئەو خودایەی بەهۆی منەوە ڕزگاری کرد لە دۆزەخ.

خۆشەویستترین بەندەی پەروەردگار
ئەوەیانە کە پەروەردگار لای خەڵکی خۆشەویست دەکات.

گوناهکاران تاوانەکانیان و شەیتانەکانیان بە سەریاندا زاڵ بوون.
ئیتر ئەمە بەس نییە.
ئێمەیش باری سەرشانیان قورس بکەین.
پەیامبەر جار هەبووە لە شەونوێژدا بە درێژایی شەو ئەم ئایەتەی خوێندەوە:
﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ (المائدة)
«گەر بتەوێ ئازاریان دەی، عەبدی خۆتن، گەر بشتەوێ لێیان خۆش بیت، خۆت دەزانی و هەر بۆ خۆتی کە دەسەڵاتت بە دەستە و لە کارزانی».
پەروەردگار وەڵامی دەداتەوە:
مژدەی ڕەزامەندیی ئومەتەکەی پێ دەدات
پێویستە ئەم میهرەبانییەی پەروەردگارمان لە پێش چاو بێت.
ڕقمان لە تاوان بێت، نەک تاوانبار.
لە فەرموودەدا هاتووە: یەکێک لە هۆزەکان بە توندی ئازاری پەیامبەرەکەیان دا و ڕوومەتەکانی خوێناوی بوو.
بە نەرمی خوێنەکەی ڕووی سڕی و گوتی: اللهم اغفر لقومي فانهم لايعلمون «پەروەردگارا لە هۆزەکەم خۆش بە، چونکە ئەوان نازانن.»

## وانەی پێنجەم

مردن بێ ئاگاداری بەرۆکی مرۆڤەکان دەگرێت، هاوەڵی ئێمە لە ڕێگەدا بەرەو زەویی چاکان، مردن بەرۆکی گرت،
چەندە قەشەنگە ئەم کۆچە، چەندە ڕەنگینە ئەم مردنە لە ڕێی گەیشتن بە پەروەردگاری ژیانی کۆتایی هات لە نزیکەکانت. بڕوانە خەڵکێکی زۆر ناشتیان، نەگەییشتن بیدورنەوە!

چەندین ماڵ بونیات نرا، خاوەنەکەی تێدا نەژیا.

چەندین کورسیی خوێندن چۆڵ بوون، خاوەنەکانیان مردن و کۆتاییان پێ نەهێنا.

چەندین منداڵ لە گۆڕ نران، چەندین گەنج بارگەیان پێچایەوە.

چەندیک کچی ڕوومانگیی لەبری کەژاوەی زاوایەتی

بۆ نێو گۆڕ بەڕێ کران.

مەڵێ سبەی دەگەڕێمەوە،

هەموو ئەوانەی مردن،

وەک ئێمە باوەڕیان وابوو بەم زوانە نامرن.

## وانەی شەشەم

نیەتەکان هۆکاری وەرگیرانی کارەکانن، نیەت بە تەنها بەرەو بەرزیمان دەبات، گەرچی کارەکەیش نەکەین.

لەسەردەمی پەیامبەر موسادا، برسیەتی ڕووی کردە بەنی ئیسرائیل.

یەکێک لە هەژارەکان ڕووی کردە یەکێک لە چیاکان و گوتی: پەروەردگارا، تۆ دەزانیت گەر هێندەی ئەو چیایە زێرم هەبا بە سەر خەڵکیدا دابەشم دەکرد. پەروەردگار سروشی بۆ موسا نارد: بەو بەندەیەم بڵێ ئێمە ئەو خێرەمان لێ قەبوڵ کرد.

کردەوەکان لەگەڵ نیەتی خراپ سوودێکیان نییە.

عەبدوڵڵای کوڕی سەلول لەدوای پەیامبەرەوە نوێژی بەیانیی دەکرد، کەچی لەژێری ژێرەوی دۆزەخدایە.

نیەتت چاک بێت، پەروەردگار کارەکانت چاک دەکات. دەخیلت بم وەک ئەو کەسە نەبیت بە ئومێدی سەوزبوونی لە دەریادا، گەنم دەچێنێت بێ ئەوەی هیچی لێ سەوز بێت، لە کۆتاییدا دەستخەڕۆییە هیچ پاداشتێکی نییە.

# چیرۆکی سێ هاوەڵی ناو ئەشکەوت

جارێک سێ کەس لە پێشینان بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشتن، باران دایگرتن، شەو هات، پەنایان بردە بەر ئەشکەوتێک، تاوێرێکی گەورە لە کێوەکەوە گل بووەوە، دەرگای ئەشکەوتەکەی قەپات کرد، لەناو خۆیاندا کەوتنە گفتوگۆ، گوتیان سەیر بکەن بزانین چ کردەوەیەکی باشمان کردوە بۆ خودا بەو کردەوانە لە خودا بپاڕێنەوە، بەڵکوو بەهۆی ئەو کردەوە باشانەوە پەروەردگار دەرووی خێرمان لێ بکاتەوە و لەم تاوێرە ڕزگارمان بێت.

یەکیان گوتی: پەروەردگارا، خۆت ئاگاداری کە من باوک و دایکێکی پیر و چەند منداڵێکی وردم هەبوو، شوانیم دەکرد و بژێوییانم دابین دەکرد، هەموو جارێک دەگەڕامە ماڵەوە، ڕانەکەم دەکردە پەچە و شیرم دەدۆشی، لە پێشدا دەرخواردی باوک و دایکمم دەدا، دوای ئەوان بەشی منداڵەکانم دەدا، ڕۆژێک بەشوێن لەوەڕی باشدا دوور کەوتمەوە، درەنگم بەسەر هات، کە هاتمەوە شەو بوو، بینیم دایک و باوکم خەوتوون، منیش وەک جاران شیرم دۆشی بۆم بردن، بە دیار سەریانەوە ڕاوەستام، بە ئومێدی ئەوەی هەر کات بەئاگا هاتن شیرەکەیان بخۆنەوە، پێم خۆش نەبوو بەئاگایان بهێنم، پێشم خۆش نەبوو لەبەر ئەوان شیر بدەم بە منداڵەکان، منداڵەکانیشم لەو ماوەیەدا

لەبەر پێمدا لە برسان هەر دەزرووکانەوە تا بەرەبەیان ئەمە حاڵمان بوو، پەروەردگارا، ئەگەر ئەم کارەم لەبەر ڕەزامەندیی تۆ کردووە، دەروویەکمان لێ بکەرەوە ئاسمانی لێوە ببینین، تاوێرەکە کەمێک خزا و کەمێک ئاسمانیان لێوە دەرکەوت، بەڵام نەیانتوانی دەربچن.

یەکێکی تریان گوتی: پەروەردگارا، تۆ خۆت ئاگاداری کچێکی ئامۆزام هەبوو زۆر تامەزرۆی بووم، داوای کاری خراپەم لێ کرد، بەڵام خۆی نەدا بە دەستەوە، هەتا ساڵێکیان دووچاری دەستکورتی و قاتوقڕی هات، بە ناچاری هات بۆ لام دوای هاوکاریی لێ کردم، منیش سەد دیناری ئاڵتوونم پێ دا لە بریی ئەوەی ڕازی بێت کاری خراپەم لەگەڵ بکات، ئەویش بە ناچاری تەسلیم بوو، کاتێک دەستم لێی گیر بوو، لەناو کۆشیدا دابنیشم، کچەکە گوتی: ئەی بەندەی خودا، لە خودا بترسە ئەو مۆرە بە ناڕەوا مەشکێنە، ترس گرتمی و هەڵسام و وازم لێ هێنا، پارەکەیشم دایە بۆ خۆی، پەروەردگار، تۆ دەزانی ئەگەر ئەم کارەم لەبەر ڕەزامەندیی تۆ کردووە دەروویەکمان لێ بکەرەوە، لەم نەهامەتییە ڕزگارمان بکە، پەروەردگار دەروویەکی تری لێ کردنەوە، دوو بەشی تاوێرەکە لەسەر دەرگاکە لاچوو.

سێهەمیان گوتی: پەروەردگارا، خۆت ئاگات لێیە، جارێک کرێکارێکم بە قرناخێک برنج بە کرێ گرتبوو، کە ئیشەکە تەواو بوو، گوتی کرێکەم بدەرێ منیش گوتم ئەوە کرێکەت، کەچی بە دڵی نەبوو وەرینەگرت، منیش کە ئەو ڕۆیشت کرێی کرێکارانم هەمووی دا، چەڵتووکەکەی ئەویشم هەموو وەرزێ دەچاند و بەرهەمم دەهێنا، بە شێوەیەک زۆر بوو تا گاکەلێک و وشتر و مەڕ و چەند بەندەیەکم پێ کڕی، دوای ماوەیەکی زۆر کرێکارەکە هاتەوە بۆ لام و گوتی: لە خودا بترسە، کرێکەم بدەرێ، منیش گوتم: بڕۆ ئەو ڕانە وشتر و گاگەل و ڕانەمەڕ و شوانەکانیان ببە بۆ خۆت، هەمووی هیی

کرێکەتە. گوتی ئەی بەندەی خودا! لە خودا بترسە گاڵتەم پێ مەکە! منیش گوتم: بەڕاستمە و گاڵتەت پێ ناکەم، هەمووی هی خۆتە، ببە. هەمووی برد بۆ خۆی، پەروەردگارا، تۆ دەزانیت ئەگەر ئەم کارەم لەبەر خاتری تۆ کردووە ئەوا دەرگای ئەشکەوتەکەمان بە تەواوی بۆ بکەرەوە، تاوێرەکە خزا و پەروەردگار دەرگاکەی تەواو بۆ کردنەوە و هاتنە دەرەوە و ڕزگاریان بوو.

## وانەی یەکەم

چیرۆکێکی نەناسراو لە ڕووی کات و شوێن و کەسایەتییەکانەوە، هەڵبەت ڕەگەزەکانی کات و شوێن و کەس جگە لە وردەکاریی زیاتر شتێکی تر نین.

لە ڕاستیدا خودی ڕووداوەکە گرنگە، هەموو ئەمانە خاڵی هاوبەشە لە نێوان تەواوی چیرۆکەکانی قورئان و فەرموودەدا.

قورئان کاتێک باس لە کوڕەکانی ئادەم دەکات، ناویان ناهێنێت، ناوەکان و وردەکارییەکانمان لە نەتەوەکانی پێشووترەوە بیستووە، ناوەکان گرینگییەکیان نییە، هابیل و قابیل بێت یان ئەحمەد و خالید ناوەکان گۆڕانکارییەک بە جەوهەری ڕووداوەکان نادەن، ئەوەی گرینگە هەڵوێستی هەریەک لەم دوو کەسایەتییەیە: یەکەمیان، حەسوودێکی بە تەماع ڕەتکەرەوەی حوکمی خودا و بکوژی براکەی. دووەمیان ئیمانداری لەخوداترس کە هیچ کات ئامادە نەبوو دەستی ستەم بۆ براکەی درێژ بکات، گەرچی براکەی دستدرێژی بکاتە سەر قورئانی پیرۆز، کاتێک باس لە ئیمانداریی ئالی فیرعەون دەکات بە هیچ شێوەیەک ناوی نابات.

ناونەهێنانی قورئان بەو پێیەی پەندی چیرۆکەکان خودی هەڵوێست و دیوی ناوەوەی ڕووداو فەلسەفەی پشت ڕووداوەکانە،

قورئان کاتێک باسی شاهیدیی یوسف دەکات ناوی نابات، بە ناوی نەناسراوی (شاهد من أهلها) باسی دەکات.

ناو و ناسنامەی ئەم کەسەمان لە فەرمووده و ئەسەرەکاندا زانیوە، بەو پێیەی ناوەکان زیادەیەکی بچووکن ئەوەی گرنگە هەڵوێستی کەسەکەیە.

پاڵەوانەکەی سورەتی یاسین ئەوەی لەو پەڕی شارەوە هات بۆ سەرخستنی مسوڵمانان، ناوی بە نەناسراوی ماوەتەوە. (رجل) بە نەکیرەی هاتووە، چونکە هەڵوێستەکان گرینگترن لە خودی کەسەکان، قورئان کاتێک باس لە نەمرود دەکات، بە هیچ شێوەیەک ناوی نابات، ئەوەی گرینگە لە چیرۆکەکە ملهوڕیی و یاخیبوونە، نەک خودی کەسە یاخییەکە خۆی، لە باسی سەربڕاویی ئیبراهیم (ئیسماعیل)، (سەلامی خودای لێ بێت) ناوی ناهێنێت، ئەوەی گرینگە هەڵوێستی بوێرانەی گەنجێکە، تەنانەت ئەوانەی ناویان هاتووە، لە چیرۆکەکانی قورئان و فەرمووده بەهۆی هەڵوێستێکی تایبەتەوە بووە.

کاتێک قورئان چیرۆکی هەوڵی سووتاندنی ئیبراهیممان بۆ دەگێڕێتەوە، وێنای کۆمەڵگەی نەخۆش و چەسپاویی مسوڵمانمان بۆ دەکات. قورئان لە باسی ئەم ڕووداوەدا وێنای تایبەتی ئیبراهیم و مێژووی نەتەوەکانی پێشوومان بۆ ناگێڕێتەوە، گەرچی ئەمە لە سیاقی گێڕانەوەی چیرۆکەکە بە دەست دێت، قورئان کاتێک باس لە تۆفانی نووح دەکات، تیشک دەخاتە سەر ئەوەی مرۆڤەکان بەهۆی گومراییانەوە دەچنە خوار ڕیزی ئاژەڵانەوە، بە تەنها یەک بانگەواز ئاژەڵەکان چوونە نێو کەشتییەکەوە بە نۆسەدوپەنجا ساڵ بانگەواز کەمێکی کەم نەبێت، کەسی تر نەهاتە نێو کەشتییەکەوە.

قورئان دەیەوێت وێنای ئەوەمان بۆ بکات، بانگەوازکاران هیچ کات ماندوو نابن، دەزانن دەرئەنجامی کارەکان لەسەر ئەوان نییە،

ئەوەی گرینگە بە دامەزراوی لەسەر ڕێگاکان بمێننەوە، قورئان کاتێک چیرۆکی مووسا و فیرعەون دەخاتە ڕوو، ئەوەمان پێ دەڵێت: قەدەری خودا دێتە دی بە کوێرایی چاوی ملهوڕان، چەندە خۆیان ماندوو بکەن، ئیرادەی پەروەردگار لە سەروو هەموویانە.

فیرعەون لەپێناو لەناوبردنی موسادا، هەزاران منداڵی کوشت.

کەچی موسای لە کۆشکەکەی خۆیدا پەروەردە کرد.

قورئان دەیەوێت پێمان بڵێت:

ئەوە پەروەردگار نییە، بەڵکوو مرۆڤەکانن

کەرەستە و هۆکارەکان بە سەریاندا دەکەونە ژێر کاریگەرییانەوە.

گەر ئیرادەی پەروەردگار نەبێت،

گۆچانێکی مردوو توانای شەقبوونی دەریای لەکوێ بوو؟

قورئان لە تەواوی ڕووداو و هەڵوێست و چیرۆکەکاندا دەیەوێت پێمان بڵێت:

بیر لە کار بکەوە، نەک بکەر. لە ڕوودا وردبەوە، نەک ئەنجامدەرەکەی.

گەر لە ژیان ورد بیتەوە لە هەموو کات و سەردەمێکدا کێشمەکێشی نێوان هەق و ناهەق، بەردەوامی هەبووە

ئەوەی دەگۆڕێت تەنها جەنگاوەرەکانن.

هەموو سەردەمێک جەنگاوەری هەق و ناهەقی خۆی هەیە.

هەموو ملهوڕێک لە سەردەمی خۆیدا فیرعەون و نەمرودە.

بانگەوازکارانی دژە ملهوڕان: ئیبراهیم و مووسان.

سوپای ملهوڕان لە هەموو سەردەمێکدا سوپای ئەبرەهە و سوپای قورەیشە لە ڕۆژی بەدردا.

هەموو کۆمەڵێکی موجاهید سوپای یوشعی کوڕی نوون و هاوەڵانی پەیامبەرن.

## وانەی دووەم

کاتێک پەروەردگاریان وەبیر هێنایتەوە، ڕابچڵەکە، لووتت بەرز نەبێت، هەندێک جار تاوانی لووتبەرزی بەرانبەر گوناه هێندەی خودی گوناهەکە قورسە، هەریەک لە ئادەم و ئیبلیس بێفەرمانی پەروەردگاریان کرد، ئیبلیس بە ڕەتکردنەوەی کڕنووش، بێفەرمانیی پەروەردگاری کرد، ئادەم بە خواردنی دارەکە بێفەرمانیی پەروەردگاری کرد. یەک بە یەک هەردووکیان تاوانیان ئەنجام دا، بەڵام عاقیبەتیان وەک یەک نەبوو، ئیبلیس کاتێک سەرزەنشت کرا، لووتبەرزی گرتی. ئادەم کاتێک سەرکۆنە کرا، داوای لێخۆشبوونی لە پەروەردگاری کرد، لووتبەرز و تۆبەکارێک زۆر جیاوازن، دەخیلت بم، کاتێک پەروەردگاریان وەبیر هێنایتەوە لووتبەرزی نەتگرێت. گوناهی مرۆڤی بێئاگا، تاوانی کەمترە لە مرۆڤی لووتبەرز کاتێک قسەیەکت کرد، دڵی کەسێکت شکاندت، کەسێک هەڵەی وەبیر هێنایەتەوە، بە گژیدا مەچۆ، دوو هەڵە و تاوان پێکەوە کۆ مەکەرەوە، تاوانی قسەی زبر و تاوانی لووتبەرزی، کاتێک پێوەندیی دۆستانەت لەگەڵ ئەوانی تر دەپچڕێنێت. گەورەیی سیلەی ڕەحمی وەبیر هێنایتەوە، لووتبەرزی مەنوێنە، تاوانی بڕینی سیلەی ڕەحم و لووتبەرزی پێکەوە کۆمەکەرەوە. کاتێک تاوان دەکەیت و سنوورەکانی پەروەردگار تێدەپەڕێنیت، دڵسۆزێک وەبیری هێنایتەوە لووتبەرز نەبێت، پەروەردگار وەسفی وەلیدی کوڕی موغەیرە دەکات بەوەی لووتبەرز و یاخییە. ئەو دڵشکاندنەی دوای تاوان دووچارت دێت، لەوانەیە لای پەروەردگار باشتر بێت، لەو پەرستشەی دووچاری لووتبەرزیت دەکات، هەڵبەت ئەمە دوای ئەنجامدانی تاوانەکە، بەڵام پێش ئەنجامدانی تاوانەکە شتێکی ترە، تاوانەکان پێش ئەو تاوانێکی تر. قێزەونترین تاوان ئەو تاوانەیە کە تەنانەت دوای ئاگادارکردنەوەی

و وەبیرهێنانەوە ئەنجامی دەدەیت.

بزانە گەورە لای زاتی حەق بچووکە.

ئەوە عومەری کوڕی خەتتابە پێشەوای مسوڵمانان فەرمانڕەوایی لایەکی جیهانی دەکرد لەسەر مینبەرەوە کاتێک دەبینێت خەڵکی مارەیی قورس دەکەن دەچێتە سەر مینبەر و دەیەوێت مارەیی دەستنیشان بکات، شیفای کچی عەبدوڵڵا هەڵدەسێتەوە پێی دەڵێت، ئەی عومەری تۆ مافی ئەوەت نییە ئەو بڕیارە بدەیت پەروەردگار دیاریی کردووە بە چ مافێک دەتەوێت سنوورداری بکەیت؟

عومەر پەشیمان دەبێتەوە دەڵێت، عومەر هەڵەی کردووە و ئافرەتێک پێکای، «دەسەڵاتەکەی نەبووە مایەی یاخیبوونی. پاڵەوانی ئەم چیرۆکە تا لووتکە کار دەکات و پارە پەیدا دەکات بۆ ئەوەی بکات بە ئامۆزا ئافرەتەکەی کاتێک لێی نزیک دەبێتەوە پەروەردگاری وەبیر دەهێنێتەوە».

پێی دەڵێت لە خودا بترسە ئەڵقەکە مەکەرەوە، بە مافی خۆی نەبێت دەستی لێ هەڵگرت لەگەڵ ئەوەی جوانترین و خۆشەویستترین ئافرەتی دونیا بوو لای.

## وانەی سێیەم

دەخیلت بم، ئاگاداری مافەکانی خەڵکی بە، پەروەردگار هیچ کات لە تاوانی مافی نێوان بەندەکان خۆش نابێت. شەهیدی ڕێی خودا لەگەڵ ڕژانی یەکەمین قەترەی خوێنی لە تەواوی تاوانەکانی خۆش دەبێت، جگە لە قەرز. قەرز مافی پەروەردگار نییە، مافی خەڵکییە هەر گۆشت و جەستەیەک بە حەرام گەشە بکات، شایستەترە بە ئاگر وەک ئەوەی لە فەرموودەدا هاتووە، «من وەک ئێوە مرۆڤم، کاتێک کێشەکانتان بۆ لای من دەهێنن، لەوانەیە کەسێک لە ئێوە قسەزانتر

بێت لە براکەی، بە هۆیەوە بەو شێوەیەی کە دەیبیستم بڕیار دەدەم. هەرچییەک لە مافی براکەی بۆ ئەو ببڕم، با وەرینەگرێت، چونکە پارچەیەک لە ئاگری بۆ دەپچڕم: داوەری پەیامبەر بۆ پچڕاندی ماف، حەڵاڵی ناکات. ئەوەی مافی تۆ نییە گەر هەموو دادگاکانی دونیا بۆت بچڕن، پێت حەلاڵ نابێت، دڵنیابە دادگایەک هەیە لە قیامەت مافەکەت لێ وەردەگرێتەوە، ئەو ڕۆژەی نە پارە هەیە و نە دینار، ژماردن تەنها بە کار و کردەوەی چاکە.

لە کاتێکدا لە هەموو شت زیاتر پێویستمان بە کرداری چاکە، دەخیلت بم هیچ کات بە یاسا هەوڵی خۆزاڵکردن نەدەیت بەسەر خەڵکانی بێپشتوپەنادا، هیچ کات باوەڕ بەو وتەیە نەکەیت کە دەڵێت: یاسا خەڵکانی لاواز و ئاسایی و کەمژە ناپارێزێت، ئەوە خەڵکی سادەن، واتای ڕەوایەتی دزیکردن لێیان نییە، دزی قەدەغە کراوە بێ ڕەچاوکردنی ناسنامەی ئەنجامدەرەکەی.

بێ ڕەچاوکردنی لێهاتوویی بکەرەکەی. لەم سەردەمەدا بابەتە ڕووکەشەکان بوونەتە مایەی سەرگەردانی خەڵک، دەوڵەمەندێک هەزاران دینار لە خواردنگەیەک وەک بەخشیش دەبەخشێتەوە، کەچی کرێی کرێکارەکەی دەدزێت و پێی نادات، کە ناکەتە نرخی فنجانێک قاوەی خواردنگەیەکی گرانبەها، بەخشندەیی ڕاستەقینە پێدانی مافی ئەو کەسانەیە، کە مافیان لە سەرتە، کارەساتە ئۆتۆمبێلێکی گرانبەها بە دیاری ببەخشیتە بەرپرسێک، ستەم و دزی لە خزمەتکارەکەت بکەیت، شیکیی ڕاستەقینە پێدانی مافی ئەوانی ترە، نەوەک شیکی بۆینباخ و بۆنە گرانبەهاکان بەداخەوە لەم سەردەمەدا خەڵکی جگە لە شیکیی جلوبەرگ، شیکییەکی تر نازانن گەر لە ڕۆح و دەروونیان بڕوانی وێرانەیەکە و هیچی تر.

لەم چیرۆکەی سەرەوە کرێکارەکە ئامادە نەبوو کرێکەی

وەربگرێت و ڕۆیشت کابرای خاوەنکار کرێکەی گلدایەوە، بۆی خستە کارەوە، دواتر گەشەی کرد. کاتێک گەڕایەوە سامانێکی گەورەی بۆ گێڕایەوە، کرێکاران نانی ماندوویی جەستەیان دەخۆن، پارێزگاریی مافەکانیان لووتکەی ئەخلاقە گرینگ ئەوەیە مافەکانیان پێ بدرێ، بە دزینی ئەم برە کەمە دەوڵەمەند نابیت، بە گێڕانەوەی هەژار نابیت، مەبە بە بەندەی پارە و دارایی، کارێک مەکە، مافاکانت بە توپزی لێ وەربگرن، مرۆڤە ڕەسەنەکان ئەوەی لەسەریانە دەیکەن بۆ ئەوەی ڕەخنەی خەڵکیان نەیەتە سەر.

## وانەی چوارەم

نزا چەکی مسوڵمانە بە کەم لێی مەڕوانە!

خۆشەویست جوانی فەرمووە: هیچ شتێک قەدەر ڕەت ناکاتەوە جگە لە نزا.

نزا مشتی پڕ گڕی مسوڵمانە.

لە کەیەوە ڕۆزی و شیفا و منداڵ و سەرکەوتن و بە دەستی مرۆڤەکان بووە؟

هەموو ئەمانە بە دەستی پەروەردگارن

مرۆڤەکان جگە لە هۆکار و کەرەستە شتێکی تر نین

بۆچی دەبێت باوەش بکەین بە هۆکارەکاندا؟

لە خولقێنەری هۆکارەکان دوور بکەوینەوە؟

پشتبەستن بە هۆکارەکان پێویستییەکی شەرعییە

دەخیلت بم، یەقینی دڵت لەسەر هۆکارەکان نەبێت.

دەرمانەکان هۆکاری شیفان

شیفادەر تەنها پەروەردگارە

کارکردن هۆکاری ڕۆزییە

ڕۆزیدەر تەنها پەروەردگارە
هاوسەرگیری هۆکاری منداڵبوونە
ئەوەی منداڵ دەدات تەنها پەروەردگارە
بە چاوی خۆت دەبینیت
چەندە لە مرۆڤەکان چارەسەریان بەکار هێنا و باش نەبوو
باشترین پزیشکەکان گەڕان شیفایان بۆ نەهات
چەندین لە مرۆڤەکان هاوسەرگیرییان کرد و منداڵیان نەبوو
پەروەردگار پێی خۆشە داوای لێ بکرێت
مرۆڤ پێی خۆشە پێی بدرێت
ئەوەی پێی خۆشە ئەنجامی بدە
تا ئەوەی پێتخۆشە پێتببەخشێت
پەروەردگار لەو دڵەت دەڕوانێت کە بینی تەنها هۆکارەکانی تێدایە
لێت دەگەڕێت تەنها بۆ هۆکارەکان
گەر بینی لە دڵتدا جگە لە پەروەردگار زیاتر گەورەیەکی تێدا نییە
هۆکارەکانت بۆ دەڕەخسێنێت و خەڵکیت بۆ دەستەمۆ دەکات
ئادەم و هاوسەرەکەی تاوانیان کرد و داوای لێبووردنیان لە پەروەردگار کرد.

﴿ رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾ (الأعراف) «ئەی پەروەرندەمان ناهەقیمان لە خۆمان کرد، ئەگەر تۆ لێمان نەبووری و بەزەییت پێماندا نەیەتەوە، بێشک لە زیانبارانین».

نووح کاتێک گیرۆدەی دەستی گەلەکەی هات فەرمووی: ﴿ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ ﴾ (نوح) «لەم سەر هەردە ئەو کەسانەی تۆ ناناسن، جوقەواریان لێ مەهێڵە.»

پەروەردگار تۆفانی غەزەبی ناردە سەریان.

ئیبراهیم بە ئەسپایی بە دەم ئاوازی پڕ لە حوزنی ﴿... فَأَجْمَلَ

أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ إِنَّ .. ﴿٣٧﴾ ﴾ (إبراهيم) «دەسا تۆیش کاری وا بکە خەڵک بە دڵ خۆشی بوێن»، هاوسەر و منداڵەکی بە پەروەردگار ڕاسپارد.

لووت بەهۆی نەتەوەکەیەوە دونیای لێ هاتەوە یەک، لە حزوری پەروەردگاردا نزای کرد (رب انصرني على القوم الفاسقين).

جوبرەئیل بە باڵەکانی گوندەکەی بەرز کردەوە تا فریشتەکان لە ئاسمان گوێیان لە حەپەی سەگی نێو گوندەکە بوو، پاشان بەتوندی کێشایەوە بە زەویدا.

یوسف کاتێک تەواوی دەرگاکانی زەویی بە سەردا داخرا، چریکەی نزای: ﴿ وَإِلَّا تَصۡرِفۡ عَنِّي كَيۡدَهُنَّ أَصۡبُ إِلَيۡهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾ (یوسف) «تۆ ئەگەر گەڕی ئەوانم لێ لانەدەی، دڵم دەچێ بۆ لایان و یەکێک دەبم لە نەزانان».

پچڕی و پەروەردگار کردیە عەزیزی میسر.

مووسای کەلیموڵڵا کاتێک بەرپرسیارێتیی بانگەوازی فیرعەونی خرایە ئەستۆ بە نزای: ﴿ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ﴿٢٦﴾ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ﴿٢٨﴾ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ ﴾ (طه) «ئەی پەروەرندەی من پشوودرێژترم بکە. کاریشم لێ سانا بکە. گیرییەکم لە زماندایە. بۆم ڕەهاکە، تا لە ئاخافتنم بگەن. لە خزمانم ئاریکارێکم بۆ دانێ. مەبەست هارونی برامە.»

داوای مەدەدی پەروەردگاری کرد.

پەروەردگار ڕاستەوخۆ بە ﴿ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ ﴾ (طه) «موسا هەرچی تۆ ویستت پێت درا»، بە دەمیەوە هات.

سولەیمان پەیامبەرە دادپەروەرەکە نزای کرد: ﴿ وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓۖ ﴿٣٥﴾ ﴾ (ص) «سامانێکی وام بدەیە کە لە دوای من دەست هیچ کەسی تر نەکەوێ.»

پەروەردگار گەردنی پەرییەکانی خستە دەست.

یونسی دڵشکاو لە هۆزەکەی

لە تاریکیی شەوی دەیجوری نێو سکی نەهەنگدا ئاوازی: ﴿ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ (الانبیاء) «لەغەیرەز تۆ هیچ خودایەک شک نابەم، پاک و بێعەیبی بۆ تۆیە، من لە ڕیزەی ناهەقان بووم»ـی دەپچڕی.

پەروەردگار سکی نەهەنگی بۆ کردە نشینەگەیەکی ئارام.

زەکەریا پەیامبەری خۆشەویستی خودا تامەزرۆی هەستی باوکایەتی لە پەروەردگاری دەپاڕێتەوە: ﴿ رَبِّ هَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةًۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٨﴾ ﴾ (آل عمران) «ئەی خودانم زارۆیەکی چاک و پاکم پێ ببەخشە، دەزانم تۆ پاڕانەوەی من دەبیستی».

لە ساتی پەرستش لەنێو میحرابدا فریشتەکان بانگیان لێ کرد و مژدەی لەدایکبوونی یەحیایان پێ دا.

دونیا جەنگێکی پڕ لە گڕ و کڵپەیە نزاکردن چەکی دەستی مسوڵمانە

جەنگاوەری زیرەک بەبێ چەک نایەتە نێو مەیدانی جەنگەوە.

## وانەی پێنجەم

چەندە میهرەبانە پەروەردگار بەندەیەک کاتێک ویستی تاوانێک ئەنجام بدات، گەر نەیکرد پەروەردگار بە میهری خۆی چاکەیەکی بۆ دەنووسێت، گەر ویستی خراپەیەک بکات و نەیکرد پەروەردگار چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنووسێت.

هاوەڵی ئێمە ویستی زینا بکات، تەواو هەوڵی بۆ دەدات، پەروەردگار بە هۆیەوە بەردێکی گەورەی لەسەر ئەشکەوتەکە لابرد.

گەر ویستت خراپەیەک بکەیت، پەروەردگاریان وەبیر هێنایتەوە

بزانە پەروەردگار خۆشی دەوێیت، بۆیە وەبیری هێنایتەوە.

دڵمردوان لە توورەیی پەروەردگار ئالوودەی تاوانەکانیان و نغرۆی ئارەزووەکانیان بوون، خۆشەویستی پەروەردگار بۆت بە توورەبوون وەلام مەدەرەوە. هەر هەنگاوێک بەرەو حەرام دەینێت، پاشان دڵت رادەچڵکێت، هەموو هەنگاوەکانت بۆ دەبێت بە چاکە، هەر درهەمێک ویستت بە حەرام بیخۆیت، پاشان دڵت رادەچڵکێت، هەموو پارەکانت بۆ دەبێتە چاکە.

هەر وشەیەک لە خراپە دەرتبڕیوە، پاشان دڵت راچڵەکی، بە وشەیەکی بەرگری لە حەق بۆت دەنووسرێت، کاتێک بڕیار دەدەیت، لێی پەشیمان بیتەوە.

## وانەی شەشەم

هەوڵ بدە هاوڕێی باشت هەبێت، پەروەردگار ناوی سەگێکی بە زیندووی هێشتەوە لەبەر ئەوەی هاوڕێی پیاوچاکانی هەڵبژارد، سەگێک وریاترە لە ئێمە لە هاوەڵایەتیکردنی پیاوچاکان، بڕوانە سێ کەسەکەی نێو ئەشکەوت، گەر یەکیان کارێکی چاکەی نهێنیی نەکردایە، لە ئەشکەوتەکەدا دەمایەوە، لەناو دەچوون. کاتێک چاکەی هەرسێکیان پێکەوە کۆ بوونەوە، پەروەردگار رزگاری کردن وەک نموونەی باووباپیرانمان دەڵێت: (الصاحب ساحب) «هاوەڵ ڕاکێشەرە»، واتە ڕاکێشەرە بەرەو خووەکانی خۆی، گەر باش بوو، بەرەو باش کەمنکێشت دەکات، گەر خراپیش بوو هەر وا.

چەندە جیاوازە ئەو هاوڕێیەی دەستت دەگرێت بەرەو دۆزەخ، لەگەڵ ئەو هاوڕێیەی دەستت دەگرێت بەرەو بە هەشت.

## قەزاوەتی سولەیمان (سەلامی خودای لێ بێت)

جارێکیان دوو ژن هەر یەکەیان کورێکی کۆرپەلەی خۆی پێ بوو، گورگێک هات و کوڕی ژنێکیانی برد، ژنەکەیش بە هاوڕێکەی گوت: گورگەکە کوڕەکەی تۆی بردووە، ئەویش گوتی: نەخێر کوڕەکەی تۆی بردووە، دەبێتە کێشەیان، بە مەبەستی داوەریکردن دەچنە لای پەیامبەر داود (سەلامی خودای لێ بێت)، داود بڕیار دەدات ئەو کوڕەی ماوە بۆ ژنە گەورەکە بێت، کاتێک دوو ژنەکە لای داود هاتنە دەرەوە، گەیشتن بە سولەیمانی کوڕی داود و باسەکەیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ئادەی چەقۆیەکم بۆ بهێنن دەیکەم بە دوو لەتەوە بۆتان.

ژنە بچکۆلەکە گوتی: ڕەحمەتی خودای گەورەت لێ بێت، ئەو کارە مەکە، کوڕی ئەوە. سولەیمان کە ڕوانی ژنە بچکۆلەکە زۆر سکی بە منداڵەکە دەسووتێ، زانیی کە منداڵی ئەوە، سولەیمان منداڵەکەی دایەوە ژنە بچکۆلەکە.

### وانەی یەکەم

پەروەردگار فەزڵی هەندێک لە پەیامبەرانی داوە بەسەر هەندێکی تریاندا. پەیامبەرانی (أول العزم) لە تەواوی پەیامبەرانی تر بالاترن،

بـە شـێوەیەکی تایبـەت هـەر پەیامبەرێـک تایبەتمەندیـی خـۆی هەیـە، تایبەتمەندیـی هەریەکیـان واتـای فەزڵـی ئەویـان بەسـەر ئەویتریانـدا نییـە، بە دانپێدانانی مووسـا، هـاروون لـە مووسـای بـرای ڕەوانبێژ تـر بـوو، لـە ڕاستیدا پێگـەی مووسـا لـە هـاروون باڵاتـرە.

سـولەیمان (سـەلامی خـودای لـێ بێـت)، دەسـەڵاتێکی پـێ دا، کـە پێشـتر و دواتـر بـە هیـچ کەسـی تـر نەدرابـوو.

عیسـا هـەژار بـوو. بـەڵام باڵاتـر بـوو لـە سـولەیمان و هـاروون، پەروەردگار ئاسـنی بـۆ داود نـەرم کـرد، بـۆ باشـترین دروسـتکراوی خـۆی موحەمـەدی نـەرم نەکـرد، ئەمـە بابەتـە بـۆ پەیامبـەران و خەڵکانـی تریـش ڕاسـتە. خالیـدی کـوڕی وەلیـد شـارەزاییەکی هەبـوو کـە ئەبوبەکـر نەیبـوو، هیـچ یەکێـک لـە هـاوەڵان هێنـدەی ئەبوبەکـر پێگەیـان نەبـوو، ئوبـەی کـوڕی کەعـب لـە عومـەر شـارەزاتر بـوو لـە قورئانـدا، هیـچ گومـان لـەوە نییـە عومـەر لـە ئوبـەی باشـترە. موعـازی کـوڕی جەبـەل لـە عوسـمان شـارەزاتر بـوو لـە بابەتەکانـی حـەڵاڵ و حەرامـدا، وەک ئاشـکرایە عوسـمان لـە موعـاز چاکتـر بـوو.

کاتێـک ئـەم چیرۆکـە دەخوێنیتـەوە، پێویسـتە ئەوەمـان لـە پێـش چـاو بێـت، پێـوەری باشـی بـە چوارچێـوە گشـتییەکە هەڵسـەنگاندنی بـۆ دەکرێـت، نـەوەک بـە تەنهـا یـەک لایەنـی دیاریکـراو، داود لـە داوەرییەکەیـدا هەڵـەی نەکـرد، ئیجتیهـادی کـرد.

بـە بەڵگەکانـی بەردەسـتی بڕیـاری دا، هەندێـک جـار گـەورەکان ڕەوانبێژتـرن لـە بچووکـەکان.

## وانەی دووەم

سـولەیمان بلیمەتتریـن بـوو لـە داوەریکـردن، ئـەم چیرۆکـەی بەردەسـتمان مشـتێکە لـە خەروارێـک. چەندیـن چیرۆکـی تـر لـەم

بارەیەوە هەن، قورئان تیشک دەخاتە سەر بلیمەتی داود. لە داوەری و چارەسەرکردنی کێشەکانی خەڵکی وەک قورئان وێنایان دەکات: ﴿ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ إِذۡ يَحۡكُمَانِ فِي ٱلۡحَرۡثِ إِذۡ نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ ٱلۡقَوۡمِ وَكُنَّا لِحُكۡمِهِمۡ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾ ﴾(الانبیاء) «لە دواد و سولەیمانیش باسێک بکە، کە بەسەر کێشەی کێڵگەیەک ڕاگەیشتن، ئەوسا کە ئاژەڵی گەلێک - کاتی شەوێ- پێی وەر ببوون، ئێمە ئاگان لە پێڕاگەینەکەیان بوو».

چیرۆکەکە ئەمەیە مەڕومالاتی پیاوێک چوونە نێو شینایی پیاوێکی ترەوە، زۆریان لە شینابییەکەیان خوارد و ئەوی تریان داتەپاند، هەردوو پیاوەکە سکاڵای خۆیان بردە لای داود، دادوەری کرد بەوەی خاوەنی مەڕەکان مەڕەکان بدات بە خاوەنی شینابییەکە بەهۆی ئەوەی تێکی داوە.

دوای دەرچوونیان لای داود، گەیشتن بە سولەیمان، گوێی لە گوتەی هەردووکیان بوو، گوتی حوکمەکە بەو شێوەیە نییە، بەڵکوو بەوەیە خاوەنی زەوییەکە مەڕەکانی شوانەکە وەربگرێت، بۆ ئەوەی سوودی لێی ببینێت، خاوەنی مەڕەکە زەوییەکە بگرێتە ئەستۆ و ئەوەی تێکی داوە چاکی بکاتەوە، کاتێک شینایی زەوییەکەی وەک خۆی لێکردەوە زەوییەکە دەگێڕێتەوە و مەڕەکان وەردەگرێتەوە.

پەروەردگار ستایشی ئەم داوەرییەی سولەیمانی کرد، فەرمووی: ﴿ فَفَهَّمۡنَٰهَا سُلَيۡمَٰنَۚ ﴿٧٩﴾ ﴾ (الانبیاء) «سولەیمانمان تێگەیاند کە دەبێ چبکات».

بەڵام فەزڵی داودی نادیدە نەگرت فەرمووی: ﴿ وَكُلًّا ءَاتَيۡنَا حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ ﴿٧٩﴾ ﴾ (الانبیاء) «بە هەردووکان کارزانی و زانستمان دا».

لە شارەزایی و بلیمەتی سولەیمان لە داوەریکردندا پیاوێک هاتە لای و گوتی: ئەی پەیامبەری خودا دراوسێیەکم هەیە قازەکانم دەدزێت.

سولەیمان فەرمانی دا بانگ بدرێ و خەڵکی کۆبوونەوە، پاشان چووە سەر مینبەر و ڕووی کردە خەڵکی بۆچی خەڵکانێک لە ئێوە قازی دراوسێکەی دەدزێت و دواتر دێتە مزگەوت و پەڕی قازەکە هێشتا بە سەریەوە ماوەتەوە.

کابرای دزە دەستێکی هێنا بە سەریدا.

سولەیمان فەرمووی: بیگرن ئەوە دزەکەیە.

دادوەر دەبێت بە وردی شارەزای ئەو بابەتە بێت کە داوەریی دەکات، هەندێک بابەتی تر زیاتر پێویستی بە وردیی هەڵسەنگاندن هەیە، شەرع زۆرێک لەم بابەتانەی یەکلایی کردووەتەوە وەک بابەتەکانی میراتی، قازی پێویستی بە حیکمەت و دانایی هەیە. لە بارەی سولەیمانەوە، سێ چیرۆکمان خستە ڕوو، هەڵبەت هەموو ئەم چیرۆکانە هیچ دەقێک نەبوو لە بارەیانەوە تەنها بە عەقڵ و هۆش بوو. چەندین نموونەی زیرەکی و توانابیمان هەیە، موعاویە و شورەیحی قازی شۆڕەسواری ئەم مەیدانەن، مێژوو چەندین هەڵوێستی دانایی ئەو دوانەی تۆمار کردووە. ئیاسی کوڕی موعاویە بووە قازی، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (ڕەزای خودای لێ بێت)، پیاوێک لای هاوەڵێکی هەندێک ماڵی لەناو دارێکدا شاردەوە.

دواتر هاوڕێکەی گەڕایەوە و پارەکانی برد. خاوەن پارەکە هاتە لای ئیاس و گلەیی خۆی کرد، هاوەڵەکەی نکۆڵی لێ کرد کە ئاگای لە بابەتێکی لەو شێوەیە بێت، ئیاس بە کابرای گوت: بچۆ بۆ لای دارەکە بۆ ئەوەی بیرت بکەوێتەوە.

تۆیش لای من دابنیشە تا هاوڕێکەت دەگەڕێتەوە ئیاسی سەرقاڵی داوەریکردنی خەڵکی بوو.

بە دەم کارەکەیەوە ڕووی کردە کابرا و پێی گوت: پێتوایە هاوڕێکەوت گەیشتوەتە شوێنی دارەکە؟

گوتی: نا هێشتا نەگەیشتووە شوێنەکەی دوورە.

ئیاس تووڕە بوو، گوتی: ئەی دوژمنی خودا، تۆ گوتت من شوێنی دارەکە نازانم، کابرا هیچی پێ نەما و کەوتە داوەکەوە.

یەکێکی تر لە زیرەکییەکانی جارێک سێ ئافرەت هاتنە لای لەو کاتەدا مەترسییەک لەو شوێنەدا ڕووی دا.

دواتر گوتی: ئەویان دووگیانە، ئەوەی تریان شیردەرە و ئەوی تریان کچە، دواتر پرسیاریان لێ کرد، چۆن زانیت بابەتەکە بەو شێوەیەیە؟

ڕاستت کرد، گوتی: کە مەترسییەکە ڕووی دا یەکیان دەستیگرت بە سکیەوە.

دووەمیان دەستی گرت بە سنگیەوە.

سێیەمیان دەستی گرت بە دامێنیەوە.

مرۆڤ کاتێک مەترسی لەسەر دروست دەبێت دەیەوێت پارێزگاری بکات لە خۆشەویستترین شت لای.

جارێکی تر پیاوێک هاتە لای ویستی لە بارەی شەرابەوە پرسیار بکات، گوتی: ئەگەر تری بخۆم، شولاقم لێدەدەیت؟

گوتی: نەخێر.

گەر ئاو بخۆم شولاقم لێ دەدەیت؟

گوتی: نەخێر.

کێشە چییە گەر تریکە، بکەمە ناو ئاوەوە، ببێتە شەراب، شولاقم لێ دەدەیت؟

ئیاس پێی گوت: گەر لمت تێبگرم ئازارت دەبێت؟

گوتی نەخێر.

گەر ئاوت تێبگرم ئازار دەچێژیت؟

نەخێر.

گەر ئەم دۆڵچەیە کە قوڕ و ئاوی تێدایە، پێتدا بکێشم ئازاری دەبێت؟

بەڵێ ئازارم پێ دەگات، ئەمە وەک ئەوە نییە.

ئەوەی تۆیش بەو شێوەیە نییە.

جارێکی تر گوتیان سێ ڕەخنەمان لە تۆ هەیە، تۆ ناجوانیت، بە قسەی خۆت زۆر سەرسام دەبیت، زوو بڕیار دەدەیت.

گوتی: ئەوەی ڕووم ناشرینە بە دەستی خۆم نییە.

ئەوەی گوایە بە قسەی خۆم سەرسامم، ئێوەیش پێی سەرسام نین؟

- بە قسەکانت تەواو سەرسامین.

- کە وایە سەرسامیی خۆم بۆ قسەکانم لە پێشترە.

هەریەک لە ئێوە چەند پەنجەی هەیە؟

گوتیان: پێنج.

- بۆچی بەو شێوەیە خێرا وەڵام دەدەنەوە.

- ئەو شتەی بە یەقین دەیزانین، خۆمان دوا ناخەین لە وەڵامدانەوەی.

- منیش هەر وەک ئێوەم.

زۆربەی کاتەکان بڕیاری دروست و لەسەر حەق بووە، هەموو جار دەیگوت: هیچ کەس لە داوەریکردندا پشتی نەشکاندم، جگە لە پیاوێک جارێک لە بەسرە لە کۆڕی داوەریکردن دانیشتبووم، کابرایەک هاتە ژوورە و گەواهی دا کە فلانە باخ بەم شێوە و فراوانییە موڵکی فلانە کەسە.

پێمگوت: ژمارەی دارەکان چەندە؟

دوای کەمێک پرسیاری کرد گوتی: جەنابی قازی ماوەی چەندە سەرقاڵی کاری قەزاوەتی؟

- ماوەیەکی زۆرە.

- ژمارەی دارەکانی ئەم سەقفە چەندە؟ منیش نەمزانی قسەم پێ نەما و شایەتییەکەیم قەبووڵ کرد.

شورەیحی قازی یەکێک بوو لە بلیمەتە سەرسوڕهێنەرەکانی سەردەمی خۆی، لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتابدا ژیاوە. شەعبی دەگێڕێتەوە جارێک ئافرەتێک بە چاوی پڕ گریانەوە هاتە لای عومەر و شکایەتی لە هاوسەرەکەی کرد.

گوتم: ئەی ئەبوئومەییە، ئەم ئافرەتە ستەمی لێ کراوە بۆیە دەگری.

- گوتی ئەی شەعبی، براکانی یوسفیش بە دەم گریانەوە گەڕانەوە لای باوکیان.

جارێکیان عەدی کوڕی ئەرتات، هاتە لای لە کۆڕی داوەریکردندا بە شورەیحی گوت: تۆ لە کوێیت؟

- لە نێوانی تۆ و ئەو بەردەدام.

- گوێم لێ بگرە.

- لەبەر ئەوە لە کۆڕەکەی من دانیشتوویت.

- من پیاوێکم خەڵکی شامم.

- خۆشەویست هەمیشە نزیکە.

- ئافرەتێکم لە هۆزەکەی خۆم خواستووە.

- ماڵ و نەوەت بەرەکەتدار بێت.

- مەرجم کردووە لەگەڵیان کە نەیبەمە دەرەوە.

- دەبێت پابەند بیت بە مەرجەکەتەوە.

- ئێستا دەمەوێت دەربچم.

- لە ئەمانەتی خودادا بیت.

داوەریمان بکە:

- داوەریم کرد لە نێوانتان

جارێکیان عومەری کوڕی خەتتاب ئەسپێکی لە کابرایەکی دەشتەکی کڕی و پارەکەی پێی دا، عومەر سواری بوو تا ئەوەی تاقی بکاتەوە، بینی عەیبی تێدایە، بە کابرای دەشتەکی گوت، ئەسپەکەت بگرە عەیبدارە.

پیاوەکە گوتی: وەریناگرمەوە، بەبێ عەیب داومەتە دەستی تۆ، عومەر گوتی، کەسێک دیاری بکە لەنێوان من و تۆدا داوەری بکات.

کابرا گوتی: با شورەیحی کوڕی حارسی کیندی داوەری نێوانمان بێت.

عومەری گوتی: ڕازیم.

چوونە لای شورەیح، دوای ئەوەی شورەیح گوێی بۆ هەردووکیان گرت، کاتی دەرکردنی بڕیار هات، پرسیاری کرد: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەسپەکەت بە ساغی لێ وەرگرتووە؟

عومەر: بەڵێ.

شوریح: چۆن کڕیوتە، ئا وا لای خۆت گلی بدەرەوە، یان بەو شێوەی وەرتگرتووە بیگێڕەوە.

عومەر بەسەرسامییەوە لە شورەیحی ڕوانی و گوتی: ئەمە داوەریکردنە، بڕیاری بەپێز و یەکلاییکەرەوە!

بڕۆ بۆ کوففە، کردمیت بە قازی ئەوێ.

## وانەی سێیەم

بەهۆی جیاوازیی ژیری و ئاوەزی مرۆڤەکانەوە، بڕیار و حوکمەکانیش جیاواز دەبن، هەر بەم هۆیەوە ڕێبازە فیقهییەکان سەریان هەڵداوە، هەر یەکێک لە شەرعناسەکان بۆ ڕوونکردنەوەی حوکمە شەرعییەکان ئاوەزی خۆی بەکار دەهێنێت.

هەمووان هەڵە دەکەن و دەیپێکن، جگە لە پەیامبەران، تەنانەت پەیامبەران لە کاتی بڕیاردانیان بە ئیجتیهاد و ئاوەزی خۆیان دەشێت بکەونە هەڵەوە، کاتێک بە وەحی ئاسمانی حوکم دەکەن، بێگومان دەیپێکن، ئەم بابەتە دووروودرێژە و پێشتر قسەی زیاترمان لە بارەوە کرد. ئەم دوو پەیامبەرە هەردووکیان لەم بابەتە ژێری و ئاوەزی خۆیان بەکار هێنا. داود لە بەرژەوەندیی کوڕە گەورەکە حوکمی دەرکرد، بە پێچەوانەوە سولەیمان بڕیاری لە بەرژەوەندییان دا، ئەمە ئیجتیهادی پەیامبەرانە!

ئاگادار بن، دەمارگیریتان نەبێت بۆ گوتە و مەزهەبی هاوەڵان، جیاوازیی زانایان ڕەحمەت و بەرەکەتە.

گەر پەروەردگارت بیەوێت خەڵکی ناچاری تەنها یەک کار بکات، ئەوا تەواوی بابەتەکانی بە یەک حوکم یەکلایی دەکردەوە، بابەتی دوو ئافرەت بەشی پیاوێکیان هەیە لە میراتیدا، هیچ دەرفەتێکی بۆ ئیجتیهاد نەهێشتووەتەوە.

دز دەستی دەبڕدرێت، ئیجتیهادە لە چۆنێتی و چۆنایەتی، نەک لە بنەڕەتی حوکمەکە، پەروەردگار بەبێ لەبیرچوون لە هەندێک شت بێدەنگ بووە، وەک ڕەحمەتێک بۆ پەیامبەران، پێویستمان بە دڵفراوانیی زیاترە لە مامەڵەکردن لەگەڵ ڕێبازە فیقهییەکاندا، گەر لە ئەدەبی زانایان بڕوانین بەرانبەر یەکتری، ئیتر لە بنەڕەتی جیاوازەییەکە تێدەگەین.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل قوتابی شافیعی، ڕێزێکی بێپایان لە مامۆستاکەی دەگرێت، بەڵام لە چەندین بابەت بۆچوونەکانی پێچەوانەی شافیعییە، شافیعی چەندین بۆچوونی پێچەوانەی ئەحمەدی هەیە، بەڵام ڕێز و دۆستایەتی لەنێوانیان هەر بەردەوامە، دەمارگیر مەبن.

## شانازیی کرد بە ڕەچەڵەکەوە

ئیمام ئەحمەد لە موسنەدەکەی خۆیدا لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە (ڕەزای خودای لێ بێت) دەگێڕێتەوە، لە سەردەمی پەیامبەردا دوو پیاو زاریان لە یەکتر گیر بوو، یەکیان گوتی: من فڵانی کوڕی فڵانم، تۆ کێی هەی بێدایک! پەیامبەر فەرمووی: دوو پیاو لە سەردەمی مووسادا (سەلامی خودای لێ بێت)، یەکیان گوتی، من فڵانی کوڕی فڵانم، (تا نۆ پشتی خۆی ژمارد)، ئەی تۆ کێیت ئەی بێدایک؟

گوتی: من فڵانی کوڕی فڵانی کوڕی ئیسلامم.

پەروەردگار وەحی کرد بۆ مووسا و پێی فەرموو: بە یەکەمیان بڵێ ئەوەی نۆ پشتی خۆی ژمارد تۆ دەهەمیانی لە دۆزەخدا.

تۆیش کە ڕەچەڵکی خۆت پاڵ دا بۆ لای دوان، تۆ سێیەمیانی لە بەهەشت.

### وانەی یەکەم

نرخی مرۆڤەکان بە دڵیانەوەیە نەوەک گیرفانیان، بە خوو و ڕەوشتیانەوەیە نەوەک جلوبەرگیان، بەو شێوەیەی ژیان دەکەن، نەک بەوەی لە کوێوە هاتوون. گەر ڕەچەڵەک سوودی هەبوایە، بێگومان سوودی بۆ ئەبولەهەبی هاشمی دەبوو، ڕەچەڵەک

زیانی هەبوایە، ئەوا زیانی بۆ بیلالی کوڕی ڕەباح دەبوو، کوڕی بەندەیەکی قوڕبەسەر بوو، خۆیشی بەندەیەکی بێدەسەڵات. قورئان کاتێک باسی لوقمان دەکات، کە بەندەیەکی خزمەتکار بووە، هیچ کەس خۆی بە بنەچە و خانەوادەیە نەنازێت گەرچی پلەوپایەیان بەرز بێت.

هیچ کەس لە نەسەبی خۆی نەهێنێتە خوارەوە، گەرچی بەرزیش نەبێت، مرۆڤ تەنها دەمرێت و بە تەنها دەچێتەوە گۆڕەوە و بە تەنها لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت.

بنەچە گەر سوودی هەبوایە، سوودی بۆ کوڕی نووح دەبوو.

گەر زیانی هەبوایە بۆ ئیبراهیمی باوک بێباوەڕ زیانی دەبوو.

لە فەرموودەی خۆشەویستدا هاتووە: ئەی فاتمەی کچی موحەمەد، کردەوەی باش بکە، من لای پەروەردگار هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنم. ئەی عەبباسی مامم کردەوەی خۆت بکە، من لە قیامەت هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنم. خەڵکی بەهۆی کار و کردەوەکانیانەوە نەیەنە لام، ئێوەیش تەنها بە ڕەچەڵەک و نزیکایەتیان لە منەوە بگەڕێنەوە.»

## وانەی دووەم

مرۆڤ مافی خۆیەتی شانازی بکات بە باووباپیرانیەوە، جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان شانازی و خۆبەگەورەزانین بە باوباپیرانەوە.

گەر لە خانەوادەیەکی خاوەن پلەوپایەیت،
کارێک مەکە زیان بە بنەچەت بگەیەنیت.
گەر بنەچەت بەرز نییە،
نزمیی بنەچە و نزمیی کردەوەکانت پێکەوە کۆ مەکەرەوە.

بە کرداری قێزەون ڕەچەڵەکە ڕەسەنەکان لەکەدار مەکەن.

سولەیمانی کوڕی داود (سەلامی خودای لێ بێت)، پەیامبەرە و لە پشتی پەیامبەرێکی ترەوە هاتووە، بە زمانی پڕ لە خاکیبوونەوە نزای ﴿ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ ﴿١٩﴾ ﴾(النمل) «ئەی پەروەندەری من وام ڕابێنە سوپاسی چاکەی تۆ بکەم بەهۆی ئەو نیعمەتانەی بە سەرتدا ڕێژاوم»، سولەیمانی دەسەڵاتداری سەرانسەری زەوی بە دەم مێروولەیەکەوە پێدەکەنێت، لێپرسینەوە لە پەپووسولەیمانکەیەک دەکات، بنەچە و دەسەڵات نەبوونە مایەی یاخیبوونی. چیرۆک و گێڕانەوەی ئەوانی تر، تەنها بۆ خۆشی و کاتبەسەربردن نییە، بەڵکوو بۆ ئامۆژگاری و پەندلێوەرگرتنە، یوسف خاوەنی بەرزترین پشت و ڕەچەڵەکە یوسفی کوڕی یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم پەیامبەر... کوڕی پەیامبەر کوڕی پەیامبەر کوڕی پەیامبەر، بەوپەڕی خاکیبوونەوە ڕەفتار دەکات، چارەسەری کێشەی هەژاری دەکات، خۆراک بەسەر هەژاراندا دابەش دەکات، پرسیاری لێ دەکەن بۆچی بەڕۆژوو دەبیت لە کاتێکدا تەواوی گەنجینەکانی زەوی لەژێر دەستی تۆن، وەڵامێکی لێوانلێو لە ئەخلاق، دەڵێت: بۆ ئەوەی برسییەکان لە یاد نەکەم.

## وانەی سێیەم

پەروەردگار زۆر لەوە دادپەروەرترە بەهۆی خراپەی کوڕێکەوە باوکەکەی بخاتە نێو دۆزەخ، یاخود بە پێچەوانەوە بەڵام ئەوەی لە فەرمووده‌دا هاتووە، هەواڵە لە لایەن پەروەردگارەوە، پەروەردگار زانستی هەبوو لە پشتی چ ستەمکارێک ئەم کەسە لە دایک دەبێت. دەبێت بەوپەڕی نەرمی و ڕەوشتەوە ئایەتەکانی قورئان بخوێنینەوە، پەروەردگار لەوە پاک و بێگەردترە گومانمان لە دادی ئەو هەبێت،

هیچ گومان لە سۆز و میهرەبانیی ئەو ناکرێت، ئەرکی ئێمە گومانی باشە بە خەڵکی.

خودا ئەولاترە، شایستەترە بە گومانی باش، جا هۆشیار بە، کردەوەکانی خەڵکی بە پەروەردگارت بەراورد نەکەیت، یاخود بە پێچەوانەوە.

ئەو میهرەبانە هێندەی گەردیلەیەک ستەم ناکات، بە پێچەوانەی مرۆڤەکانەوە کاتێک تووڕە دەبن چاک بە خراپ دەناسێنن.

پەروەردگار بە میهری خۆی لە خراپەکاران خۆش دەبێت.

بەهۆی ئاودانی سەگێکەوە تاوانکارێک لە دۆزەخ قوتار دەکات.

ئەو مرۆڤەی تەنها چاکەیەکی نەکردووە، لێی خۆش دەبێت لەبەر ئەوەی بەخشندە بوو بەرانبەر خەڵکی.

پەروەردگار منداڵ ڕێزدار دەکات بەهۆی چاکی باوکیەوە.

پەیامبەرێک و یەکێک لە خۆشەویستانی خۆی دەنێرێت، بۆ ئەوەی دیوارەکە ڕاست بکەنەوە.

## وانەی چوارەم

هەمیشە خاکی بن.

بەهەشت جێگەی خەڵکانی دڵپاک و کارئاسان و لێبووردەیە.

دۆزەخ شوێنگەی خەڵکانی لەخۆبایی و لووتبەرزە.

خاکیبوونی پەیامبەر گەیشتبووە ئاستێک قەدەغەی کرد لە هاوەڵانی کە لە ساتی چوونەژوورەوەی لە بەری هەڵبسن.

جارێکیان چووە ژوورە، بینیی هاوەڵانی لە بەری هەڵسان، تووڕە بوو، ڕووی سوورهەڵگەڕا هەر کات، تووڕەبوایە خێرا بە ڕوویدا دەردەکەوت کە تووڕە دەبوو، خۆی لە هەموو وتە و کاردانەوەیەکی خراپ دەپاراست، بەهۆی ئەم ئەخلاقە قەشەنگەی

خۆشەویستەوە، حەسسان لە خزمەتیدا فەرمووی:

وقـوفي للعزيز علي فـرض
وتـرك الفـرض ما هو مستقيم
عجبـت لمن لـه عقـل وفهم
يـرى هذا الجمـال ولا يقوم

خۆشەویست وەک خوی هەموو جاری درەنگ توورە دەبوو، زوو دڵی ئاشت دەبووەوە، خەندەیەکی بۆ حەسسان کرد. جارێک عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی ترسا و گیانی کەوتە لەرزین.

فەرمووی: مەترسە و لەسەرخۆبە من کوڕی ئافرەتێکی ئاساییم لە مەککە، گۆشتی وشککراوەی دەخوارد.

جارێک دانیشتبوو، کیژۆڵەیەکی حەوت ساڵە هات، دەستی پەیامبەری گرت، بردی لەگەڵ خۆی.

بێئەوەی بزانێت بەرەوکوێ پاشان داوای لێ کرد لای گەورەکانی شەفاعەتی بۆ بکا. نێررا بوو بۆ جێبەجێکردنی هەندێک کاری خۆیان، دواکەوتبوو. خۆشەویست هەموو جار گاڵتەوگەپی لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی مالیک، برای ئەنەسی کوڕی مالیک، دەکرد و ناوی نابوو ئەبا عومەیرە، چۆلەکەیەکی بچووکی هەبوو ناوی (النغير)ی لێنابوو، هەمیشە یاریی لەگەڵ دەکرد.

دوای ماوەیەک پەیامبەر لێی پرسی: ئەبا عومەیرە هەواڵی نوغەیر چییە؟

ئەبا عومەیر دەستی کرد بە گریان، گوتی: ئەی خۆشەویست (النغير) مرد!

بە قوربانی بم.

هاوەڵانی ئازیز بە هەمان شێوە لە خزمەتی پەروەردەدا بوون، ئەبوبەکر خەلیفەیە و ماڵی پیرەژنێک خاوێن دەکاتەوە، لە

ڕێگەدا دەڕۆیشت، منداڵێک بە توندی جلەکانی گرت و هاواری لێ کرد، ئەی باوکە، ئەی باوکە، لەوەیش زیاتر لەگەڵ هاوسەرەکەی خزمەتی ئافرەتێکی دەشتەکییان کرد، منداڵی دەبوو لەسەر شانی ئاردی دەبرد بۆ ماڵان، بە دەستەکانی خۆی خواردنی بۆ ساز دەکردن، نێرراوی کیسرا دێتە لای و پرسیاری کۆشک و تەلار و دەستەی پارێزەرانی دەکات، لەژێر ئەو درەختە سادەیەی کە تێیدا دەنوست، ئیمپراتۆری فارسی لەناو برد.

عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی نەوەی عومەری کوڕی خەتتاب لە ڕێگەی تاریکیدا بەرەو مزگەوت قاچی هەڵکەوت لە کابرایەک، کابرا بە تووڕەییەوە گوتی: تۆ کوێریت!

عومەری: نەخێر کوێر نیم.

خەڵکانی دەوروبەری تووڕە دەبن.

عومەر بە ئاسایی دەڵێت، وازی لێ بهێنن، پرسیاری کرد، منیش وەلامم دایەوە.

ڕۆژێک چراکە لە بێزەیتی کوژایەوە.

هەستا زەیتی کردە نێو چراکەوە، گوتیان: ئەی جەناب دەکرێت کەسێک لە بری تۆ ئەو کارە بکات.

گوتی: کە هەستام بۆ ئەو کارە، عومەرم، کە گەڕامەوە هەر عومەرم.

بەڕاستی ئەم چیرۆکانە وانەی پەند و عیبرەتیان تێدایە.

## منداڵی شیرەخۆر

بوخـاری دەگێڕێتـەوە خۆشەویسـت فەرموویەتـی، جارێـک ژنێـک مەمکـی دەدا بـە کۆرپەکـەی (کـە لـە نـەوەی ئیسـرائیل بـوو) لـەو کاتـەدا سـوارێکی قـۆزی بەناوبانـگ بـە سـواری وڵاخێکـی کەشـخە بـە لایانـدا تێپـەڕی، پایـە و نیشـانەیەکی زۆری پێـوە دەبێـت، ژنەکـە دەڵـێ: پـەروەردگارا! ئـەم کوڕەی منیش بکـەی بـە سـوارچاکێکی قـۆز و بەناوبانـگ، کۆرپـە شـیرەخۆرەکە مەمکەکـەی بـەردا و ڕووی کـردە سوارەکە و تەماشـایەکی کـرد و گوتـی: خودایـە وەک ئـەوم لـێ نەکـەی! دیسـان مەمکەکـەی گرتـەوە و دەسـتی کـرد بـە مژینـی.

ئەبوهورەیرە گێڕەرەوەی فەرموودەکە دەڵێت: وا لـە بەرچـاو، کـە چۆنچۆنـی پەیامبـەر پەنجـەی دۆشـاومژەی خـۆی دەمـژی و لاسـایی حاڵـی مەمکخواردنـی منداڵەکـەی دەکـردەوە، خۆشـەویسـت فەرمـووی، پاشـان بـە لای کەنیزەیەکـدا تێپەڕیـن، کۆمەڵێـک بەگیریـان هێنابـوو لێیـان دەدا و دەیانگـوت کاری بەدڕەوشـتیی کـردووە، ئەویـش دەیگـوت، مـن کاری وام نەکـردووە، مـن هـەر خـودام هەیـە بـە ڕاسـتی خـودا پشـتیوانی چاکە، دایکـی منداڵەکـە دەڵـێ خودایـە، ئـەم کوڕەی مـن وەک ئـەم کچـە بـەم دەردە نەبـەی، دیسـان کـوڕە شـیرەخۆرەکە مەمکـی دایکـی بـەردا، تەماشـایەکی کەنیزەکەکـەی کـرد و گوتـی، خودایـە وەک

ئەو کچەم لێ بکە، دواتر دایکی بە سەرسوورمانەوە گوتی، ئەمانە بۆ؟ شیرەخۆر گوتی: چونکە سوارەکە زۆردارێکە لە زەبردار و ملهوڕان، بەڵام ئەو کەنیزەیە کە پێیدەڵێن دزی و بەدڕەوشتیت کردووە، بێتاوانە پاک و بێگەردە، ستەمبارە نە دزی کردووە و نە بەدڕەوشتی.

## وانەی یەکەم

ئەم وانەیە دەبوو لە سەرەتای کتێبەکەدا باس کرابا.

لە کۆنەوە گوتراوە، درەنگ بێت باشترە لەوەی هەر نەیەیت.

هەندێک بابەت هەر کات بێن هەر بە سوودن.

باران هەرچەندە دوایش بکەوێت بە سوودە بۆ زەوی.

چیرۆک کاریگەریی بەرچاوی هەیە، لەسەر دەروونت بۆ پەندوەرگرتن بێت، یاخود نا بە ئاسانی دەچێتە نێو دڵەکانەوە. چێژی تەواو بە بیسەر دەبەخشێت.

ئەو چیرۆکانەی قورئان باسیان دەکات، بە دڵنیاییەوە ڕاستین، گەرچی هەندێک لە ڕووداوەکانی ناوی پێچەوانەی شتە باوەکانە.

ئیبراهیم فڕێ درایە نێو ئاگرەوە و زیانی پێ نەگەیشت. مووسا بە گۆپاڵەکەی دەریای کرد بە دوو بەشەوە.

یونس لەنێو تاریکایی سکی نەهەنگ مایەوە. سولەیمان (سەلامی خودای لێ بێت)، لەگەڵ تەواوی گیاندارەکان قسەی دەکرد و جنۆکەکان لەژێر فەرمانیدا بوون. نووح (سەلامی خودای لێ بێت)، کەشتیی دروست کرد و لەنێو شەپۆلەکانی ئاودا دەرباز بوو. ئیسماعیل (سەلامی خودای لێ بێت)، بەهۆی قوربانییەکەوە پەروەردگار ڕزگاری کرد. ئەو چیرۆکانەی لە فەرموودە سەحیحەکانی خۆشەویستدا هاتوون، جیاوازییان نییە لەگەڵ چیرۆکە قورئانییەکان.

چیرۆکەکانی قورئان و فەرموودەی لێوانلێون لە پەند و عیبرەت، بەسن بۆ ئاوەزی مرۆڤی هۆشیار.

بۆ ئێمە گێڕراونەتەوە، باوەڕی تەواومان بەم چیرۆکانە هەیە، دڵنیاین لە ڕاستیی ڕوودانیان، بڕوا بە ڕاستگۆیی گێڕەوەکانیان (خودا و پەیامبەرەکەی) هەیە، چونکە پێش هەموو شتێک ئێمە باوەڕمان بە پەروەردگار هەیە. چیرۆکەکانی نێو قورئان و فەرموودە، وەک چیرۆکی هەزارویەک شەوە تەنها بۆ چێژ نین.

چیرۆکی ئازایەتی و قارەمانیەتی ئەبی زەیدەی هیلالی نین.

وەک چیرۆکی گەڕان بەدوای گیایی نەمریی گلگامش نین.

وەک شانامە و ئەلیازە و کتێبی مردووی فیرعەونەکان نین.

چیرۆکە قورئانییەکان لە سەروو هەموو ئیستاتیکاوە بە فەلسەفەی تێگەیشتنی﴿ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ ﴾(الأعراف)، «تۆ لەو تەرزە باسانەیان بۆ وەگێڕە شایەتا بیر بکەنەوە» کۆتایی دێت، کارەکتەرە مرۆییەکانی نێو چیرۆکە قورئانییەکان و فەرموودە.

نموونەکانیان لە هەموو سەردەمەکاندا دووبارە دەبنەوە.

لە هەموو سەردەمێکدا بە فۆڕمێکی جیاواز مووسا و فیرعەن ئیبراهیم و نەمرود بوونیان هەبووە.

لە هەموو سەردەمێکدا تاغوت و ستەمکارانی و هاوەڵانی ئوخدود هەن.

هەموو سەردەمێک موحەمەد و ئەبی جەهلی تێدایە.

جەنگی نێوان کەمینەی مسوڵمان قورەیشی خاوەن هێز بەردەوامە.

هەموو سەردەمێک خوداپەرستێکی وەک جورەیج و میللەتێکی خراپی وەک هۆزەکەی ئەو هەن.

لە هەموو سەردەمێکدا خەڵکانی خاوەن ئیمان و ئیرادە وەک

وەرازێنی کچەی فیرعەون هەن لە هەموو سەردەمێکدا هاوسەرانی دڵرق و خراپی وەک فیرعەون هەن.

ئافرەتێکی خراپی وەک هاوسەری لووت هەیە.

کوڕێکی یاخی وەک کوڕی نووح و مامێکی ستەمکاری وەک ئەبوولەهەب هەیە.

لەم چیرۆکانەوە تێدەگەین، لەوەی ئەم کاروانەی ئێمە سەرەتا و کۆتایی نین.

مرۆڤەکان لەم ژیانەدا بە بێباوەڕ باوەردارییانەوە رۆڵەکان دابەش دەکەن، تا ئەو کاتەی قیامەت بەرپا دەبێت.

## وانەی دووەم

بە رووکەشی بابەتەکان هەڵنەخڵەتییت، هەندێک جار بتەکان پێچەوانەی رووکەشن. عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود جارێکیان بەسەر دارێکدا هەڵزنا، قاچە لاواز و بێهێزەکانی دەرکەوت، بەشێک لە هاوەڵان دەستیان کرد بە پێکەنین. خۆشەویست نیگەران بوو، فەرمووی: «قاچەکانی ئیبن مەسعوود لای پەروەردگار قورسترن لە کێوی ئوحود.»

پێشەوا عومەر حەڤدە پینە بە پۆشاکەکەیەوە بوو.

بەم وێنایە بۆنی خاکیبوونی لێ دەهات.

ئەبووبەکر بە کۆڵانەکانی مەدینەدا ڕێی دەکرد و منداڵان چەمکی کراسەکەیان دەگرت و بە ئاوازی باوکە باوکە هاواریان لێ دەکرد.

ئەو ئافرەتەی مزگەوتی خۆشەویستی خاوێن دەکردەوە.

بەرائی کوڕی مالیک (ڕەزای خودای لێ بێت)، سەرقژنی تۆزاوای رووکەشی مرۆڤەکان هەڵخەڵەتێنەرن.

نرخی مرۆڤەکان بە جلوبەرگیان نییە، هەڵبەت ئێمە دژی جوانی و

خاوێنی نین، پەروەردگار خۆشحاڵە بەوەی شوێنەواری ڕۆزییەکانی بە بەندەکانیەوە ببینێت، بەڵام ڕووکەش هەموو شتێک نییە.

قارەمانێکی جەربەزە خەڵکی دەستی بۆ ڕادەکێشێت، ئەو ئافرەتە هیواخوازە کوڕەکەی لە داهاتوودا وەک ئەوی لێ بێت.

وەک هەموو ئەوانی تر بە ڕووکەش هەڵخەڵەتا، مرۆڤەکان بە زوویی بە ماڵ و دەسەڵات لە خشتە دەچن.

پەروەردگار منداڵەکەی هێنایە گۆ، بۆ ئەوەی نزای دایکی ڕەت بکاتەوە، جوانی و ماڵ لەپاڵ ستەم و یاخیبووندا چ ئەرزشێکی هەیە، ئەو کەنیزە ڕەشە بە ناڕەوا تۆمەتی دزی و داوێنپیسی دراوەتە پاڵی.

دایکەکە نزا دەکات، منداڵەکەی وەک ئەوەی لێ نەیەت، پەروەردگار دەیهێنێتە گۆ و دەڵێت: پەروەردگارا، وەک ئەوم لێ بکەیت.

باشترە بۆ تۆ ستەملێکراو بیت لەوەی ستەمکار بیت.

هیچ زیانی بۆ تۆ نییە گەر لە زەویی نەناسراو لە ئاسمان ناسراو بیت.

ماڵەکان نهێنین و خەڵکیش سندووقی داخراون.

بڵاوکردنەوەی وێنەی یادی لەدایکبوون

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان واتای

ماڵێکی پڕ بەختەوەری نییە.

بڵاوکردنەوەی وێنەی خواردنە بە تامەکان

واتای ئەوە نییە ئەوەی دەیانەوێت بۆیان فەراهەمە.

زۆر جار لە بەدبەختی و نەبوونی بەختەوەری

مرۆڤەکان دەیانەوێت وا نیشان بدەن بەختەوەرن.

پیاوێک لەگەڵ ژنەکەی سەردانی باخچەی ئاژەڵانی کرد، لە نزیک قەفەزی مەیموونەکانەوە تێپەڕی، بینیی مەیموونێک یاری

لەگەڵ مێیەکەیدا دەکات، ئافرەتەکە گوتی: چیرۆکێکی خۆشەویستیی پڕ لە جوانییە کاتێک بە لای قەفەسی شێرەکاندا تێپەڕی، بینیی نێرەکە بە بێدەنگی دوور لە مێیەکە دانیشتووە، ئافرەتەکە گوتی: چیرۆکێکی خۆشەویستیی تراژیدییە.

هاوسەرەکەی دارێکی بچووکی بۆ مێیەی شێرەکە هاویشت، نێرە هەڵمەتی برد و مێیەکەی پاراست، دواتر گەڕانەوە بۆ قەفەسی مەیموونەکان، پیاوەکە هەمان شتی دووبارە کردەوە، دارێکی هاویشتە مێیەی مەیموونەکە، بەڵام نێرە هەر سەرقاڵی کەیف و یاریی خۆی بوو، وەک ئەوەی بڵێت هیچ ڕووی نەداوە، هۆشیار بە، زۆر جار ڕووکەشەکان هەڵخەڵەتێنەرن.

هەندێک جار خەڵکی دڵیان ئەوە دەخوازێت کە زیانیان پێ دەگەیەنێت بێئاگان لەوەی ڕێگریی خودایی بەخشینە بۆ ئەوان.

هەزاری بۆ هەندێک لە خەڵکی گونجاوە، دەوڵەمەندیش بۆ هەندێکی تر، هەندێک لە نەخۆشەکان گەر تەندروست بوونایە یاخی دەبوون، هەندێک لە هەژارەکان دەوڵەمەندبان، لووتبەرز دەبوون، دەوڵەمەندێکی سوپاسگوزار، گەر هەژار بوایە، کوفرانەی دەکرد، هەندێک جار خوداپەرستێک نەخۆش بێت، ناسزایی دەکات.

زۆر جار بیر لەو وتەیەی عومەر دەکەمەوە:

«گەر پەردەی غەیب لابدرێ، هیچ کەس لە ئێمەوە جگە لەوەی پەروەردگار بۆی دیاری کردووە شتێکی تری دیاری نەدەکرد.»

دەسەڵاتدارێک هەمیشە گلەیی ئەوەی لێ دەکرا کە ئاگای لە حاڵی خەڵکی نییە، جارێک هەژارێک هاتە لای بۆ ئەوەی وانەیەکی کرداریی پێ ببەخشێت.

داوای لە پیاوانی گوند کرد، هەر یەکیان کێشەی خۆی بنووسێت، هەمووان بێ تۆمارکردنی ناویان کێشەکانیان چارەسەر کرد.

کابرای ژیر هەموو کاغەزەکانی خستە نێو سندووقێکەوە و گوتی: ئەمە ژیانی خەڵکییە لە بەردەستی ئێوە، فەرموو دەستی پێدا بکە و دانەیەک بۆ خۆت هەڵبژێرە، پادشا دەستی کرد بە سندووقەکەدا و کاغەزێکی دەرهێنا، دیار بوو بە دڵی نەبوو، فڕێی دا.

دووەم و سێیەم و چوارەم تاوەکوو ئەوەی دانە دانە کاغەزەکانی لە سندووقەکە دەرکرد، دواتر ڕووی کردەوە کابرای حەکیم و گوتی: جگە لەم ژیانەی خۆم هیچی ترم ناوێت.

ڕازیبوون بە بەشی خۆت، لووتکەی دەوڵەمەندییە.

تەواوی دارایی دونیات هەبێت، بەبێ ڕازیبوون هەژارییە.

هەژاریی دونیا لەگەڵ ڕازیبوون دەوڵەمەندییە.

## خەون

بوخاری لە فەرموودەی سومرەی کوڕی جوندبەوە (ڕەزای خودای لێ بێت)، دەگێڕێتەوە: خۆشەویست زۆر جار بە هاوەڵانی دەفەرموو، هیچ کەس لە ئێوە خەونێکی بینیوە تا بیگێڕێتەوە بۆمان؟ هەر کەس خەوێکی دیتبا بۆی دەگێڕایەوە.

هەتا بەیانییەک خۆی بە ئێمەی فەرموو، ئەم شەو دوو فریشتە هاتن بۆ لام، پێیان گوتم وەرە، منیش لەگەڵیان ڕۆیشتم، هەتا گەییشتینە جێگەیەک، چاوم بە پیاوێک کەوت، لەسەر گازەرەی پشت ڕاکشابوو، پیاوێکی تریش خڕکەبەردێکی پێ بوو، لەسەر سەری وەستابوو، تلەبەردەکەی دەماڵی بە تەپڵەسەریدا، ئیتر کەللەی شەقوپەق دەبوو، گشت جارێ کە تلەبەردەکەی دەکێشا بە سەری کابرادا، بەردەکە گل دەبووەوە بۆ خوارەوە، ئەویش دوای دەوکەوت و دەچوو دەیهێنایەوە تا دەگەڕایەوە سەری کابرا، وەک خۆی ساڕێژ دەبووەوە، وەک جاران چاک دەبووەوە، دیسان دەیکێشایەوە بە سەریدا.

گوتم پێیان: پاکوبێگەردی بۆ خودا، ئەمانە چین؟

گوتیان: بڕۆ با بڕۆین.

ڕۆیشتین تا گەیشتینە پیاوێک لەسەر گازەرەی پشت پاڵکەوتبوو،

کەسێکی تر بە قولاپێکی ئاسنەوە بەسەر سەریەوە ڕاوەستا بوو، پەلاماری لایەک لە ڕووی کابرای ژێردەستی دەدا، بە قولاپەکەی دەستی لالغاوی تا پشتەملی و کونەلوتی هەتا پشتەملی و کونی چاوی هەتا پشتملی هەڵدەتڵیشاند، پاشان دەیگواستەوە بۆ لاکەی تری، بە هەمان شێوەی لای یەکەمی لێ دەکرد، خەریکی ئەم لایەی بوو، لایەکی تری چاک دەبووەوە، جارێکی تر دەستی پێ دەکردەوە، دیسان وەک جاری یەکەم دەستی دەکردەوە بە سزادانی.

گوتم پاکوبێگەردی بۆ خودا ئەم دوانە چین؟

گوتیان پێم: بڕۆ با بڕۆین.

ڕۆیشتین تا گەییشتینە شوێنێک وەک تەنوور، دەنگەدەنگی لێوە دەهات، پڕ لە قاوقیژ بوو کە سەیری ناوەکەیمان کرد، پڕ بوو لە پیاو و ژنی ڕووتوقوت، لە ژێریانەوە بڵێسەی ئاگر پرتاوی دەهێنا بۆیان، هاواریان لێ هەڵدەسا و دەیانکرد بە هەرا.

پێمگوتن ئەمانە چییانە؟

گوتیان بڕۆ با بڕۆین.

ڕۆیشتین تاوەکوو گەیشتینە سەر ڕووبارێک و چۆمێکی سووری ڕەنگ خوێناوی بوو کابرایەکی مەلەوان لە ناویدا مەلەی دەکرد، پیاوێکیش لەسەر لێواری چۆمەکە پەڵەبەردێکی زۆری لە بەردەستدا، بوو، گشت جارێ کە کابرای مەلەوان بە مەلە دەهات و دەچوو بۆ لای ئەوەی کە کۆمەڵە بەردەکەی لابوو، دەمی بۆ دادەچەقاند و ئەویش بەردێکی دەخنیە ناو دەمی، هەناسەی لێ دەبڕی، کابرا دەگەڕایەوە بۆ شوێنی پێشووی خۆی، ئیتر هەموو جارێ بەم شێوەیە تلێکی دەکێشا بە دەموقەپۆزیدا، کابرا دەگەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی.

گوتم: ئەم دوانە چین؟

گوتیان: برۆ با برۆین.

ڕۆیشتین تا گەییشتینە زەلامێکی ئێسکقورسی ڕەزاقورس، ئاگرێکی لە بەردەمدا بوو، وردەوردە ئاگرەکەی خۆش دەکرد و بە دەوریدا دەهات.

گوتم: ئەم دوانە چین؟

گوتیان: برۆ با برۆین.

دیسانەوە کەوتینە ڕێ تا گەیشتینە باخ و مێرگێکی چڕ، پڕ بوو لە هەموو جۆرە گوڵێکی جوانی بەهارە، لە ناوەڕاستی باخەکەدا پیرەمێردێکی بالآبەرز لە بن شێخەڵێکی گەورە دانیشتبوو، ئەم پیرەپیاوە هێند قۆچ و درێژ بوو، سەری لە بەرزیی ئاسمان گیر بووبوو، منداڵێکی بێشوماری لە دەور بوو، هیچ کات کۆمەڵە منداڵی وام نەدیتبوو.

گوتم: ئەم پیاوە چییە؟ ئەم منداڵانە چین؟

گوتیان: برۆ با برۆین.

دواتر ڕۆیشتین تا چووینە لای شادرەختێک، لە ژیانمدا شادرەختی وا گەورە و جوانم نەدیتبوو، پێیان گوتم پێیدا سەر بکەوە، بەسەر دەرختەکەدا سەر کەوتین، گەیشتینە لای شارێک، ئەو شارە لە خشتێکی زێڕ و لە خشتێکی زیو دروست کرابوو، دواتر چووینە بەر دەروازەی دەرەوەی شارەکە و لە دەرگای شارەکەمان دا، داوای کردنەوەمان کرد و بۆیان کردینەوە، چووینە ناو شارەکەوە پیاوگەلێکی سەیرمان بینیی، نیوەی لەشیان تا بڵێی جوان بوو. نیوەکەی تریشیان تا بڵێی ناشرین بوو، دوو فریشتەکە پێیان گوتن ئادەی برۆن خۆتان بخەنە ناو ئەو چەمەوە، چەمەکە ڕووبارێکی پانوپۆڕ بوو، ئاوەکەی پڕ بە پانایی چەمەکە دەکشا و دەڕۆی، ئاوەکەی ئەوەندە سپی بوو، دەتگوت چرپی خوری شیرە،

ئەوانیش چوون خۆیان هەڵکێشا لەو ئاوە، پاشان هاتنەوە بۆ لای ئێمە، ناشیرینییان هیچ پێوە نەما و تەواو جوان بووبوون، شێوەیەکی جوانیان وەرگرتبوو، پاشان گوتیان ئەم شارە بەهەشتی مانەوەی یەکجارییە، ئەو جێگەیەیش لەو سەرەوە هەوارگەی تۆیە، کە چاوم بەرەو سەر هەڵبڕی، چاوم کەوت بە کۆشکێکی باڵا بە ئاسمانەوە بوو، وەک پەڵەهەوری سپی وابوو، گوتیان ئەو کۆشکە شوێن و مەنزڵی تۆیە، گوتم: خودا سەرفرازتان بکا وازم لێ بهێنن با بچمە ناویەوە، گوتیان هەر بۆ تۆیە و دەچیتە ناوی، بەڵام ئێستا نا. پێمگوت من ئەمشەو شتگەلی سەیروسەمەرەم دیت، دەکرێت هەواڵم پێ بدەن لە بارەیانەوە؟ گوتیان بەڵێ، پیاوی یەکەم، کە دیت بە بەرد سەریان دەشکاند، ئەو پیاوەیە کە قورئان لەبەر دەکا و پاشان لە بیری خۆی دەباتەوە و دەوری ناکاتەوە تا لە بیری دەچێتەوە و لە کاتی نوێژە فەرزەکاندا دەخەوێت و خەم لە نوێژەکەی ناخوات.

ئەو کەسەی کە چووین بە سەریدا: لالغاو لووت و چاویان هەتا پشتملی دەدڕی، ئەو پیاوەیە لە ماڵ دەردەچێ هەر خەریکی درۆکردنە و درۆی ئەو بە هەموو لایەکدا بڵاو دەبێتەوە.

ئەو پیاوگەل و ژنگەلە ڕووتانە کە لەناو ئەو شوێنە داخکراوە بوون، ئەوانە پیاوی شەڕواڵپیس و ژنی داوێنپیس بوون، ئەو کەسەی بینیت لەناو چۆمەکەدا مەلە دەکات، بەردی دەرخوارد دەدەن ئەوە سووخۆر بوو، ئەو کەسە ڕەزاتاڵەیش کە سەرقاڵی گەرمکردنی ئاگرەکە بوو، ئەویش مالیکی وەردیانی دۆزەخ بوو، پیاوە کەڵەگەتەکەیش کە لەناو باخەکەدا بوو، ئەویش ئیبراهیم بوو (درووودی خودای لێ بێت)، ئەو منداڵانەیش کە لە دەوری بوون، ئەوە ئەو منداڵانە بوون کە لەسەر ئایینی فیترەت لەدایک بوون و بە منداڵی مردوون.

هەندێک لە هاوەڵان گوتیان: ئەی خۆشەویست، ئەی منداڵی هاوبەشپەیداکەران و نامسوڵمانەکان چی؟
فەرمووی: منداڵی ئەوانیش حاڵیان حاڵی منداڵانی مسوڵمانە. ئەو کۆمەڵە پیاوەیش کە لایەکی لەشیان جوان و لایەکی لەشیان ناشرین بوو، ئەوانەن کە چاک و خراپیان تێکەڵ کردووە و کردەوەی باش و خراپیان هەیە، ئەوە بوو خودا چاوپۆشیی لێ کردن و لێیان خۆش بوو.

## وانەی یەکەم

خەونی پەیامبەران بەشێکە لە وەحی.
ئەم ڕاستییە کە پێویستە باوەڕمان پێی هەبێت، بە تایبەتی کاتێک فەلسەفەی ئەودیوی چیرۆکەکان دەخەینە ڕوو.
ئەم بابەتە کۆدەنگی ئوممەتی لەسەرە، وا نازانم هیچ کەس پێچەوانەی ئەم بۆچوونەی هەبێت، هەر بۆچوونێکی پێچەوانەی ئەم بابەتە دژ و پێچەوانەی قورئانە.
ئیبراهیم (سەلامی خودای لێ بێت)، بە ئیسماعیلی کوڕی فەرموو: ﴿ يَٰبُنَيَّ إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ (الصافات) (کوڕیژگەکەی خۆم من لە خەومدا وام دیوە تۆ سەردەبڕم)، ئیسماعیل جوامێرانە بە دەم داواکەی باوکیەوە هات چریکەی: ﴿ يَٰٓأَبَتِ ٱفۡعَلۡ مَا تُؤۡمَرُۖ ﴿١٠٢﴾ ﴾ «با بۆ هەر شتێ پێتسپێراوە بەجێی بهێنە».
خەوی خەڵکی دابەش دەکرێت، بۆ سێ بەش، خەوی باش و دروست، لە لایەن خوداوە مژدەیە بۆ تاکی مسوڵمان، وەک خەوی عەزیزی میسر و ئاماژەکانی هاتنی گرانی لەو خەونەوە.
خەوی خراپ کە سەرچاوەکەی شەیتانە بە هۆیەوە مسوڵمان غەمبار دەبێت.

خەوی بێسەروبەرە: ئەو بابەتانەیە مرۆڤ ڕۆژانە بیری لێ دەکاتەوە لەگەڵ ڕووداوەکانی ڕۆژ لە خەودا دەیبینێتەوە.

جۆری یەکەمی، تەنها جۆری خەوە کە بە پێی تواناکان و شارەزایی لێکدانەوەی بۆ دەکرێت.

لێکدانەوەی خەون حوکمی فەتوای هەیە، فەتوادان بەبێ زانست ڕێگەپێدراو نییە.

## وانەی دووەم

قسەکردن لە بارەی لێکدانەوە «تەئویل»-ەوە ڕاماندەکێشێت بۆ پرسیارێکی تر: ئایا لێکدانەوەی خەون زانستێکە پەروەردگار دەیخاتە نێو دڵی یەکێک لە بەندەکانی، یاخود لە ڕێی کۆشش و فێربوونەوە وەدەستی دەهێنێت، وەک هەر زانستێکی تری وەک: فیزیا و بیرکاری؟ دوای خوێندنەوەیەکی قوڵ لەم بارەیەوە، پێموایە لێکدانەوەی خەو لە نێوانی هەردووکیانە، واتە ئیلهامی خودایی و هەوڵدان بۆ فێربوونی، بەڵام زۆربەیان لە لایەن پەروەردگارەوەیە.

جۆری یەکەم لەو جۆرەیە کە پەروەردگار یوسفی فێر کردووە وەک قورئان وێنای دەکات ﴿ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ ﴿٢١﴾ ﴾ (یوسف) «تا ئێمە فێریشی بکەین چۆن خەونان لێک بداتەوە» ئەوانی تر پێویستی بە کۆمەڵێک یاسا و بنەما هەیە، پێویستە خەڵکی ئاگاداری بن خەون بە پێی بینەرەکەی لێک دەدرێتەوە دوو پیاو هاتن بۆ لای ئیبن سیرین:

یەکیان گوتی: لە خەومدا بینیم بانگ دەدەم.

ئیبن سیرین گوتی: گەشتی ماڵی خودا دەکەیت.

کەسێکی ترهات و بە هەمان شێوە گوتی: لە خەومدا بینیم بانگم داوە.

گوتی: تۆ دزی دەکەیت و دەستگیر دەکرێیت.
قوتابییەکانی سەریان سووڕما لە وەڵامەکەی.
ئیبن سیرین گوتی: یەکەمیان نیشانەی خێر و چاکەم لە ڕوویدا بەدی کرد، بە سوودوەرگرتن لە گوتەی پەروەردگار، ﴿ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ يَأۡتُوكَ رِجَالٗا ﴿٢٧﴾ ﴾ (الحج) «بانگەوازی خەڵک بکە بێنە زیارەت، بە پیادەیی و بەسواری».
دووەمیان نیشانەکانی خراپە و تاوانم تێدا بەدی کرد، گوتەی پەروەردگارم بەسەردا جێبەجێ کرد ﴿ ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلۡعِيرُ إِنَّكُمۡ لَسَٰرِقُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾ (یوسف)، «جارچییەک جاڕی ڕاهێشت: کاروانینە ئێوە دزیتان کردووە».
هەندێک بابەت هەن هەموان نایبینن، خەونی عەزیز بە بێبارانی و قاتوقڕییەوە، ئەمە خەونی پادشا و بەرپرسانە، لەوانە خەڵکانی ئاسایی ئەمجۆرە لە خەو نەبینن. جارێک عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر خەونێکی بینی، پیاوێکی نارد بۆ لای سەعیدی کوڕی موسەیب پێی گوت، خەوەکە بۆ سەعید بگێڕەوە، بەڵام بڵێ خەونی خۆمە، نەک عەبدوڵلا... کابرا دوای ئەوەی خەونەکەی گێڕایەوە، سەعیدی کوڕی موسەیب وەڵامی دایەوە:
کەسێکی وەک تۆ ئەم خەونە نابینێت...
پێم دەڵێیت ئەمە خەونی کێیە یان پێت بڵێم؟
کابرا گوتی: تۆ پێم بڵێ.
سەعید: ئەم خەونە خەونی ئیبن زوبەیرە.
عەبدوڵلا لە خەویدا بینیی شەڕ لەگەڵ عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان دەکات و شکستی خواردووە...
چوار مێخی پێدا داکوتیوە...
سەعید خەونەکەی لێکدایەوە بەوەی عەبدولمەلیک، ئیبن زوبەیر

دەکوژێت.

دوای ئەو چوار لە کوڕەکانی جێگەی دەگرنەوە.

دواتر ڕووداوکە بەمشێوەیە ڕووی دا، عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر لەسەر دەستی حەجاجی کوڕی یوسف کوژرا.

دواتر هەریەک لە کوڕەکانی عەبدولمەلیک، سولەیمان و هیشام و وەلید و یەزید بوونە جێنشین.

## وانەی سێیەم

بەرزەخ وەک ئەوەی زانایان ڕاڤەیان کردووە قۆناغێکە لەنێوان مردن و زیندووکردنەوەدا بۆ حیساب، گەرچی نکۆڵیکردنی سزای ناو گۆڕ و مرۆڤ لە میللەت ناباتە دەر، وەک ئەوەی جمهوری زانایان گوتوویانە لەو بارەیەوە، دەیان و بگرە سەدان دەق ئاماژە بە حەقیقەتی سزای گۆڕ دەکەن، کە بە هیچ شێوەیەک دەرفەتی ڕەتکردنەوەی نییە، گۆڕ یەکەمین مەنزڵگەی قیامەتە، یان باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت، یاخود چاڵێکە لە چاڵەکانی دۆزەخ، ئەوانەی بە ناوی عەقڵەوە سزای گۆڕ ڕەت دەکەنەوە، جگە لە بێئاگایی سەرمایەکی تریان نییە. بەوەی گوایە کاتێک ئێسکە کۆن و پروتکاوەکان دەبینین، دەڵێن: کوا سزا و پاداشتی نێو گۆڕ؟ بێئاگا لەوەی پێوەندییەکی توند هەیە لەنێوان ڕۆح و جەستەدا.

بەپێی ئەو قۆناغەی مرۆڤی تێدایە کەم و زیاد دەکات.

مرۆڤەکان بە چەند قۆناغێکی جیاوازدا تێدەپەڕن، ئەم قۆناغە جیاوازە بە جیاوازی پێوەندیی نێوان ڕۆح و جەستە.

مرۆڤ بە چەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت و چەند قۆناغێکی تر دەبینێت، دەکرێت قۆناغەکانی گەشەی مرۆڤ بکەین بە چەند بەشێکەوە.

یەکەم: قۆناغی عەدەم، بریتییە لە قۆناغی پێش دروستبوونی ئادەم.

واتە ئەو قۆناغەی مرۆڤەکان بوونێکیان نەبوو لەنێو زانستی پەروەردگاردا نەبێت.

قۆناغی گەردیلە: واتە ئەو قۆناغەی تێیدا پەروەردگار ڕۆحی تەواوی مرۆڤەکانی بە یەکجار دروست کرد، هەمووان گەواهییان دا بە خودایەتیی پەروەردگار، هەمووان گەواهیی حەقیان دا وەک ئەوەی قورئان ئاماژەی پێ دەکات:

﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ شَهِدْنَآ ﴿١٧٢﴾ ﴾(الاعراف).

«ئەوسایش کە پەروەرندەی تۆ لە پشتی عەولادی ئادەم زاروزێچی بەرهەم هێنا، لەسەر خۆیان شایەتی هەر بە خۆیان دا، گوتی: من پەروەرێنتان نیم؟ گوتیان بەڵێ، ئێمە لەوە ئاگادارین و گەواهی دەدەین» کاتێک پەروەردگار ویستی هەبوو مرۆڤێک دروست بکات، ڕۆحەکەی بە فریشتەیەکدا دەنێرێت بۆ لای مرۆڤ بۆ ئەوەی فو بکا بە ڕۆحیدا.

سێیەم: قۆناغی بوون و دەرکەوتن لەسەر زەوی.

ئەم قۆناغە لە ڕۆحکردن بە بەریدا درێژ دەبێتەوە تاوەکو مردنی کۆتایی دێت.

چوارەم: قۆناغی بەرزەخ.

ئەم قۆناغە لە مردنی مرۆڤەوە دەست پێ دەکات تاوەکو قۆناغی زیندووبوونەوە.

پێنجەم: قۆناغی جاویدانی هەمیشەیی.

دوای کۆتاییهاتنی لێپێچینەوە، مرۆڤ بەرەو بەهەشت یاخود بەرەو دۆزەخ، بێگومان پێوەندیی نێوان ڕۆح و جەستە بەپێی هەر

یەک لەم قۆناغانە دەگۆڕێن... لە قۆناغی عەدەمدا هیچ پێوەندییەک لەنێوان ڕۆح و جەستەدا نەبووە.

لە قۆناغی بوونی ڕاستەقینەدا خۆشی و سزا بۆ جەستەیە، ڕۆحیش شوێن جەستە کەوتووە. گەر بە توندی ئازاری مرۆڤێک بدەین، ئەوا لە ڕاستیدا جەستەی ئازار دەچێژێت.

بەهۆی پێوەندیی نێوان ڕۆح و جەستە ئەم ڕۆحە ئازار دەکێشێت، بەڵام لە گۆڕدا چێژ و سزا لەسەر ڕۆحە و جەستەیش شوێنی دەکەوێت. لە قۆناغی جاویدانیدا چێژ و سزا لەسەر جەستە و ڕۆحن پێکەوە... وەک یەکە.

## وانەی چوارەم

دادپەروەری خودا لەوەدایە، هەر سزایەک لە ڕەگەزی کارەکەیە، هەر کەس لە بەرزەخدا بەپێی ڕێژەی ئەو کارەی کردوویەتی سزا دەدرێت، هەر کەس پشتی لە قورئان کردبێت و لە ساتی نوێژە فەرزکاندا نوستێت، بە لێدانی سەر سزا دەدرێت.

لەبەر ئەوەی سەر جێگەی کڕنووشبردنە، ئەو سەرەی فەرمانی پێ کراوە بە کڕنووشبردن، بەو شێوەیە سزا دەدرێت.

پێموایە سزاکە بە کۆبوونەوەی نێوان دوو بابەت دەبێت، ڕەتکردنەوەی قورئان و خەوتن لە کاتی نوێژە واجبەکان،

ڕەتکردنەوەی قورئان، ڕەتکردنەوەی کارکردنە بە قورئان، نەوەک ڕەتکردنەوەی خوێندنەوەی ئەو کەسەی باوەڕی بە خودا و پەیامبەر و زیندووکردنەوە و لێپێچینەوە و ئەرکانەکانی ئیسلام جێبەجێ بکات بەبێ ئەوەی قورئان بخوێنێت.

خوێندنەوەی قورئان بەپێی پێگەی و دەوری مرۆڤە لە ژیاندا. خوێندنەوە قورئان بۆ دەسەڵاتدار حوکمکردنە بە قورئان.

ڕەتکردنەوەی قورئان بۆ خەڵکی ڕەتکردنەوەی حوکمی پەروەردگارە لە ژیانی ڕۆژانەیاندا، وەک ڕەتکردنەوەی پیاو بۆ ئایەتەکانی میرات و ستەمکردن لە هاوبەشەکان، ڕەتکردنەوەی بالاپۆشی لە لایەن ئافرەتانەوە.

خەوتن لە ساتی نوێژە فەرزەکاندا گەرچی کارێکی ئاسان نییە، ئەوەی لە فەرموودەدا بینیومە، سزاکەی جگە لەوە شتێکی تر نییە، وەک فەرموودەی خۆشەویست: (إذا نام أحدكم عن صلاه أونسيها فليصلها إذا ذكرها، لاكفاره لها إلا ذالك) «هەرکەس خەوی لێکەوتبوو یان بیری چوو هەر کات خەبەری بووەوە یان بیری کەوتەوە نوێژەکەی بکات، هیچ کەفارەتێکی نییە جگە لەمە».

فەرموودەی ئەو هاوەڵەی کە هاوسەرەکەی لای پەیامبەر گلەیی لێ کرد بەوەی لە نوێژی بەیانیدا دەخەوێت، هاوەڵەکەی پەیامبەر گوتی: ئەی خۆشەویستی خودا ئێمە هەر بە بنەماڵە خەومان قورسە.

خۆشەویست پێی فەرموو: هەر کات وەئاگا هاتی نوێژەکەت بکە.

گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە بۆ ئەوە نییە خەڵکی بە سانایی لە نوێژی بەیانی بڕوانن، تەنها وەک ئەمانەتێکی زانستی خستمە ڕوو، ئەو پیاوەی درۆ دەکات، تاوەکو ئەوەی دەگاتە لووتکە ئازاری خنکان، سزایەکی گونجاوە. شوێنی ئەنجامدانی درۆکە سزا دەدرێت.

زیناکاران لە جێگەیەکی گەرمدا بە ڕووتی کۆ دەکرێنەوە، سزا دەدرێن، دامێنیان کە زینایان کردووە بە ئاگر سزا دەدرێ.

سووخۆر دەخرێتە نێو ڕووبارێک خوێنەوە، چونکە دەم شوێن و ئامرازی خواردنی سووە.

## وانەی پێنجەم

دەخیلت بم! هیچ کات گومانت لە میهری پەروەردگار نەبێت.
پێش میهرەبانییەکەی لە بیری نەکەیت.
خودایەکی دادپەروەرە و ستەم ناکات.

لەم فەرموودەیەدا میهر و دادی پەروەردگار بە ڕوونی دەردەکەوێت. دادپەروەری لەوەدایە، پەروەردگار مافی بەندەکان وەردەگرێتەوە، کاتێک بەزەییت بە درۆزندا دێتەوە، لە بیری نەکەیت درۆکردن چی کردووە لە ژیانی خەڵکیدا.

ئابڕووی چەندین مرۆڤ بەهۆی درۆوە شکا، چەندین ماف بەهۆی درۆوە خوران، بەهۆی درۆوە چەندین ئاشووب هەڵگیرسان، چەندین ماڵ ڕووخان، چەندین خوێن ڕژان، پێتخۆشە بەبێ لێپێچینەوە و سزا دەربازیان بێت؟ کاتێک سۆز و بەزەییت بەرانبەر سووخۆر دەبێت، لە یادی نەکەیت سوو چەندە کارەساتێکی گەورەی لە کۆمەڵگاکاندا خولقاندووە. خەڵکانێکی هەزار چەندین جار پتر لە قەرزەکەیان پارەی سوویان داوەتەوە.

چەندین زەوی بەهۆی بێتوانایی لە گێڕانەوەی قەرز داگیر کران، چەندین پڕۆژەی گەورە بەهۆی سووەوە لە کار کەوتن. چەندین دەرفەتی کار بەهۆی سوو و سەرمایەی ترسنۆکە بە ڕووی گەنجاندا داخران، قازانجی زامنکراوی حەرام فەرز بکێت بەسەر قازانجی حەڵاڵی بچووکدا خۆشحاڵیت کەسانێک کە دەبنە مایەی دروستبوونی ئەم هەموو کارەساتە، بەبێ سزا دەربازیان بێت؟ لە بابەتی سزا و دادپەروەریدا میهرەبانیی پەروەردگار دەردەکەوێت، ئیبراهیم دەبێتە چاودێری کاری منداڵانی بێباوەڕان، واتای ئەوەی منداڵان بەهۆی بێباوەڕیی باوکیانەوە سزا نادرێن، بە هەمان شێوە پەروەردگار بە میهری خۆی سزای ئەو کەسانە نادات، کە پەیامیان پێ نەگەیشتووە. ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾﴾(الإسراء) «تا

پێغەمبەریـش نەنێریـن، جەربـەزە لەمـەڕدا نییـە.

بڕوانە ئەوانەی کاروباری چاک و خراپیان تێکەڵ کردووە.

پەروەردگار بە میهری خۆی چاوپۆشییان لێ دەکات

بـە بۆچوونێکـی پێچەوانـە، ئەوانـەی سـزا وەردەگـرن، کـرداری چاکەیـان نەبـووە،

بەڵکوو تـەواوی ژیانیـان لـە خراپـەوە بـۆ خراپـە، لـە تاوانـەوە بـۆ تـاوان

لە یاخیبوونەوە بۆ یاخیبوونێکی تر بەسـەر بردووە.

## وانەی شەشەم

دەبێت بزانین پـەروەردگار بۆچی قورئانی دابەزاندووە؟ قورئـان بۆ ئـەوە دانەبەزیـوە بەسـەر مردووەکاندا بخوێنرێت.

قورئـان هاتـووە بـۆ خەڵکانـی (لینـذر مـن کان حیـا). ئـەم قورئانـە دەسـتووری گشـتگیرە بـۆ مرۆڤایەتـی.

ئیسـلام دانامەزرێت بەبێ کارکردن بە ناواخنی ئیسـلام، نالۆژیکییە و هیـچ پێوەندیـی بـە ئیسـلامەوە نییـە، نوێـژ بکەیـن و ڕۆژوو بگریـن و حـەج بکەیـن و زەکات بدەیـن، پاشـان پەیـڕەو و بەرنامـەی ژیانمـان لـە خۆرهـەڵات و خۆرئـاواوە هـاوردە بکەیـن، یاخـود پرۆگرامێکـی ژیـان دوور لـە حوکمـی پەروەردگار بنووسـینەوە. پـەروەردگار کاتێک حوکمـی ناردووە، بۆ ئەوەیـە کاری پـێ بکرێت، بـە دڵمـان بێت، یاخـود نـا.

یاسـاکانی میراتـی بـۆ جێبەجێکـردن هاتـوون، پێمـان خـۆش بێـت یاخـود نـا، حەرامکردنـی سـوو و حەڵاڵکردنـی کڕیـن و فرۆشـتن فەرمانێکـی پابەندییـە لـە پـەروەردگارەوە.

پابەندبوون بە تەواوی یاساکانی پەروەردگارەوە،

ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی هاوسەرگیری.
مافەکانی دراوسێ،
مافی نزیکەکان و سیلەی ڕەحمی نێوان نزیکەکان،
قەبووڵکردنی قورئان بە تەنها واتای قەبووڵکردنی خوێندنەوەی نییە،
بەڵکوو زیاد لەوە قەبووڵکردنی حوکم و پابەندبوون بە فەرمان و نەهییەکانی قورئانەوە،
ئەوەی دەڵێت نوێژ دەکەین ڕۆژوو دەگرین و حەج دەکەین، زەکات دەدەین،
بەڵام سەرمایەداری دەکەین بە سیستەمی ژیان،
بە دڵنیایی ئەمەیش تێنەگەیشتنە لە ئیسلام.
هەرکەس یاسای سزادانی ئیسلامی قەبووڵ نەکات
بە دڵنیاییەوە تۆمەتی خراپدانانی تەشریعی داوەتە پاڵ پەروەردگار.
ئەوەی سیستەمێکی ئابووریی جیا لەوەی ئیسلام پشتگیریی دەکات (ئابووریی ئیسلامی گەر دروست بێت ئەم زاراوەیە بەکار بهێنین) ئەوانە بە بێئاگایی خۆی پێی وایە کە مرۆڤەکان زاناترن لە پەروەردگار بە دانانی یاسا و تەشریع.

## وانەی حەوتەم

درۆکردن پێش ئەوەی حەرام بێت، کەسایەتیی مرۆڤ لەکەدار دەکات.

عەرەبەکان تەنانەت لە سەردەمی جاهیلیدا خاوەنی خووی ڕەسەن بوون، ئەبوجەهل ئەو کەسایەتییە نەخوازراوە، کاتێک پێشنیاری ئەوەیان کرد، هێرش بکەنە سەر ماڵی موحەممەد، لە

وەڵامدا دەڵێت: دەتانەوێت عەرەب بڵێن کە ئەبولحەکەم کچەکانی موحەممەدی ترساندووە.

کاتێکش زللەی دا لە ئەسمای کچی ئەبوبەکر (ڕەزای خودای لێ بێت)، شەرم گرتی و گوتی: ئەم هەڵوێستەم بشارنەوە بۆ ئەوەی عەرەبەکان نەزانن.

ئەبوسوفیان لەو کاتەنەی بێباوەڕ بوو، قەیسەر لە بارەی پەیامبەرەوە پرسیاری لێ کرد، ئەبوسوفیان ڕاستگۆیی و ئەمانەتپارێزیی موحەممەدی خستە ڕوو، گەورەیی مرۆڤ لەوەدایە، لەبەر پاراستنی سنوورەکانی پەروەردگار تاوان نەکات و چاکە بکەین لەبەر ڕەزامەندیی پەروەردگار.

تاقیی بکەوە، بە نیەتی باشەوە کاری حەڵاڵ بکە، پیاوەتیت زیاد دەبێت، حەرام کاریگەریی نەرێنی لەسەر ئابڕووی مرۆڤ دەکات، گەورەترین خراپە و تاوان لە ژیاندا ئەوەیە، مرۆڤ تاوان و خراپە دەرهەق بە خۆی بکات. خۆشەویست جوانی فەرمووە: پیاوێک ڕاستگۆیی دەکاتە پیشە و سەرمایەی خۆی، تاوەکوو ئەوەی لای پەروەردگار بە ڕاستگۆ ناوی تۆمار دەکات.

## وانەی هەشتەم

هۆشیار بە، هەمیشە سنووری ئابڕووی خەڵکی بپارێزە.
پەروەردگار پشتیوانیی ئەو کەسەیە کە پشتیوانی نییە.
چەکی ئەو کەسەیە کە چەکی نییە.
دەست بۆ ئابڕووی خەڵکی ببەیت،
دەست بۆ ئابڕووت دەبرێتەوە.
ئەم جیهانە قەرز و دانەوەی قەرزە.
بە ئابڕووبردنی خەڵکی
تاوان دەرهەق ئابڕووی خۆت مەکە.

لە بیری نەکەیت یوسفی ڕاستگۆ
بەهۆی داوێنپاکییەوە پلەی بەرز بووەوە.
لە چیرۆکی ئەوانی تردا پەند و وانەیەکی گەورەی تێدایە.

## وانەی نۆیەم

لە بارەی ڕووی زبری مالیکی خازنی دۆزەخەوە دەدوێین. پەروەردگار ئەو دەموچاوە مەترسیدارەی دروست نەکردووە لەبەر ئەوەی ناتوانێت وێنەیەکی قەشەنگ دروست بکات، هەموو کارێکی پەروەردگار حیکمەتێکی لە پشتەوەیە. دروستکردنی مالیک بەم شێوەیە لە لایەن پەروەردگارەوە زیادکردنی سزای ئەهلی دۆزەخە. مرۆڤ بە ڕوانین لە ڕووی قەشەنگ و خووی جوان خۆشحاڵ دەبێت، بە پێچەوانەوە بە ڕووی ناجوانان نیگەران دەبێت، هەر لەبەر ئەمە مالیکی بەم شێوەیە دروست کردووە، بۆ ئەوەی ئەو ڕۆڵە ببینێ کە لەپێناویدا دروست کراوە. دروستکردنی مالیک خازنی دۆزەخ بە شێوەیەکی جوان پێچەوانەی ئەرک و کاری ئەوە. بە پێچەوانەوە ڕەزوانی زێوانەی بەهەشت لە لووتکەی جوانیی قەشەنگییە بۆ ئەوەی دانیشتوانی بەهەشت بە بینینی خۆشحاڵ بن.

سەبارەت بە دونیا، جوانی و ناشیرینی لە دونیادا بەشی خودای پەروەردگارن.

لەنێوان بەندەکانیدا بەهۆی دادپەروەرییەکەوە کە هەیە
ئەدەب لە مەقامی پەروەردگاردا کاری بەندە ڕاسانەکانە.
ڕەخنەگرتن لە دروستکراو، ڕەخنەیە لە دروستکەر.
پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگار کە ناتوانایی بدرێتە پاڵ
بابەتی ڕزق و ڕۆزی ئەو بابەتەیە کە خەڵکی تێدایە جیاوازن
هەندێکیان هەژار و هەندێکی تریان دەوڵەمەند.

هەندێکیان خاوەن منداڵ و هەندێکی تریان بێوەجاخ.
هەندێکیان تەمەندرێژ و هەندێکی تریان تەمەنیان کورت.
هەندێک دڵخۆش و هەندێکی تر خەمبار
هەندێک جوان و هەندێکی تر ناجوان
هەر کەس جوانییەکی هەبوو با سوپاسی پەروەردگار بکات.
هەر کەس ناجوان بوو، با ئارام بگرێت.
دونیا سەرلەبەر تاقیکردنەوەیە.

## ئەو پیاوەی وشترەکەی ون کرد

موسلیم ڕیوایەتی دەکات، خۆشەویست فەرموویەتی: پەروەردگار زۆر دڵخۆشترە بە بۆنەی تۆبەی بەندەیەکی باوەڕداری خۆیەوە، لە پیاوێک کە کەلوپەلی خۆی لەسەر وشترەکەی بار کردبێ و پاشان دەست بە سەفەر بکات و بگاتە بیابانێکی کاکیبەکاکی و قاقڕ.

کاتی پشوودان بێت و لە بن سێبەری دارێکدا دابەزێت، کەمێک ڕابکشێ و خەو زۆری بۆ بهێنێ و چاوێکی بۆ گەرم بکا، وشترەکەی بۆی دەرپەڕێ و کاتێک وەئاگا بێتەوە، ئەم لا وشتر و ئەو لا وشتر هیچ دیار نییە. دەچێتە سەر بەرزاییەک و هیچ نابینێت، دەڕواتە سەر بەرزاییەکی تر، بەڵام ئەویش هیچ. لەسەر بەرزایی سێیەم دیسان هەر هیچ! هێند دەگەڕێ تا تینوێتی زۆری بۆ دەهێنێت، لەبەر خۆیەوە دەڵێ: دەڕۆمەوە بۆ جێگای خۆم، لێی ڕادەکشێم هەتا دەمرم. سەر دەخاتە سەر باسکی خۆی، بۆ مردن خۆی ساز دەکات، کاتێ وەئاگا دێتەوە (چی دەبینێ!) وشترەکەی بە بارەوە لە بەردەمیدا ڕاوەستاوە.

ئەویش هێندە خۆشحاڵ دەبێ (لە تاو شادی و دڵخۆشی خۆی قسەی لێ تێک دەچێ.) دەڵێ:

خودایە! تۆ بەندەی منی و من خوداوەندی تۆ.

(بەڵێ) هێندە دڵی خۆش و بەدەماخە لێی تێک دەچێت.
خودای مەزن زۆر لەو پیاوە خۆشحاڵترە،
کاتێ کە بەندەکانی تۆبە دەکەن.

## وانەی یەکەم

گەر هەموو دروستکراوەکانی پەروەردگار گوناه- بکەن و بێفەرمانیی خودا بکەن، هیچ لە موڵکی خودا کەم ناکات، گەر هەموو بەندەکانی پەروەردگار چاکە بکەن، هیچ لە موڵکی خودای مەزن زێدە نابێ، کە وابوو تاوانکردن هیچ زیانێک بە گەورەیی پەروەردگار ناگەیەنێت.

چاکەکردن هیچ سوودێکی بۆ پەروەردگار نییە، بەڵام ئەو خودایە هێندە بەسۆزە، سەرت لێی سوور دەمێنێ، هێندە بەخشندە و دڵاوایە کەس نازانێ ئەوپەڕی بەخششی خودا لە کوێدایە.

شەوان چاوی بەزەیی خودا لەسەر تاوانباری ڕۆژە، چاوەچاوە تۆبە بکەن، ڕۆژیش لەسەر تاوانباری دەمی شەوە، بۆ ئەوەی تۆبەی ڕاستی بکەن، گەر هێندەی چیاکانیش باری گوناهت لە لابێت، هیچ نەترسی، بڕۆ خودا بەخشندەیە. هەر کەس لە دەرگای خودا بدا، دەستبەتاڵ ناگەڕێتەوە، هەر کەس بە نەرمی بۆ لای بڕوات، ئەو بە تیژی بۆ لای ئەم دێت.

بەخشندەییە، بەخشینی زۆر زۆر خۆش دەوێ دڵاوایە و حەزی لە چاوپۆشی زۆر دێت، گوناهی تۆ چەند گەورە بێت، بەخشینی ئەو زۆر زیاترە. چاوپۆشی ئەو زۆر لە هەڵە و کەموکورتیی بەندەکانی زێدەترە، هەتا تۆ لە تەوبەکردن ماندوو نەبیت، ئەو بەردەوام لێت خۆش دەبێت. گەر گوناهت گەورەن، گەر شەیتانی خاپینۆک بە فێڵی خۆی کاری دزێو و ناڕەوای بۆ جوان کردی، لە بیرت بێت.

دیسان دەڵێم لە بیرت بێت
خودای مەزن چەند پێی خۆشە
لە دەرگەی بدەی.
چەند پێی خۆشە بانگی بکەی
پەروەردگارا! من گوناهبارم
لە تۆ ڕابکەم بۆ کوێ بڕۆم؟
پەنام نییە جگە لە تۆ
بەندە زۆرن بەڵام خودا یەک
ڕابوورد تەمەنم هەموو بە نافەرمانی
نەینوکی دڵم لە چەوتی ژەنگی هانی
هێشتا بە ئومێدی بەزەییم
چوون هەرگیز پێموانەبوو دوانی
هەر بە تاکم زانی
هێندە بەسە بۆ شۆرینی
گوناهانی ساڵانی دوور و ڕابردوو.
نەکەی شەیتان لە خشتەت ببا
ئومێدت بە بەزەیی خودا کاڵ بکات
نەکەی بڵێی: گوناهبارم، شەرمەزارم
بە چ ڕوویەک لە دەرگای ڕەحمەتی پەروەردگارم
خودا وەک خونکار و وەزیر و پاشایان نییە.
چەند ساڵ خزمەت، شەو نخونی، گیانفیدایی بە هەڵەیەک بشواتەوە
نەکەی هەرگیز بە پێوانەی پاشا و وەزیری سەر زەوی
سۆزی پاشای ئاسمانەکان پێوانە بکەی
چەند جوانی فەرموو مەولەوی

یەک زەرِرە شعوور هەیە پێتەوە
کە گوتیان خودا دەبرێتەوە.

دەڵێن جاری لەسەر زەوی پاشایەک هەبوو، سەگی هەبوو، ئەمما زۆر درِ، هەر کەسێک لە داورودەستەی بێفەرمانی کردبایە، دەکرا بە خۆراکی سەگان.

ئەم پاشایە وەزیرێکی باشی هەبوو، چەند ساڵ لە خزمەتی پاشا دەستەونەزەر بەردەوامِ بەرکاری پاشا بوو،

بەڵام جارێک، تاقە یەک جار بێفەرمانیی پاشا دەکات. برِیار دەدری بیکەن بە خۆراکی گەماڵ.

دەڵێت: قوربان دوو سێ حەفتە با ئازاد بم، دوایی بمکە بە خۆراکی سەگەکانت.

دەڵێت: باشە.

وەزیر دەرِوا بە سەگوانی پاشا دەڵێ:

با دوو هەفتە من لەجیاتی تۆ خزمەتی سەگەکان بکەم.

لەم ماوەدا خواردنی باش دەرخواردی سەگەکان دەدا... مۆڵەت تەواو، هەرچی پۆشاکی وەزیرە دایدەماڵن، وەزیر دەخەنە بەردەم سەگ، تاقە سەگێ دەم لە وەزیرەوە نادا.

پاشا دەڵێ: ئەها زانیم جادووت لە سەگەکان کردووە.

دەڵێت: نەخێر، بە چواردە رِۆژ خزمەتکردن وەفای خۆیان نیشان داوم.

بەڵام چەند ساڵ بە شەو و رِۆژ لە خزمەتی جەنابتدا بووم، هێندە وەفات بۆ من نەبوو، لە یەک تاوانم ببووری. بەڵێ! ئەمە ئاکاری پاشای سەر زەوی.

پاشای ئاسمانەکان جۆرێکی تر رِەفتار دەکات.
چەند ساڵ گوناه، گزیکاری، بێوەفایی

تاوانباری، هەزار هەزار تاوانی تر بە یەک تۆبە دەشواتەوە.
گەر ئێمە خۆمان لەو بە دوور نەگرین، ئەو دوور نییە.

## وانەی دووەم:

ئەم دونیایە جێگەی هۆکار و ئەسبابە، دەستگرتن بە هۆکارەوە مانای پشتنەبەستن نییە بە زاتی پەروەردگار، ئێمە بەرفەرمانی ئەوین دەست بگرین بە هۆکارەوە.

قەدەری خودا وا دەخوازێ گەر تاکە کەسێ لەبەر بەهێزیی ئیمانی دەستی بەربدایە لە هۆکار، ئەوا ئەو کەسە پەیامبەر دەبوو، چوون ئەو لە گشت کەسێک ئیمانی بەهێزتر بوو.

بەلام سەیر بکە، ئەو ڕۆژەی خۆشەویست لە مەککەوە بەرەو مەدینە کۆچی کرد، ڕێزانێکی زۆر شارەزای بە کرێ گرت، نەیگوت: خۆ من پەیامبەرم، هەر چۆن بێت پەروەردگار ڕێگەکەم نیشان دەدا و پێویستم بە هیچ کەس نییە، لە کاتی جەنگ زرێپۆش بوو، تا شمشێر کاری تێ نەکات نەیدەفەرموو: هەرچۆنێک بێت پەروەردگار لە شمشێری نەیاران دەمپارێزێت.

هەر کاتێکیش بەرەو غەزا ڕۆیشتبا، ڕێی دەگۆڕی.

دەزانی بۆ؟

تاکو دوژمن غافلگیر بکات.

نەیدەفەرموو: هەرچۆن بێت سەردەکەوم، ئیتر بۆچی نەخشە بۆ جەنگ بەکار بهێنم.

ڕۆژێک عومەر عەرەبێکی دەشتەکی بینی، وشترێکی گەڕی پێیە، هەردوو دەستی بە نزاوە

دەیگوت: پەروەردگارا، شیفای وشترەکەم بدە.

عومەر فەرمووی: تۆزێ قەترانی لێ بسوو، پاشان بە

ئومێدی پەروەردگارت بە، یانی هۆکار بەکار بهێنە و ئومێدت بە پەروەردگارت بێت.

جارێک عومەر ویستی بۆ شام بڕوا، بیستی پەتای تاعوون لە شام بڵاو بووەتەوە... لە ڕۆیشتن پاشگەز بووەوە، باوکی عوبەید ڕووی تێکرد و پێی گوت: گەورەم! تۆ لە چارەنووس ڕادەکەی؟

عومەر فەرمووی: لە چارەنووسێکەوە بۆ چارەنووسێکی تر.

گەر شوانێک ڕێی بکەوێتە تەنیشت کێوێک
لە بناری کێوەکەدا دوو دۆڵی گەورە ببینێت
یەکیان سەوز و پڕ لە ئاو بێت.
ئەوی تر هەر وشکانی بێت
وەک ناو لەپ بێ گژوگیا
ڕانەکەی خۆی لە کام دۆڵە دەلەوەڕێنی؟
خۆ هەردووکیان چارەنووسە!

پاش ماوەیەک لە هاوەڵێکی خۆشەویست ئەم فەرموودەیە دەبیستێت: هەر کات بیستتان، پەتای تاعوون لە شوێنێک بڵاو بووەتەوە ڕووی تێمەکەن، گەر پەتاکەیشی لە کن ئێوە بەربڵاو بوو، لێی ڕامەکەن.

عومەر کە ئەم فەرموودەیەی بیست، سوژدەی شوکری بۆ خودا برد و فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خودایە، کە قسەی هەق دەخاتە سەر زاری عومەر.

ئەو هاوڕێیە ئەگەر زۆر باش وشترەکەی ببەستایە و کەمتەرخەمیی نەکردایە و پشتی بە خودا ببەستایە، وشتر بۆ بەرەڵا دەبوو؟ کە وابوو تۆ بە ئەندازەی توانای خۆت، ئەسباب و هۆکارەکانت بەکار بهێنە و پاشان پشت بە خودا ببەستە.

وریا بە، وانەزانی هۆکار ئیتر هەموو شتە، لە کاتی جەنگ

شمشێر سەرکەوتن ناهێنێ، فرێدانی شمشێرەکەیش ئەوپەڕی بێئاوەزییە، ڕزق و ڕۆزی نەبەستراوە بە کارکردنەوە، بەڵام بێئیش لێی بکەوی، چۆپیی هەڵپەڕکێی نەزانیت هەڵگرتووە. کەمێ شرووب، دەنکە حەپێ، دەرزی، مایەی شیفای نەخۆش نییە، بەڵام هۆکارن بۆ شیفا.

یارمەتیدەر، بژێویدەر، نەخۆشچاکەر تەنها پەروەردگارە، بەڵام دونیا خانەی هۆکار و ئەسبابە، تۆیش هۆکار و ئەسبابی خۆت بەکار بهێنە و پشت بە پەروەردگارت ببەستە.

## وانەی سێیەم

خودای مەزن چاوپۆشی لە هەڵە دەکات
مرۆڤ کاتێک زۆر دڵخۆشە
یان ئەو کاتەی زۆر خەمبارە و بەپەرۆشە
بیر و ئاوەزی وەک پیویست لە کار نییە
خۆ گوێت لێبوو خاوەن وشتر
لە خۆشیدا دەیگوت: پەروەردگارا، تۆ بەندەی من، من خودای تۆم
ئەگەر لە کاتی ئاسایی وای گوتبایە کافر دەبوو.
تەماشای سۆزی خودا
پاکانە بۆ ئەو پیاوە دەکا
دەڵێ: قەینا لە خۆشیدا ئاگای لە دەمی خۆی نەما.
مەبەستمە شتێک بڵێم: هەر کات شتێکی نەشیاوت لە کەسێک بیست
فەتوای کافربوونی مەدە. لەوانەیە لێی تێکچووبێت، زۆر دڵشاد بێت، یان غەمگین بێت، من پاکانە بۆ ئەو کەسانە ناهێنمەوە کەوا

قسەی خراپ دەکەن،

بەلام دەلێم: ئێمەی مرۆڤ- هەوساری زمان و دلمان جارجار لە دەست دەردەچێت و بە باشی بۆمان ناگیرێ، وەک دەزانین پەیامبەرمان شا مامۆستای بیر و باوەڕی مرۆڤە، ڕەچاوی ئەو پیاوەی کرد و نەیفەرموو لە دین دەرچووە.

ئەی ئێمە چی؟

دەبێ ئێمەیش وەک ئەو وا بین

ئەم سەربوردەیە وانەیەکی تری تێدایە

کاتێ زۆر دلخۆشی پەیمان بە هیچ کەس مەدە

چوون لە کاتی دلخۆشیدا پیاو بەلێنی گەورە دەدا و دوایی لە دەستی نایەت و سەرکز دەبێت.

لە کاتی خەم و خەفەتیش خۆت لە هەڕەشەوگوڕەشە بپارێزە و پەنجەت لە کەس مەوەشێنە

دەمی خۆشی هەرە خۆش و خەفەتی زۆر بەسەر دەچن.

بیر لە کاتی دوای خەفەت و شادمانی بکەرەوە، لە کاردانەوەیش بە دوور بە.

## وانەی چوارەم

### نەقلی کوفر، کوفر نییە

کاتێ کەسێک نەقلی کوفرێک بۆ تۆ دەکا، تەماشا بکە بزانە هەر نەقلە یاخود پەسەندی ئەو نەقلە دەکا بیروبڕوا و نەقلی قسە تێکەل مەکە، بیستت کە پەیامبەرمان نەقلی کوفری ئەو پیاوەی کرد، خۆ دەزانین بەو قسەیەیش ڕازی نییە، قورئانی پیرۆز زۆر جار نەقلی کوفری کافرانی پێشوو دەکا لەوانە: ﴿ لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ﴿١٨١﴾ ﴾ (آل عمران).

خودا وتەی ئەوانەی بیست کە دەیانگوت: خودا هەژارە و ئێمە دارایـن.

دیسـان دەڵـێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ ...﴿٦٤﴾ ﴾ (المائـدە) «جـوو گوتیـان: خـودا دەسـتی بەسـتراوە».

ئێمە دەبێ بەگومانباش بین بەرانبەر بە مسـوڵمانان، تا بتوانین وتەکانیان بە چاکە لێک بدەینەوە، قسەی خەڵکی مانای زۆرە، تۆ باشەکەی لێ وەرگرە.

یەکێک لە پیاوچاکان فەرمووی:

گەر هەڤاڵێکی خۆم لەسەر کێوێکی هەرە بەرز، پڕ بە دەمی بقیڕێنی بڵێ: من خودای هەرە بەرزی ئێوەم،

ئەوا دەڵێم: ئەو ئایەتە دەڵێتەوە کە دەفەرموێ: ﴿ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾ (النازعات).

ئەگەر بینیم بیرە بە ڕیشیدا دەچۆڕێ

ئەوا دەڵێم: داخۆ کێ پێکی ڕشتبێ بە سەر ڕیشیدا.

## هاوەڵانی خەندەکلێدەر

پێشەوا موسلیم ڕیوایەت دەکات، خۆشەویست فەرموویەتی: لە سەردەمی کۆندا پاشایەک هەبوو، جادووگەرێکیشی هەبوو، کاتێ کە جادووگەر پیر بوو بە پاشای گوت: من خەریکە بێهێز دەبم، لاوێکم بۆ بنێرە با فێری جادوو و سیحری بکەم. لاویان بۆ نارد، لە ڕێگەدا ڕاهیبێکی فەلەی بینی، لە لای دانیشت و کەمێک قسەی لەگەڵ کرد.

قسەی ڕاهیب لەسەر لاوە کاریگەر بوو، هەموو ڕۆژێک کە بۆ لای جادووگەر دەهات، لای دەدایە لای ڕاهیب و گوێی لێ دەگرت، کە دەڕۆیشتە لای جادووگەر، جادووگەر زۆری لێ دەدا، بە ڕاهیبی گوت: من چی بکەم؟ پێی گوت: ئەگەر لە ماڵ لێت تووڕە بوون بڵێ: جادووگەرێک گیری داوم، گەر جادووگەر لێت تووڕە بوو، بڵێ لە ماڵ گیریان داوم.

ماوەیەک بەم جۆرەی ڕابوورد، ڕۆژێک لەسەر ڕێگە بینیی گیاندارێکی زۆر زەبەلاح ڕێگەی لە خەڵکی گرتووە، لاوە گوتی: ئەمڕۆ بۆ من دەردەکەوێ، ڕاهیب باشە یان جادووگەر؟

بەردێکی هەڵگرت و گوتی: خودایە ئەگەر ڕاهیبەکە لە جادووگەرە باشترە، بەم بەردە ئەم گیاندارە بتۆپێنە، با ڕێی خەڵکی والا

ببێت، بەردی تێگرت، گیاندار تۆپی، خەڵکی ڕێگەیان والا بوو. لاوە بەسەرهاتەکەی بۆ ڕاهیبەکە گێڕایەوە، ڕاهیب گوتی: ئێ کوڕی خۆم ئێستا لە لای پەروەردگار تۆ زۆر لە من بەڕێزتری.

خۆت دەبینی چەندە پلەت بەرز بووەتەوە؟ خۆت ئامادە بکە کە تووشی بەڵا و موسیبەت دەبیت، بەڵام هەر کات تووشی بەڵا و موسیبەت بوویت، ناوم مەبە.

لاوە هێندە پلەی بەرز بوو، زگماککوێر و پێستبەڵەکی چا دەکرد و چارەسەری کەلەلا و بیمارانی دەکرد.

دۆستێکی نزیکی پاشا هەردوو چاوی لە دەست دابوو، بیستی لاوێکی زۆر زیرەک چارەی دەردەداران دەکا، بە بارێک دیاریی گرانبەهاوە ڕۆیشت بۆ لای لاوە.

گوتی: گەر چارەم بکەی، ئەم بارە دیارییە بۆ تۆ.

لاوە گوتی: من هیچ کەس چارەسەر ناکەم، چارە تەنها لای پەروەردگارە.

گەر ئیمان بە خودا بهێنی، منیش لێی دەپاڕێمەوە چارەت بکا.

پیاوەکە ئیمانی هێنا، چاک بووەوە و ڕۆیشتەوە بۆ لای پادشا، وەک جاران بووە هاومەجلیسی پاشا.

پاشا پێی گوت: کێ چاوی چاک کردیتەوە؟

گوتی: خودام.

گوتی: جگە لە من خودای تر هەیە؟

گوتی: خودای من و خودای تۆ هەر (الله)یە.

گرتیان، هێندەیان لێ دا، تا لاوەکەی پێ نیشان دان.

لاویان هێنا، پاشا گوتی:

ئێ کوڕی خۆم، هێند زانا بووی زگماککوێر و پێستبەڵەک چارە دەکەی؟ هەرچیشت پێ خۆش بێت دەیکەی؟ گوتی: نەخێر، من

شیفای هیچ کەسێ نادەم، شیفا تەنیا لای خودایە. ئەویشیان گرت، هێندەیان لێ دا، تا ڕاهیبی پێ نیشان دان. ڕاهیبیان گرت، گوتیان دەبێ لە دینی خۆت پاشگەز ببیت... پاشگەز نەبوو، بە مشارێک لە تەوقی سەر دایان هێنا تا خوارەوە، بوو بە دوو بەش، پاشان دۆستەکەی پاشایان هێنایە ڕوو، گوتیان لە دینت پاشگەز ببە، گوتی: نابم... ئەویشیان وەک ڕاهیب لێکرد.

دوایی لاوەکەیان هێنا، گوتیان پاشگەز ببە! گوتی: نابم... دایان بە دەست سێ چوار سەربازەوە.

گوتیان: بیبەن بۆ سەر لووتکەی کێوێکی بەرز، لە بەرزایی کێوەکەدا داوای لێ بکەن پاشگەز ببێ، گەر پاشگەز بوو... ئەمە باشە، ئەگەر نا هەڵیبدێرن...

سەرباز بردیان هەتا سەر کێو، لاوە لە خودا پاڕایەوە: پەروەردگار! ئەمانە لەناو ببە، بە هەر جۆرێ خۆت پێتخۆشە، کێو دەستی کرد بە لەرزەلەرز، سەرباز هەپروون بە هەپروون بوون.

لاو هاتەوە بۆ لای پاشا.

پاشا گوتی: کوان سەربازان؟

لاویش گوتی: خودا کوشتنی.

ئەم جارە پاشا لاوی دایە کۆمەڵێکی تر، گوتی: بیەن بۆ ناو دەریا، داوای لێ بکەن پاشگەز ببێت، ئەگەر نەبوو بیخنکێنن.

بردیان تا قولایی دەریا، لاو دیسان داوای لە خودا کرد: پەروەردگارا! ئەمانە لەناو ببە، بە هەر جۆرێک کە پێت باشە، بەڵەم زوو زوو دەکەوتە لا، سەرباز هەموو کەوتنە دەریاوە.

دیسان لاوە گەڕایەوە.

پاشا گوتی: کوان سەربازان؟

لاویش گوتی: خودا کوشتنی.

دوایی گوتی: تۆ ناتوانی من بکوژی، هەتاوەکو خۆم دەڵێم نەیکەی.

گوتی: چی بکەم؟

گوتی: لە گۆڕەپانێکدا هەموو خەڵک کۆ بکەرەوە، بمبەستە بە دارێکەوە، لە تیردانەکەی پشتی خۆم تیرێک بهێنە بیهاوێژە و بڵێ: بە ناوی خودای لاوە، پاشان تیرم تێبتەقێنە، گەر وا بکەی من دەکوژرێم.

پاشا وای کرد، خەڵکی کۆ کردەوە، ناوی (اللە)-ی هاتە زمان، لاجانگی لاوی نیشان کرد، تیری تەقان، لاو قامکی لەسەر زامی لاجانگ دانا و گیانی دەرچوو، خەڵکی هەموو بە یەک سەدا هاواریان کرد: باوەڕمان بە اللە هێنا، باوەڕمان کرد بە خودای لاوە... دارودەستەی پاشا هاتن، گوتیان: قوربان ئەوە چیت کرد؟ ئەوەی کە وا لێی دەترسای بۆ خۆت کردت.

خەڵکەکە باوەڕیان هێنا.

پاشان لە گشت کۆڵانەکان خەندەکی مەزنی لێ درا، خەندەک پڕ دەکران لە ئاگر، هەر کەس پەشیمان ببایە، لێی دەگەڕان. هەر کەس لەسەر ئیمانی خۆی سوور ببایە، دەخرایە ناو ئاگرەوە، ژنێکی منداڵەبەری باوەڕداریان هێنایە، لێواری خەندەک لەبەر منداڵەکەی کۆشی خەریک بوو، خۆی کافر بکا، مەتۆلکە لێی هاتە زمان: دایە تۆ لەسەر هەقی، خۆڕاگر بە.

## وانەی یەکەم

تەماشای ئەم دونیا بکەن چەندە سەیرە!

لە شوێنی وا کەسی گومڕا سەرهەڵدەدا زۆر پێت سەیرە

کوڕی یەک لە گەورە پەیامبەران، لەبەر گومڕایی دەبێتە خۆراکی ئاو.

ژنی پەیامبەرێکی تر لەبەر کوفر، تووشی سزای گەلەکەی دێت.

باوکی پەیامبەرێکی تر چۆپیکێشی بتتاشانە، لە دوورەوە ورد دەڕوانی و چاوی لە کوڕی خۆیەتی دەیخەنە نێو ئاگرەوە.

لە شوێنی وایش باوەڕ و دین سەر هەڵ دەدا بە لاتەوە سەیرە.

لەو ئازەرەی کە بتتاشە ئیبراهیم لەدایک دەبێت.

لەنێو کۆشکی فیرعەونەکان موسا دەردێ.

لەناو پێخەفی فیرعەوندا ئافرەتێکی هەرە مەزن سەر هەڵ دەدات.

ئەو فیرعەونەی کە هەموو جار (من خودای هەرە بەرزی ئێوەم)، هوتافی بوو.

ژنەکەی خۆی لە دار دەدا، چونکە دەیگوت: (سبحان ربي الأعلى) پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگار

ئەو منداڵەی پاشا ویستی بیکا بە جادووگەری خۆی، بوو بە بانگخواز.

ئەو منداڵەی پاشا ویستی ئەو خەڵکەی پێ گومڕا بکا، بوو بە هۆکاری دینداری.

ئەو منداڵەی پاشا ویستی قاچی کورسییەکەی قایم بکا، تێکی شکاند.

ئەو منداڵەی پاشا ویستی لە سۆنگەی ئەوەوە هێزی خۆی بە خەڵک نیشان دا، بوو بە هۆکاری لاوازی.

ماڵەکان هەر بۆ ئەوە نییە کە بیژمێری.

ماڵەکان دڵیان تێدایە، دڵەکان بە دەست پەروەردگارە.

پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگار! کەسی وا هیدایەت دەدا کەس چاوەڕوانی ناکات.

زۆر کەسی تر گومڕا دەکا، تۆ پێتوایە چاکترین پیاوی سەردەمە.

## وانەی دووەم

مـن دەمـەوێ، تۆیـش دەتـەوێ، پەروەردگاریـش چـی بوێـت ئـەوە دەکات

کێ پێی وایە مێردمنداڵێک تەختی پاشایەک نابووت بکات؟

کـێ پێـی وا بـوو ئـەو حەمزەیـەی ئەوینـداری مەشـرووب ببـوو، ڕۆژێـک ببـێ بـە بـاوەڕدار، دواییـش شـێری پـەروەردگار؟

کێ پێی وا بوو کە ئەو کەسـەی کاتی ئوحـود هێزی مسـوڵمانی شـکاند، ئیمـان بهێنێ و ببێ بـە شمشـێری خـودا؟

کێ پێی وا بوو کە عیکریمە (ڕۆژی ئازادکردنی مەککە، کوشـتنی ببوە مەراقی مسـوڵمانان)، دوایی بـاوەڕ بهێنێت و لە جەنگی یەرموکدا شـەهید ببێ؟

کێ پێی وا بوو کە ئەو کەسـەی گیانـی لـە سـەد مرۆڤ- دەسـەند، ڕێگای زەوی بۆ هەڵقرچـێ و نزیک ببـێ تـا بـەرەو بەهەشـت هەڵبفڕێ؟

کـێ پێـی وابـوو ئـەو عومـەرەی خـۆی لـە خورمـا خـودای بـۆ خـۆی دروسـت دەکـرد، پاشـان دەیخـوارد، ئیمـان دەهێنـێ و دەبـێ بـە دادگەرتریـن کـەس؟

کێ پێی وا بوو ئەو کەسـەی حەمزەی شـەهید کرد، باوەڕ دەهێنێ و هەناسـە لە موسـەیلەمەی درۆزن دەبڕێ؟

## وانەی سێیەم

تەماشای جەنگی پەروەردگار بکە، بزانە چی بە کار دەهێنێت؟

منداڵ پاشا لەناو دەبا!

پێشکە نەمرود فەنا دەکا!

ئاو کۆمەڵێک دەخنکێنێ!

دەریا سوپا لە بن دەهێنێ!
زەوی قارۆون هەڵدەلووشێ!
باران زاڵم دەفەوتێنێ!
بە با شارێک دەڕووخێنێت!
بە باڵندە سوپای ئەبرەهەی خەتابار دادەڕزێنێت!
تەماشـای چەکی پەروەردگار بکە، بزانە چین: منداڵ و بـا، باران، پیشـکە و دەریـا...
تەنیا دوو پیت بەکار دەهێنێت
هێندە بەسە بڵێ: (ببە)، هەرچی کارە سەرلەبەری تەواو دەکا
خودایە، بێگەردی هەر بۆ تۆ، سەرم لە کارت سووڕماوە...
کە وا بوو ئەی برای بەڕێز! خوشکی بەپێز! خودا بەهێزە
تۆیش خۆت بدە پەنای خودا با بەهێز بی
چۆنـی دەوێی تـۆ ئـا وا بـە، ئەویش بـۆ تـۆ بـە سـۆز دەبێ، نزاکانت گیـرا دەکا، چیت لێی بوێ پێتدەبەخشـێ
کەسێک پاشا لەناو ببا زۆر ئاسانە خەمی تۆیش لە ڕیشە بهێنێ.
کەسـێک سـوپا بڕووخێنـێ بـە ئاسـانی لـە دەسـتی دێ بێئومێدیت لەنـاو بـەرێ و لـە جێـی ئـەو متمانـە بچێنـێ.
ئـەو کەسـەی کـەوا بتوانـێ پاشـا و فیل و سـوپا بـەرەو دواوە ببـا لای ئاسـانە دەرد و ئـازاری تۆیـش لاببـا
خـۆت بـۆ پـەروەردگارت سـاغ بکـەوە و هـەر بـۆ ئـەو ببـە تـا خودایـش لـە هەمـوو کاتێکـدا بـە دەم تـۆوە بێـت.

## وانەی چوارەم

ئیمان و باوەڕ چەند سەیرن!
سەد ساڵ گوناه- سەد ساڵ کوفر، بێبڕوایی

لە یەکەم چرکەی ئیماندا تەواو دەبن

چ سەیرە! ئەو کافرەی ئیمان دەهێنێ، وا دەزانێ لە ژینی خۆی بۆ چرکەیەک کافر نەبووە

سەردەمێکی زۆر و درێژ پاشا لەنێو ئاپۆرای خەڵک وەک خودا وا بوو، دەیانپەرست

بە شەهیدبوونی منداڵێ وا ژێر ببوون، باوەڕیان هێندە پتەو بوو، لە خەندەکی پڕ لە ئاگر نەدەترسان، دەتگوت هەر لە منداڵیڕا باوەڕدار و مسوڵمان بوون، بۆ تاوێکیش بێدین نەبوون.

وەزیرەکە! بەشی زۆرینەی ژیانی خۆی بۆ پادشا ڕابردبوو، پاشای بە خودای خۆی دەزانی، تەنانەت بە خەڵکی دەگوت: خاوەن شکۆ خودای گشتمانە.

بەڵام هەر لە یەکەم دەمی بڕواهێنان بە مشارێک کەرتی دەکەن لە دین پاشگەز نابێتەوە

الله الله چەند شیرینە تامی ئیمان!

ساحیرەکانی لای فیرعەون

فیرعەون یەک یەک هەموویانی باش دەناسی

هەر یەک لە لایەکی میسر خزمەتکار و هەمەکاری شا فیرعەون بوو.

هەر بە هێمای پەنجەی فیرعەون وەک میزراح لە سووڕا بوون.

ملکەچ و گوێلەمستی بوون.

بەڵام کە ئیمان دەچێژن هەر هەموویان سوژدە بۆ خودای موسا دەبەن.

گەفی فیرعەون (دەست و پێتان هەموو دەبڕم، بە داردا هەڵتان دەواسم)، کاری نەکرد.

لە فیرعەون دەپاڕانەوە؟ لالاو پاپایان بۆ دەکرد؟ خونکی و کلکەسووتەیان کرد؟

نەخێر برا! گوتیان: برۆ چیت لە دەست دێ، چاو مەپۆشە! ئێمە تازە خودامان ناسی، خودای خۆمان نادەین بە هەزاری وەک تۆ.
سپێدە هەموو جادووگەر، ئێوارە هەموو شەهیدی بە دار کراو.
تەماشا حەزرەتی عومەر!
چەندە دژی ئیمانداران بوو
هەر کە خۆی ئیمانی هێنا، عەرزی خۆشەویستی خودای کرد: قوربان ئێمە لەسەر هەقین، ئەوان بەتاڵ؟
فەرمووی: بەڵێ.
گوتی: دەی مادەم ئاوایە با لەپێناو دینی خودا ڕیسوام بکەن، چ دەربەستم؟
بە یەک چرکە لە ناوەڕاست بیابانی بێبڕوایی بۆ قوڵایی دەریای ئیمان!
ئەم باوەڕە چەند سەیرە، چی لە هەستی مرۆڤ دەکا؟

## وانەی پێنجەم

زۆربەی زانایان یەکدەنگن کە کەرامات ڕاستە و هەیە، هەر کەسیش دانی پێدا نەنێ خۆی لە ڕاستی پێوار دەکات... ئێمەیش بەبێ هیچ دڕدۆنگی تەواو بڕوامان پێی هەیە، بەڵام خۆیشمان ناخەینە ناو هێڵی گێلی، هەرچەند ئایین پێمان دەڵێ: ئەم دونیایە سەرلەبەری بە دەست خودایە، بەڵام لە بەرانبەریشدا هانمان دەدا بە گوێرەی توانینی خۆمان دەست بدەینە هۆکارەکان، لەبەر ئەمە هەرکات باسی کەراماتمان لە لا کرا، ئەگەر هات و بە ڕشتە و سەنەدی ڕاستی پێمان گەیشت، ئێمەیش بڕوای پێ دەهێنین.
هەر وا بە سووک و ئاسانییش هەموو باسێک وەرناگرین، تا نەچینە یانەی گێلی جا بە سەنەدی دروست و تەواو، زۆر کەراماتی

مەزنمان پێگەیشتووە با بزانین کەرامات چییە؟ بریتییە لە کارێکی نائاسایی خودای مەزن لەسەر دەستی مسوڵمانە چاکەکاندا دەریدەخات، بەم پێناسە لەگەڵ پەرجوو (موعجیزە) جیاواز نییە، بەڵام کەرامات تایبەتە بە پیاوچاکان، پەرجوویش تایبەتە بە چینی پەیامبەران، ئەوەی لەو فەرموودەیەدا باسی کرا، کەراماتی ئەو لاوە بوو (کوێری زگماک، پێستی بەڵەک، دۆعای شفا)، کە زۆر لە پەرجووەکانی عیسای کوڕی مەریەم دەچوو با بچینە خزمەتی پێشەوا عومەر، کەرامەتێکتان بۆ باس بکەم: کاتێ سوپای مسوڵمانان وڵاتی میسریان ئازاد کرد، کۆمەڵێک هاتن بۆ لای عەمر، گوتیان بە عەمر: ئەم رووباری نیلەی ئێمە خوویەکی سەیری هەیە.

گوتی: چییە؟

گوتیان: سێزدەی ئەم مانگەیە، ئەگەر کچێکی زۆر لەبار نەرازێنین، وەک بووک تیفتیفەی نەدەین و باوکی کچە رازی نەکەین بیخەینە ناو رووباری نیل، نیل ناجووڵێ.

عەمر گوتی: نەخێر، چۆن شتی وا دەبێت؟ هەرچی عادەتی خراپە لە ئیسلامدا نابێ هەبێت،

سێ مانگ وەستان نیل نەجووڵا.

عەمر نامەیەکی نووسی و بۆ عومەر، باسی نیل و خەڵکی میسری تێدا نووسی.

عومەر لە وەڵامدا فەرمووی: تۆ راستەکەی لە ئیسلامدا جێگەیەک بۆ عادەتی خراپ بوونی نییە، وا نامەیەک دەنووسم بۆت، بیخە ناو نیل، خودا گەورەیە.

لە نامەکەدا ئاوای نووسی: لە بەندەی خودا عومەرەوە بۆ نیلی میسر! گەر تۆ بە هێز و بازووی خۆت دەجووڵێی ئەوا تۆمان ناوێت، گەر بە فەرمانی خودا جووڵە دەکەی، لە خودا داوا دەکەم

بە جوولەت بهێنێت، عەمر نامەی فڕێ دایە ناو نیلەوە، لەو کاتەوە نیل هەر دەڕوا.

یەکێکی تر لە کەرامەتەکانی عومەر ئەوە بووە، کە کاتی خۆی لە مەدینە زەوی لەرزی، عومەر بە قامچییەکەی خۆی لە زەویی دا، فەرمووی: بەسە زەوی! ئارام بگرە، ئەگەر عومەر دادگەر نەبێ، کێ دادگەرە؟ یەکسەر زەوی لە لەرزە کەوت.

یەکێکی تر، لە کەرامەتەکانی عومەر ئەوە بووە، کە جارێکیان پیاوێک هات بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوتی: قوربان دەستم هەر هەمووی برینە، کاتی خۆیشی هەر ئاوا بووم، چوومە خزمەتی عومەر و سکاڵای خۆمم لە لا کرد، دەستی هێنا و خستیە سەر دەستی من و فاتیحەی خوێند ئیتر چاک بووم. عەبدوڵڵایش وەک عومەری کرد، برین هەر ما، بە کابرای گوت: فاتیحە هەر فاتیحەیە، بەڵام دەستی عومەر کوانێ؟

با باسی کەرامەتێکی عەبباسی مامی پەیامبەر بکەین:

سەردەمی پێشەوا عومەر، ساڵی ڕەمادە، وشکەساڵی دونیای ماڵی... عومەر بۆ نوێژەبارانە ڕۆیشتە دەرەوەی مەدینە، عەبباسیشی لەگەڵدا بوو، عومەر باڵی عەبباسی گرت، گوتی: پەروەردگارا، لەبەر عەبباس، لەبەر مامی پەیامبەرەکەت، ئێمە لە تۆ داوا دەکەین.

تۆ خۆت فەرمووت: ﴿ وَأَمَّا ٱلْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِى ٱلْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُۥ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا سَأَلْتُكَ سَأَلْتُكَ سَأَلْتُكَ ﴿٨٢﴾ ﴾ (الكهف)، (دیوارەکەیش هیی دوو کوڕیژگەکەی سێوی بوو لەم بازێڕە، لە ژێریدا گەنجێ هەبوو، سەر بەوان بوو، باوکیشیان لە مێرخاسان بوو). ئەو دوو کوڕەت لەبەر باپیرەیان پاراست، چونکە باپیریان زۆر باش بوو، لەبەر مامی پەیامبەرەکەت ئوممەتەکەی بپارێزە، ئێمە بەهۆی عەبباسەوە خۆمان لە تۆ نزیک دەکەینەوە، داوا

دەکەین پاشان ڕووی کردە خەڵکەکە و ئەم ئایەتەی بە گوێدا دان
﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ فَلَآ أُقِيمُ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ ﴾ (نووح)
«من پێمگوتن: داوای لێبووردن لە خودا بکەن، ئەو بێگومان زۆر لێبووردەیە، تا لە حەواوە بارانێکی پەڵەدەرتان بۆ بنێری.»

عەبباس وەستا، هەردوو دەستی بەرز کردەوە، بە دەم نزا و پاڕانەوەوە هۆن هۆن فرمێسک بە چاویدا دەهاتنە خواری.

ئاسمان بە هەور داپۆشرا، باران باری تا گەیشتە قولەقاپ و زەوی تەواو تێراو بوو.

خەڵکی هەموو بۆ لای عەبباس هرووژمیان کرد، پێیان دەگوت: پیرۆزە ئەی خاوەن پایە.

باسی کەرامەت زۆر زۆرە، بەڵام هێندەمان بەسە.

## وانەی شەشەم

ئاگر بە چێژ، بەو شتانەی لە لای نەفس زۆر شیرینە تەنراوە، بەهەشت بە کول، بە دەرد و خەم پەرژین کرا

ڕێگای بەهەشت پڕ لە ترسە، ناڕەحەتە، مەگەر بۆ ئەو کەسانەی وا خودای مەزن بۆیان هەموار و چاک دەکا

سوننەتی خودا وای ویستووە، کە بڕوادار تووشی چۆرتم و بەلا بن.

پەنا بە خودام وا نەزانی، کە وا خودا ئیمانداران پشتگوێ دەخات و سەریان ناخات

خودای مەزن باوەڕداران پووختە دەکا، لە ژەنگوژاڵی گوناهان پاکیان دەکاتەوە.

پلەوپایەی بەرز و باڵا بۆ باوەڕدار تەرخان دەکات.

ئەو سەردەمەی دایە خەدیجەی خێزانی خۆشەویست، لەگەڵ

حەزرەت چوونە لای وەرەقەی نەوفەل، وەرەقە بە خۆشەویستی گوت:

ئای خۆزگە ئا لەو دەمەی خزمەکانت دەرتدەکەن، من زیندوو بام، تا یارمەتیی تۆم بدایە، پەیامبەر بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی: بۆ قەومەکەم دەرمدەکەن؟

وەرەقە فەرمووی: هەر کەسێک وەکو تۆ بوو، خزمەکانی لێی ڕاساون.

لێی توڕاون.

ئیبراهیم خرایە نێو ئاگر

یەحیا بە مشار کوت کرا.

ئەمەیش پەیامبەری خۆمان، هێندە لێی دەدەن خوێن ڕوومەتی دادەپۆشێت، بە دەست دەموچاوی دەسڕێ، دەڵێ: پەروەردگارا، ڕێگەی ڕاستیان پێ نیشان بدە، نەشارەزان.

ئەمانەی باسمان کردن، وەک ئەڵقەیەکن لە زەنجیرێکی زۆر درێژ. ئەم ئاینە بە خوێنبەخشین، فیداکاری، شەونخوونی، بە ماندووبوون، پێمان گەیشت، تەماشا بکە، بزانن ئومەیە چی دەکات بە بیلالێکی داماو و بێدەسەلات. بوخاری ڕیوایەت دەکا: خەباب فەرمووی: جارێ پەیامبەری ئازیز لە بن سێبەری کەعبەدا کە عەبایەکی لە خۆی پێچابوو دانیشتبوو، چووینە خزمەتی پێمان گوت: بۆ داوای سەرکەوتن ناکەی؟ بۆچی داوا لە خودا ناکەی سەرمان بخا؟

فەرمووی: لە سەردەمی زوودا لەسەر ئاین پیاویان دەگرت، لەناو زەوی توندیان دەکرد، لەسەر تا خوار بە مشارێک شەقیان دەکرد، یاخود بە شانەی ئاسنین گۆشت و ڕەگیان لە ئێسکەکان جیا دەکرد و دەیانکوشتن.

ئەو ئازار و کوشتنانە وای نەدەکرد لە دینی خۆیان پاشگەز ببن.
سوێند بە پەروەردگار! ئەم ئایینە سەر دەکەوێ، تا وای لێ دێ لە سەنعاوە تا حەزرەمەوت ڕێبوار لە هیچ کەس نەترسێ، تەنیا لە خودا نەبێت، مەڕداریش لە گورگ دەترسێ، بەڵام ئێوە پەلەتانە.

## وانەی حەوتەم

زۆر جار قوتابی باش لە مامۆستا ناودارترە، زۆربەی زۆری ئەو زانایانەی دەیانناسین، قوتابی زانایانێک بوون نایانناسین، گەر قوتابییەکت بوو، ناوبانگی لە تۆ زیاتر بوو، سەغڵەت مەبە، هەرچەندە ناوبانگی زۆر بێت هێشتا نەمامی دەستنوێژ و بەرهەمی چاکەی جەنابتە لەو چیرۆکەی باسمان کرد، قوتابییەکە پایەی لە پایەی مامۆستا زیاتر هەڵچوو.
ڕاهیبەکە لە کەژ و کێو خۆی حەشار دا، قوتابی لاو خۆی بە پێی خۆی دەهاتە بەردەمی پاشا، ڕاهیبەکە بە لاوی گوت: هەرگیز جێی من دیاری نەکەی، با نەمکوژن. قوتابی لاو خۆی شێوەی کوژرانی خۆی بە پاشاکە نیشان دەدا، هەرچەندە ڕاهیبەکەمان لەبەر لاوەکە ناسیوە، بەڵام دیسان با بزانین ڕاهیب مامۆستای لاو بووە و ڕێگەی ڕاستی نیشان داوە.
کەسمان تەواو کامڵ نابین، تا لە نەفسی خۆمان گەورەتر نەبین، هەتا خوازیاری هەق نەبین، با لای کەسێکی تریش بێ، هەتا بە دڵ بۆ دادگەریی تێنەکۆشین، ئیتر هەرکەس دەیچەسپێنێ بیچەسپێنێ، هەرگیز خەمی خۆتت نەبێ، ئایین دەڵێ: ئەو کەسەی چاکە پیشانی خەڵک دەدا، وەک خۆی بیکا ئاوەهایە.

## وانەی هەشتەم

یارمەتیی هەژاران بدە
هەرچەند کەم بێ
گەر بە لەتە نانێکیش بێ
برسی تێر بکە
ئازاری کەسێک سووک بکە
با بە دەنکە حەبێکیش بێ
بە یەک وشەی شیرینیش بێ
کێشە و هەرا کپ بکەرەوە.

بە دەم خەڵک و هەژارەوە بچی ئەوە خۆی بۆ خۆی نزایە، نەڵێی کاتی نزام دەگرێ، هەتا دڵ بە دەست نەهێنی، چۆن دەتەوێ لاشە و جەستە بە دەست بهێنی، ئەو لاوەی باسمان کرد خودا دەورێکی زۆر گەورەی پێ بەخشیبوو، هەموو خەڵکی لە پەرستنی پادشا بۆ خوداپەرستی بە ڕاستی گەڕاندەوە، تەماشا بکە ئەم کارە زۆر زۆر مەزنە، وای لێ نەکرد لەو خەڵکە خۆی تەریک بکا، هەمیشە لە خزمەت خەڵکدا کاری دەکرد، لەگەڵ بێنەوا و هەژاران، پیروپەککەوتە و ئاتاجان.

ئەو کەسانەی کە نوێنەری ئایین دەکەن، گەر خراپ بن ئیتر، خەڵکی چۆن پێی خۆشە خۆی لەوانە نزیک بکاتەوە، تا ڕێگەی ڕاست بەدی بکا؟

کەوا بوو با ئاکارباش بن، زمانشیرین، خۆش خولق و خوو

گرینگ نییە تۆ قورئانت، یان کتێبی فەرموودە سەحیحەکانت لە گیرفان بێت

دەزانی چی زۆر گرینگە؟ با قورئان و فەرموودەکان لە ئاکار و ڕەفتارتدا خۆ بنوێنن.

## ئەو ئافرەتەی ئامۆژگاریی زانایەکی کرد

پێشـەوای مەزنمـان مالیـک لـە کتێبـی (الموطـأ) ڕیوایـەت دەکا و دەفەرمـوێ: قاسـمی کـوڕی موحەمـەد فەرموویەتـی: ژنەکـەم مـرد، موحەمـەدی کـوڕی کەعـب هـات بـۆ تازیـە. فەرمـووی:

لـە نەتـەوەی ئیسـرائیلدا پیاوێـک هەبـوو زۆر زانـا بـوو، بلیمـەت و ئاکار چـاک بـوو، ژنێکی بـوو، زۆری بـە لاوە پەسـەند بـوو، ژنەکەیشـی ئـەوی زۆر خـۆش دەویسـت، ژنەکـەی مـرد، زاناکـە زۆر خەفەتـی خـوارد، وازی لـە گشـت شـتێ هێنـا لـە سـوچێکی ماڵەکـەی گۆشـەگیر بـوو، سـەردانی کەسـی نەدەکـرد، نـە خـۆی دەچـوو بـۆ میوانـی، نـە میوانیـش ڕووی تێدەکـرد، ژنێـک ئـەم باسـەی بیسـتەوە، چـووە لای ماڵـی.

گوتی: پرسی شەرعیم هەیە.

کەس نییە وەڵامم پێ بداتەوە، دەبێ هەرچۆنێک بێت بیبینم.

پاسەوان چوو بۆ لای زانا.

گوتی قوربان: چەند ڕۆژێکە ئافرەتێک لێرە دانیشتووە، ناڕواتەوە.

دەڵێ: هەر دەبێ بیبینم.

گوتی: باشە.

ڕێگەیان دا چووە ژوور.

گوتی: هاتووم پرسم هەیە.

گوتی: چییە؟

گوتی: ماوەیەکی زۆرە هەندێ خشڵم لە دراوسێ بە سوور هێناوە لە لام بێ، چەند ساڵێکە وا لە لامە، ئێستا هاتوون داوای دەکەن، ئایا پێیان بدەمەوە؟

گوتی: ئەی چۆن؟ هی خۆیانە.

گوتی: ئاخر چەندین ساڵە هەر لای منە.

گوتی: هەرچەند لە لای تۆیش بێت، هەر ئەو ماڵەیە خاوەنی، هی ئەوانە، مافی خۆیان بدەرەوە.

ژنە گوتی: ئێ رەحمەتی خودات لێ بێت، ئەو ژنەی تۆ بەندەی خودا بوو، چەند ساڵ کابانی ماڵت بوو، خودا بەندەی خۆی بردەوە، ئیتر غەمباری بۆ چییە؟

## وانەی یەکەم

پەندێکی عەرەبی دەڵێ:

گشت شمشێرێک چرووک دەکا

گشت زانایەک هەڵە دەکا

گشت بەرێزێک خەتا دەکا

گشت ماقوڵێک تێدەکەوێت

ئێمەی مرۆڤ ئاساییە

شەمەندەفەری ئاکارمان

لە سکەی خۆی جارێ لادا

زۆر کەس هەیە

چارەی کێشەی خەڵکی لایە

کەچی خۆیشی کێشەی هەیە.

زۆر پیاوچاکی گەورە هەیە تاوان دەکا
پیاوی زۆر دڵاوا هەیە
جار جارە ڕژدی دەیگرێت
دەست قوچاوە.
زۆر پیاوی لەسەرخۆ هەیە
جارجار تووڕەن
بە یەک هەڵە سەدان چاکە لەناو مەبە.

شەرع دەفەرموێ: هەرکاتێ ئاو زۆر زیادی کرد، ئیتر هەرگیز پیس نابێت و بە بەردەوامی هەر پاکە، زۆر کەس هەیە لە بەخشیندا وەک دەریایە، لە چاکەدا شەپۆل دەدا، وەک بارانی مانگی نیسان دەبارێنێ، کەی ڕەوایە ئەگەر جارێ تووشی هەڵە هاتبن، چەپڵەیان لێ بتەقێنی و ناو و ناوبانگیان بزڕێنی؟ هاوەڵێک بوو ناوی حاتەبی کوڕی بەلتەعە بوو، لە جەنگی بەدر بەشدار بوو.

پەیامبەر دەیویست بڕوا مەککە ئازاد بکا، بە هاوەڵانی ڕاگەیاند: با جارێ ئەم باس و خواسە نهێنیی بێ. ئەم حاتەبە نامەیەکی بۆ کافران نارد، نهێنیی تێدا درکاند، جوبریل هات و باسی حاتەبی بەلتەعەی بۆ پەیامبەر گێڕایەوە. حاتەب نامەکەی بە ژنێک دابوو بیبا، فەرمووی چەند کەسێکی نارد نامەکە وەربگرنەوە. نامەکەیان هێنایەوە، سەرکۆنەی حاتەبیان دەکرد، حاتەب، گوتی: من پیاوێکم کەسوکارم لە مەککەیە. گوتم ئەگەر لەم کارەدا هاوکارییان بکەم، ئەوانیش لەگەڵ خزمانم نەرم دەبن. لە یاسای جەنگدا ئەمە خیانەتێکە هەر مەپرسە! عومەر بە پەیامبەر دەڵێت: قوربان با بیکوژین.

بەڵام پەیامبەر بەسۆز وەفادارە، ئەو کاتانەی لە بیر ناچێ حاتەب تێیدا تێکۆشاوە و هەوڵ و خەباتی حاتەبیش لەگەڵ سفردا یەکسان ناکات.

بۆیـە بـە عومـەر دەفەرمـوێ: حاتـەب لـە هاوەڵانـی بـەدرە، تـۆ چووزانی لەوانەیە خودای مەزن بە ئەهلی بەدری فەرمووبێ: بڕۆن چی دەکەن ئازادن، هەر عومـەر خۆی، هەموو قورئانی لەبەر بوو، کاتێ دەیخوێند لەسـەر ئەو ئایەتانەی وا مرۆڤ ڕادەچڵەکێنن زۆر دەوەستا.

کەچی ڕۆژی وەفاتی خۆشەویست لە مزگەوتدا هاتوچۆی بوو، دەیگوت: هەر کەس بڵێ پەیامبەر لە دونیا دەرچوو، خۆم دەیکوژم! پەیامبەر هەرگیز نامرێ، ئەو بۆ گفتوگۆ لەگەڵ خودا ڕۆیشتووە، وەکوو موسا دوای ئەوەی ئەبوبەکر ئایەتی:

﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ ﴿١٤٤﴾ ﴾ (عمران) «موحەمەد پەیامبەرێکە و هیچیتر نییە، لە پێش ئەویش زۆر پەیامبەر هاتوون و چوون، ئەگەر بمرێ، یان بکوژرێ لە ئیسلام پاشگەز دەبنەوە؟» ئیتر عومەر بۆی دڵنیا بوو کەس ناتوانێ بەر لە چارەنووس بگرێ.

پاشان فەرمووی: دەتگوت هێشتا ئەو ئایەتەم نەبیستووە.

کەی ڕەوایە ئەو زانیاری و تێگەیشتنەی عومەر هەیبوو لەمەڕ ئایینی ئیسلام و دەقی قورئان هەمووی لە بیر خۆمان ببەینەوە لەبەر کارێک تەنیا هۆکاری کارەکە خۆشەویستیی پەیامبەر بوو؟

## وانەی دووەم

نەکەی هەرگیز ئافرەتان بە کەم بزانی!

هەندێک لە نێرینەکان ژنان بە کەم دەزانن

بەڵام هیچ پیاوێک ئافرەت بە کەم نازانێ

هێندێ جاران تاقە ژنێ سەد پیاو دەهێنێ

لە هەندێ کێشە و ئاریشە ڕای ئافرەتێک

بارتەقای ڕای سەد پیاو دەهێنێ
ژن مرۆڤە، سۆزی ژنان زۆر بزۆزە
دڵی ئافرەت زۆر مەزنە
هەرگیز نەڵێی: ئافرەت لەبەر سۆزداریی خۆی بێ ئاوەزە.
گەر بێژین: ئافرەت سۆزی زۆر مەزنە، ئەمە پەسنە خۆ زەم نییە!
کەی ڕەوایە هەستیار و خۆشتەوی و بەسۆز
بۆ داشۆرین بەکار ببرێن؟
کێ گوتویە مرۆی بەسۆز کێشە لە ئاوەزی هەیە؟
گەر ئێمە ئاوا بڵێین
دەبێ لە پەسنی پیاواندا هەموو بێژین:
پیاو بێدڵە، سۆزی نییە
توورە و تۆسن و سەرکێشە
ئەمەیش نەک هەر پەسن نییە، بەڵکوو خوسپە، داشۆرینە.
کاری خودا بێهۆ نییە.
سۆز و ئاوەز، هەردوو لە پیاو و لە ئافرەت بەرجەستەیە
بەڵام لە پیاو ئاوەز زاڵە
لە ئافرەتان سۆز زاڵترە.

بۆیە بەشی زۆری سۆزی بە ئافرەت دا، چوون دەیەوی لە کایەی ژیان ڕۆڵێکی مەزن ببینن، مەزنتر لە حوکمکردن، لە قەزاوەت، دەیەوێ ئافرەت دایک بێت، ئەو منداڵە بەخێو بکا کە سبەینێ جڵەوی حوکم و قەزاوەت دەگرێتە دەست، پیاویش ئاوەزی زاڵترە، تا بتوانێ لەگەڵ نەهامەتیی ڕۆژدا خۆسازێن بێت، بەسەر کۆسپی ژیندا سەربکەوێ، قەلا و پەنای ئافرەتان بن.

لە هەر ماڵێ سۆزی ئافرەت

دڵی پیاوی نەرم کرد و
ئاوەزی پیاو دڵی ژنەکەی بەهێز کرد
ئەو خێزانە بەختەوەرن
تای تەرازووی هەردوو لایان یەکسان دەبێ
لە هەوراز و نشێوی ژیان تێناکەون
بە بەختیاری ڕادەبوێرن.
کتێبی ژیان هێندێ جار
وەک بیرکاری وشک و ڕەقە
هێندێ جاریش وەک
ڕۆمانی مەم و زینە، پڕ ئەوینە.
پیاوان تەواوکەری ژنانن، ژنانیش تەواوکەری پیاوانن.
هەر کاتێ پیاو هەستی کرد
لایەنی سۆز بەسەر ژنەکەیدا زاڵە
نابێ بە چاوی سوک و کەم لێی بڕوانێ
بەڵکوو دەبێ دڵی ڕابگرێ
ژنیش هەر کاتێ هەستی کرد
ئاوەزی پیاو تەواو زاڵە
نابێ وا بزانێ پیاوەکەی دڵی ڕەقە
وەک دڕندەی بێتە بەر چاو
بەڵکوو دەبێ وا بزانێ کە هەندێ جار
لە بەرانبەر هەندێ کاردا ئەگەر سۆز کەمتر بێ باشە.

## وانەی سێیەم

هەر چی مرۆڤی سەر زەوییە --جگە لە پەیامبەران-- کەم تا کورتێ تاوانبارن، هەر مرۆڤێ بە گوێرەی عەقڵ و ئاوەزی لە

گوناهـان تێـوە دەگلـێ، ئێمـەی مـرۆڤ تـاوان دەکەیـن، فریشـتە نیـن، لـە چینـی پەیامبەرانیـش نیـن، دەبـێ هـەردەم ئەمەمـان لـە بیـر بێـت، بـە تایبەتـی لـەو کاتانـەی لەگـەڵ خەڵکدا هەڵسـوکەوت دەکەیـن، دەبێ هەمـوو بـاش بزانیـن:

که ڕای خەڵکی لێک جیاوازە
ئاوەزیان لە یەکتر ناکات
تۆ شتێک بە باش دەزانی
لای من خراپ
لای من باشە، لای تۆ خراپ
دەبێ من بەهانە لە تۆ نەگرم
تۆیش بەهانە لە من نەگری
نابێ بە یەکترشکاندن لە بۆسەدا بین

سوفیانی کوڕی حسێن دەڵێ:

لای ئەیـازی کوڕی موعاویـە باسـی کەسـێکم بـە خراپـە کـرد، ئەیاز تەماشـای کـردم و پێـی گوتـم: لـە غـەزای ڕۆم بەشـداریت کـرد؟

گوتم: نەخێر.

گوتی: لە هیند و سند و تورک چی؟

گوتم: نەخێر.

گوتـی: باشـە بـۆ وڵاتـی ڕۆم و هینـد و سـند و تـورکان لـە دەسـت و زمانـی تـۆ هەمـوو ئەمینـن، بـەڵام بـرای هاوئاییـنت ئەمیـن نییـە؟ پاشـان ئەمـە لـە کوێ بـووە سـەرجەم خەڵـک یـەک ڕایـان بێـت؟ گـەر هەمـوو کـەس لـە هەمـوو شـتەکان هـاوڕا بـن، ئیتـر ئیجتیهـاد یانـی چـی؟ ئیجتیهـاد و جیاوازیـی ڕا و بۆچوونـی زاناکانمـان مایـەی ڕەحمـەت و بەزەیـی خـودان، ئەگـەر زانـای مـەزن ئەحمـەد لـە هەمـوو شـت لەگـەڵ شـافیعی هاوڕابایـە چـۆن دەبـوو بـە خـاوەن مەزهـەب؟ بـەڵام لەگـەڵ

ئەوەیشدا مامۆستا لە لای قوتابی هەر مەزنە و هەر سەروەرە، خۆ بەردەوام پێویست نییە مامۆستا و قوتابی یەکڕا بن و پێکەوە بن، بەڵام زاناکان هەمیشە خاوەن ڕێز بوون و بە چاکە باسی یەکتریان لە لای خەڵکی کردووە، ئیمام ئەحمەد دەفەرموێ: هەرگیز خۆراسان هیچ کەسی وەک ئیبن ڕاهەوەیهی بە خۆیەوە نەدیوە: هەرچەند لە زۆر شتیشدا لەگەڵمان ڕای جیاوازە، بەڵێ سروشتی خەڵک وایە ڕایان لە یەکتر جیاواز بێت.

لە کتێبی (سیر أعلام النبلاء)دا دەڵێ: یونس ئەلسەدەفی فەرموویەتی:

کەسم نەدیوە هێندەی شافیعی عاقڵ بێ، ڕۆژێک لە بارەی شتێکەوە گفتوگۆمان کرد، قسەکانمان لە یەک دوور بوو، ماڵئاواییمان لە یەکتر کرد، دوایی کە پێمگەیشتەوە دەستی گرتم و فەرمووی: باوکی موسا! ئێمە هەرچەند ڕامان جیا بێت، هێشتا براین.

## وانەی چوارەم

چیرۆکێکی ئامۆژگاری لە سەد وانە بەسوودترە، هەر لەبەر ئەمەیە کە سێیەکی قورئانی پیرۆز چیرۆکە، ئەو چیرۆکانەیش هەر بۆ خۆشی و کاتبەسەربردن نییە، بەڵکوو بۆ تەمێ و ئامۆژگارین.

ئەو کاتەی خودا ویستی باسی داوێنپاکیمان فێر بکات
سورەتی یوسفی نارد.
ئەو کاتەیش کە فێری خۆڕاگری کردین
باسی جادووگەرەکانی فیرعەونی ناردە خوار.
ئەو کاتەی ویستی پێمان بڵێ:
کە چۆن خودا نزا و دوعای بەندەی پاکی گیرا دەکا
باسی نووح و زەکەریای هێنا گۆڕێ.

ئەو کاتەی ویستی باسی ئەو گوناهبارانە بکا
که لە خزمەت پەیامبەردا قسەیان بەر قسە دەدا
باسی چێل و مانگای بەنی ئیسرائیلی گێڕایەوە.
ئەو کاتەیش ویستی باسی لەخۆدەرچوونی خاوەن نیعمەتەکان بکا
باسی ئەو پیاوەی بۆ کردین کە دوو باخی زۆر گەورەی بوو.
ئەو کاتەیش ویستی باسی چاکە و چاکەخوازی بکا
سەربوردەی ئیسماعیلی گێڕایەوە.
ئەو کاتەیش ویستی باسی سەرخستنی بەندەی چاک و پاکی خۆی بکا
باسی ئاگری ئیبراهیم و دەریای موسای گێڕایەوە.
هەر کە ویستی باسی ئەنجامی ڕژدی و دەستقوچاوی بکا
باسی خاوەن باخەکانی گێڕایەوە.
هەر کە ویستی باسی تۆڵەی خوداییمان بۆ بکا
باسی عاد و سەموود و قەومی لووت هاتە گۆڕێ.
بۆ ئەوەی فێری حیکمەت و دانایی بین
باسی لوقمانمان بۆ دەکات.
بۆ ئەوەی بزانین سەرەنجامی مرۆی چرووک و خۆبەزلزان چییە؟
باسی قاروون دێنە ناو باس
بۆ ئەوەی بزانین برای بە ڕاست چۆن یارمەتیی برای خۆی دەدا؟
خۆشەویستیی نێوان دوو برا باس دەکا.
باسی موسا و هاروون دەکا
بۆ ئەوەی بزانین جارجار برا ڕقی لە برا دەبێ
لە کەسی نزیکەوە پاشقول دەدرێ

باسی براکانی یوسف دێتە سەرباس
بۆ ئەوەی بزانین ئارەزووبازی چی بەسەر مرۆڤ دەهێنێ
باسی زلێخامان بۆ دەکا.
گەر بیەوێ دەسەلاتی خۆی نیشان دا
کە چۆن مردوو زیندوو دەکاتەوە
باسی گوێدرێژی عوزێر و
باڵندەکانی ئیبراهیم دەبنە سەرباس.
گەر بیەوێ پێمان بلێ:
ئەها من چەندە بە وردی سەربازی خۆم هەڵدەبژێرم
باسی تەیرەن ئەبابیل و تۆفانی نووح دەبنە سەرباس
گەر بیەوێ باسی ئەنجامی سەرپێچی رۆڵە لە باوکی خۆی بکا
باسی کەنعان کوڕی نووح دەکا.
گەر بیەوێ باسی ئێرەیی بکا
باسی قابیل لە پێشەوەی باسەکانە.
گەر بیەوێ باسی دەسەلاتداری نەفام بکا
فیرعەون و نەمرود سەرباسن.
بەلێ چیرۆک زۆر سەیر کار لە دلان دەکا
وەک دەبینی چیرۆک هۆیە بۆ ئامۆژگاری، بۆ رۆشنبیری و زانیاری.

لە پێش مندال بۆ گەورەکان، بۆیە هەرگیز پێت سەیر نەبێ ئەگەر بێژین: چیرۆکێک و هەزار وانە.

## وانەی پێنجەم

چیرۆکەکان سەرەخۆشی لە هەندێ مرۆڤ دەکەن ئەو باوکەی کە گیرۆدەیە بە دەست کوڕی خراپەوە.

چیرۆکی نووح لەگەڵ کەنعان
سەرەخۆشیی لێ دەکات و داخی دڵی دەسرەوێنێ
ئەو کوڕانەیش گیرۆدەی باوکی خراپن
چیرۆکی باوکی ئیبراهیم سەرەخۆشییان لێ دەکا.
بۆ ئەو پیاوانەی ژنەکانیان مۆتەکە و خۆرەی سەریانن
چیرۆکی پەیامبەر (لوط) خەمڕەوێنە.
بۆ ئەو ژنانەی مێردەکانیان بوونە بەڵا و سواری کەلی شەیتان دەبن و نایەنە خوار
چیرۆکی خاتوو ئاسیا خەمڕەوێنە.
ئەو کەسانەی لەش بیمارن، بێدەرمانن
چیرۆکی ئارامیی ئەیووب باری لەشیان بۆ سووک دەکا.
ئەو کەسانەی جگەرگۆشەیان ون بووە
باسی یەعقوب کەفوکوڵی دڵیان دادەمرکێنێ.
ئەو کەسانەی براکانیان لێ بوونەتە بەڵا
چیرۆکی یوسفی جوانخاس خەمڕەوێنی گشت کاتیانە.
ئەو کەسانەی بە دەست مامی خراپەوە گیرۆدە بوون
چیرۆکی موحەممەدی پەیامبەرمان دڵی ئارام دەکاتەوە.
گەر بە سەرەخۆشی ئەو چیرۆکانە ڕازی نیت
ئیتر چ کەسێ دەتوانێ باری خەمت لەسەر لابەرێت؟

بە پرتە و بۆڵەبۆڵکردن، ناڕەزایی لە ویستی خودا، باری خەمت سووک ناکەیت و گوناە- بۆ خۆت دەخولقێنێت، ڕازیبوونیش بە ویستی خودا، مردووت بۆ زیندوو ناکاتەوە، بەڵکوو پاداشتی ئەو دونیا و ئارامبوونی دڵت لێرە مسۆگەر دەکات.

## وشترەکەی ساڵحی پەیامبەر (سەلامی خودای لێ بێت)

پێشەوا ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا ڕیوایەت دەکات و دەفەرموێ: جابر فەرموویەتی: پەیامبەر دای بە لای حیجرا و فەرمووی: داوای موعجیزە مەکەن، هۆزی ساڵح داوایان کرد، پەروەردگار وشترێکی لە بەرد دەرهێنا، لێرەوە دەهات و لەوێوە دەچوو، هۆزی ساڵح بێفەرمانیی خودایان کرد و وشترەکەیان سەربڕی، ڕۆژێک وشترەکە هەموو ئاوی کانییەکەیانی دەخوارد و ئەوانیش لەبری ئەوە، هەموویان شیری وشترەکەیان دەخوارد و (بەشی دەکردن). وشترەکەیان سەر بڕی، خودای گەورە وەک تۆڵە بە دەنگێکی گەورەی سامناک لەناوی بردن، کەسیان نەمان، تەنیا پیاوێک نەبێ، ئەویش لە پەنای کەعبەدا بوو.

گوتیان: ئەو پیاوە کێ بوو ئەی خۆشەویست؟

فەرمووی: ئەبورِغال بوو، هەر کە لە مەککە هاتە دەرەوە، ئەویش بە دەردی هۆزەی چوو.

### وانەی یەکەم

لە کاتی ڕۆیشتن بۆ غەزای تەربوک پەیامبەر بە لای حیجرا تێدەپەڕێ، حیجر ئەو لادێیە بوو، کە هۆزی سەمود تێدا نیشتەجێ

بوو، هاوەڵانی پەیامبەر لە نزیک گۆڕستانێکی هۆزی سەمود بارگە و بنەیان لێخستبوو، لەو بیرانەی کە هۆزەکە ئاویان لێ دەخواردەوە، ئاویان بۆ خواردنەوە هێنابوو، ئاویان لە مەنجەڵ کردبوو، لەسەر ئاگریان دانابوو بۆ چێشتکردن هەویریشیان پێ شێلابوو بۆ نانکردن.

پەیامبەر ئەمەی بینی، ئاوەکانی پێ ڕژاندن، فەرمووی: هەویرەکانیش بدەن بە وشترەکانیان... پێی ناخۆش بوو مسوڵمان لە کانیاوی کافران ئاو بهێنن، پێی ناخۆش بوو ئا لەو ئاوەی کە کۆمەڵێک لێیان خواردبێ و دوایی بەر غەزەب و تووڕەیی خودا کەوتبوون ئەوانیش لێی بخۆنەوە، خۆشەویست پێمان دەفەرموێ: ئەم ئایینە یەک ئایینە، باوەڕ بە خودا، هەر باوەڕە لای هیچ یەک لە پەیامبەران جیاوازیی نییە، هەرچەندە لە بابەتی مامەڵە و چۆنێتیی خوداپەرستیدا، جیاوازییەک هەبێ، پێمان دەڵێ: مرۆڤ دەبێ خۆی لە ستەمکاران بە دوور بگرێ، لە پێشدا لە مردووەکان، پاشان زیندوو، پێمان دەڵێ: ئەم ئایینە بەتەمەنە، گشت سەردەمێکی بینیوە، هەق و ڕاستی هەرچەند جارجار لە بەرزی و نزمیی ڕۆژگار دیار نەمێنێ، بەڵام نامرێ و سەر دەکەوێ، پێمان دەڵێ: کاری بەتاڵ، زۆر و ستەم هەرچەند ماوەیەکی زۆریش بەردەوام بێت، بەڵام دەمرێ. باسەکەمان تەنیا باسی هەویر و مەنجەڵ نییە. باسی خۆدوورخستنەوەیە لە زووڵم و زۆر، لە بێدادیی و ستەمکاری.

## وانەی دووەم

دوایی پەیامبەر بردنی بۆ سەر ئەو چاڵاوەی وشترەکەی ئاوی لێ دەخواردەوە، ئەو ڕێگەیەی کە وشترەکە لێوە دەهات پێ نیشاندان، پاشان ئەو ڕێگەی لێی دەردەچوو، فەرمووی پێیان،

ئاوەکە کرابووە دوو بەشـەوە: بەشێک بۆ هۆز و بەشـێک بۆ وشتر. ڕۆژێک وشـترەکە هەمـوو ئاوەکـەی دەخـوارد و ڕۆژێک ئـەوان ئـەو ڕۆژەی وا ئاوەکە بەشـی وشترەکە بوو، ئـەوان شـیری وشترەکەیان دەخـوارد و شـیری ئەوەنـدە زۆر بـوو، بەشـی هەموویانـی دەکـرد، بـەڵام دەڵێی چی! هێندێ مـرۆڤ هـەر بە میزاج شـەڕاویە، هیوایەتـی ئاژاوەیـە.

لەجیاتیـی ئـەوەی شـوکری خـودا بکـەن، لەجیاتیـی ئـەوەی هەرهەمـوویـان بـاوەڕ بـەو پەیامبـەرە بکـەن کە خـودا بـە پەرجـووی ئـەو لـە تاتەبەردێکی مـردوو وشـترێکی زینـدوو دروسـت دەکا، هەمـوو یەکدەنـگ ڕاسـت دەبنـەوە وشـترەکەیان سـەر دەبـڕن، کارەکەیشـیان گەورەکەیـان پێـی هەڵدەسـێ، کـە پیاوێکـی دەموچـاو سـوور بـوو لـە فەرموودەیەکدا کـە پێشـەوا ئەحمـەد لـە موسـنەدا ڕیوایەتـی دەکات... پەیامبـەر بـە عەلـی دەفەرمـوێ:

دوو پیاوی زۆر بەدبەخت و چارەڕەشت پێ نیشان دەم؟

گوتی: بەڵێ.

فەرمووی: ئەو پیاوە سوورکەڵەی وشترەکەی سەر بڕی و

ئـەو پیـاوەی بـە شمشـێرەکەی لێرە دەدا (ئامـاژەی دا بـە سـەری عەلـی)، هەتـا خوێن ئێرە تـەڕ دەکا (ئامـاژەی دا بـە ڕیشـی عەلـی).

## وانەی سێیەم

دوای ئـەوەی هـۆزی سـەمود وشـترەکەیان سـەر بـڕی، پەیامبـەر سـالح پێـی گوتـن:

سێ ڕۆژی تر عەزەبـی خـودا هـەر هەمووتـان لەنـاو دەبـا، ڕۆژی سـێیەم تۆڵـەی پـەروەردگار هـات و هـەر هەموویانـی سـەکەت کـرد، تەنانـەت ئەوانەیشـیان لـە مـاڵ نەبـوون، یـان لـە لادێیەکـی تـر بـوون

تیاچوون، تەنیا ئەبورغال نەبێ، لە مەککە بوو ئەو مایەوە تا لە مەککە هاتە دەرێ، هەر هاتە دەر عەزابی خودای گەیشتە سەر.

## وانەی چوارەم

کات پیرۆزە لە دەستی مەدە
شەو و ڕۆژ بە بەردەوامی لە هاتوچوونن
خەڵکیش باشتر گوێ لەو ئامۆژگارییە دەگرن
کە ڕووداوێک، بەسەرهاتێکی تێدا ڕووی دابێ
پەیامبەران هەرگیز کاتیان بە فیڕۆ نەداوە
هەمیشە لە جێی خۆی و
لە کاتی خۆی ئامۆژگاریی خەڵکیان کردووە
سەیر بکە! پەیامبەری خودا هەر کە زانی
سوپاکەی ئەو بە ناو حیجرا تێپەڕیون
زۆر بە وردی باسی حیجری بۆ سوپاکە گێڕایەوە
وا نەزانی هەر بە دەم بوو، نەخێرا!
تەنانەت ڕێگەی هاتوچوونی وشتر
بیر و کانی، هەر هەموویانی نیشان دان
تا بە باشی لە مێشکیاندا بچەسپێت و لە بیریان نەچێتەوە
کاتێ کە وا باران دەبارێ، ئەوە هەلە بۆ ئەوەی باسی سۆز و ڕەحمەتی خودا بۆ خەڵک بکەین

کاتێ یەکێ ئەمری خودا بەجێ دەهێنێ و ماڵئاوایی یەکجاری دەکا، هەلە بۆ ئەوەی بە خەڵک بڵێین کەس نامێنێ، جگە لە خودا. کاتێ کە ژن مارە دەبڕین، هەلە بەو خەڵکە بڵێین: سەیری سۆزی خودا بکەن، هەر لە خۆمان ئافرەتانی خوڵقاندووە بۆ حەسانەوەی هەمووومان، کاتێ منداڵ لە دایک دەبێت، باسی بەخشش و سۆزی

خودا بۆ خەڵک بکە، کاتێ شتێکی خراپ دەقەومێ، خەڵک فێری خۆڕاگری و گەڕانەوە و تۆبە بکە.

کاتێ مانگ دەگیرێ، خۆر دەگیرێ باسی دەسەڵاتی خودا بۆ خەڵک بکە، هەموو شتێ بە دەست خودایە، کاتی جێژنان بە خەڵک بڵێ: ڕۆژی جەژن بۆ ئەوەیە خوداپەرست بین، دوای جەژنەکان خوداپەرستی هەر دەمێنێ، دوای ڕەمەزان شەشەڵانە، دوای قوربانیش حەجکردنە.

کاتی قسە و ناوەڕۆکی باسکردنت با بەجێ بێ
لەسەر قەبران باسی شایی ناماقوڵە
لە کاتێکدا شەکراو دەخۆی، باسی مردن نابەجێیە
زۆر زیرەک و هۆشیار بە، هەر کاتێک و قسەی خۆی هەیە.

## وانەی پێنجەم

کەعبەی پیرۆز پێش ئیبراهیمیش هەر هەبووە، فریشتەکان دروستیان کرد، بەڵام لە کاتی تۆفانی نووحدا هەمووی ڕووخا تەنیا کەمێک لە بناغەی سووچەکانی دیار مابوو، بە گوێرەی ئەو بناغەیە ئیبراهیم بە هاوکاریی ئیسماعیل نۆژەنی کردەوە، ئەمە تەفسیری ئەو ئایەتەیە کە خودا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَـٰعِيلُ ﴿١٢٧﴾ ﴾ (البقره) (لەو دەمەیشدا کە ئیبراهیم و ئیسماعیل بناغەکەی ماڵی خودایان بڵند دەکرد.)

مسوڵمانان لەسەر ئەم ڕایە یەک دەنگن، ئەم چیرۆکەیش ڕاستی ئەم باسە دەسەلمێنێ:

ئەبورغال لە پەنای ئەو بناغانە دانیشتبوو، خودای گەورە لەبەر ڕێزی کابەی پیرۆز سزای خۆی پێ نەگەیاند تا هاتە دەر بەسەرهاتی هۆزی سەمود پێش سەردەمی ئیبراهیم بوو.

## وانەی شەشەم

ئەگەر خودا لەو دەمەدا ئەبورغال لە بن بناغەی کەعبە بوو، تووشی سزای خۆی نەکرد، ئەوە لەبەر ڕێزی کەعبە بوو، خودا ئاوا فێرمان دەکا، دەبێ ئێمەیش ڕێزی کەعبە و ئەو کەسانەی لەناو کەعبەن لە لامان بێت، مادەم خودا سزای کەسێکی بێباوەڕ لەناو کەعبەی پیرۆزە نادا، دەبێ ئێمەیش لەناو کەعبە نە بە جەستە و نە بە زمان سزای هیچ کەس نەدەین، بە تایبەتی مسوڵمانان کەعبە جێگەی سەیرکردنی ئافرەت نییە.

یەک لەوانەی کە تۆبەکارن دەڵێت: هۆی تۆبەکردنی من، ئافرەتێک بوو لەماڵی خودا.

نزیک کەعبە سەیری ئەو ئافرەتەم دەکرد، هات پێی گوتم: براله ئێمە لەوپەڕی زەوییەوە هاتووین لێرە گوناهی خۆمان داشۆرین، ئەی تۆ لەکوێ خۆت خاوێن دەکەیتەوە؟

کەعبە شوێنی ئەوە نییە، تۆ ناوبانگی تێدا پەیدا بکەی، گەر ناوبانگێکی هەقیش بێ چجای ناهەق، وەک ئەو کەڕە عەرەبەی هەر بۆ ناوبانگ پەیداکردن میزی دەکردە ناو زەمزەم.

هەرچەند ئافرەتی زۆر شیرین و چاوجوان ڕوو بکاتە ماڵی خودا، بەلام ئەوێ جێی دڵداری و پێداهەڵدان و غەزەل نییە.

قسەیەکی خۆشم لەم بارەوە لایە، با بۆتانی بگێڕمەوە:

دەڵێن جارێک ئافرەتێکی زۆر دەلال و بەرچاو و جوان بۆ حەجکردن ڕووی لە مەککە و ماڵی خودا کرد، بۆ یەکەم جار لە شەیتان ڕەجم عەمری کوڕی ئەبوڕەبیعە -کە شاعیرێکی مەزنی ئومەوی بوو-- چاوی پێی کەوت، هەر بە یەکەم دیتن دڵی لێی چوو.

لێی نزیک بووەوە، بە ئیشارەت، بە چاو، بە دەم داوای دڵداریی لێ دەکرد.

ئافرەت وەڵامی نەداوە، جاری دووەمی شەیتان ڕەجمکردن دووبارە خۆی لێ نزیک کردەوە و دەستی بە مۆزەمۆز کرد و دەیویست دڵی گراوییەکەی بەدەست بهێنێ.

بەڵام کچە بە سەریدا قیژاندی و گوتی: بڕۆ نەفام! ئێمە لە پەنا ماڵی خوداین، جاری سێیەمی شەیتان ڕەجمکردن، کچە ترسا دووبارە عەمر بێتە سەر ڕێ، بۆیە لەگەڵ براکەیدا هاتە دەرێ، عەمر ناچار لە دوورەوە سەیری دەکرد، کادووی دڵی بە با دەدا.

کچە گوتی:

بۆ پیاوی بێسەگ گورگ شاڵاو دەهێنێ.

شێرە پیاوی دی هەڵدەتۆزێنێ.

دوای ئەوەی ئەبوجەعفەری مەنسوور گوێی لەم چیرۆکە بوو گوتی: پێمخۆشە هەرچی کچی قورەیشە ئەم چیرۆکە ببیستێت.

با بێینە سەر باسی خۆمان:

کەعبە شوێنی سیاسەت و خوێنڕشتن و دەمەقاڵێی خەڵکی نییە، هەرچەندە حەجاج وای دەکرد.

زۆر بە کورتی با بەسەرهاتی حەجاج و عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرتان بۆ باس بکەم: کاتێ یەزید باوکی مرد و خۆی بە میراتگر دەزانی و دەسەڵاتی وەک میرات هەژمار دەکرد.

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر بەرانبەری وەستایەوە، پاش ماوەیەک یەزیدیش مرد.

کوڕێکی بوو منداڵ بوو، بەکەڵکی سەرکردایەتی نەدەهات، مەڕوانی کوڕی حەکەم بوو بە جێگەداری یەزید، عەبدوڵڵا ڕێی بۆ خۆش بوو، خۆی کرد بە حاکمی حیجاز، یەمەن، خوراسان و نیوەی

عێراق مەڕوانیش مرد، عەبدولمەلیک میراتگر بوو، عەبدولمەلیک بە خەڵکی شامی گوت: چ کەس لە ئێوە دەتوانێ چاری عەبدوڵلام بۆ بکا!

حەججاج گوتی: ئەزبەنیی من.

حەججاج حەوت مانگ عەبدوڵڵای لەناو مەککەدا گەمارۆ دا، هێندە خودانەناس بوو، بە مەنجەنیق بەربووە کەعبەی پیرۆز و هەمووی سووتاند. وردەوردە خەڵکی لە عەبدوڵلا تۆران، سوپاکەی ڕووی لە کزی کرد، عەبدوڵلا چوو بۆ لای دایکی، کچی حەزرەتی ئەبوبەکر بوو، گوتی: دایە! ئەو خەڵکانە لێمدەتۆرێن، تەنانەت منداڵی خۆیشم بەجێم دەهێڵن! سوپاکەم تەواو لاوازە، خۆت دەزانی داروودەستەی یەزیدیش کاتی خۆی چەند سەروەت و سامانیان دا لە بەرابەر وازهێنانم لە دژایەتیکردنی ناهەقدا، بەڵام نەمکرد، ئێستا چی بکەم؟

دایکی گوتی: ڕۆڵە تۆ خۆت دەزانی، گەر دەزانی لەسەر هەقی، بڕۆ تا دوا دڵۆپەی خوێن بجەنگە، ئەوانەیشی لەگەڵ تۆ بوون و کوژراون لەسەر هەقن.

گەر دەیشزانی تۆ ناهەقی و بۆ مەبەستی دونیاداری تێکۆشاوی، ئەوە کەسێکی خراپی، کوژراوی تۆ سەکەت بوون و هەموو لەسەر ناهەق بوون، ئەگەر دەیشڵێی: لەسەر هەقم، بەڵام خەڵکی وازم لێ دەهێنن و تەنیا ماوم، ئەوە قسەی پیاوی ئازا و زیرەک نییە، تۆ بەتەمای تا کەی بژیت؟ مردن بۆ تۆ هێژاترە هەتاکو ژین.

گوتی: دایە دەترسم بمکوژن و لاشەکەیشم بشێوێنن.

گوتی: ڕۆڵە ئەو بەرانەی سەر بڕراوە، ئەگەر سەد جار کەوڵی بکەن، ئینجا بە خۆی نازانێ.

گوتی: دایە بە خودا ڕای من ڕێک وەکو ڕای تۆ وەهایە.

من مەبەستم دونیا نییە، بۆ دونیا تێنەکۆشاوم، تەنیا لەبەر ڕەزای

خودا دەستم دایە شۆڕشکردن، من پێمخۆش بوو ڕات ببیستم، قسەکانت هێندەی تر بۆم ڕووناکی بوون، هەر لە ئێستاوە وابزانە من کوژراوم، خۆت ڕابگرە و نزای خێر بکە، عەبدوڵلا تا کوشتن جەنگا، حەججاج گرتی و سەری بڕی، سەریان نارد بۆ دەرباری عەبدولمەلیک، ناردی بە شوێن ئەسمای دایکی عەبدوڵلایشدا، ئەسما نەڕۆیشت.

حەججاج گوتی: ئەگەر خۆی دێت، ئەمە باشە، ئەگەر نا بە پرچ بەسەر ئەرزدا ڕایبکێشن، هەتا ئێرە.

ئەسما گوتی: وەڵلا نایەم، با بزانم کێ دەنێری بە پرچ و قژ ڕامبکێشی؟

حەججاج خۆی هات، بە ئەسمای گوت: کوڕەکەی تۆ ڕێزی کەعبەی لە لا نەبوو، بێڕێزی بە ماڵی خودا کرد.

ئەسما گوتی: درۆ دەکەی.

یەکەم منداڵی مسوڵمان لە مەدینە لە دایک بێت، عەبدوڵلا بوو، پەیامبەر بەو منداڵە زۆر خۆشحاڵ بوو، بە دەستی خۆی شیرینی لە مەلاشووی سویی مسوڵمانان هەموو یەکدەنگ (الله اکبر)یکیان کرد، شاری مەدینە دەلەرزی، ئێستاکە تۆ و سەربازانت بە کوشتنی دڵخۆش دەبن، ئەو کەسانەی بە بۆنەی لەدایکبوونی عەبدوڵلای کوڕمەوە خۆشحاڵ بوون، زۆر باشترن لەو کەسانەی بە کوژرانی دڵخۆش دەبن، دواییش بە حەججاجی گوت: سوێند بەو کەسەی موحەمەدی کردە پەیامبەری خۆی، گوێم لە پەیامبەر بوو فەرمووی:

لە هۆزی سەقیف خوێنڕێژێک و درۆزنێک پەیدا دەبن.

درۆزنەکە موختار دەرچوو.

هەرچی سەر دەهێنم و سەر دەبەم خوێنڕێژەکەیش تۆی.

حەججاج دوو لێوەی نەدرپوە و ئەسمای جێهێشت، دوایی

عەبدوڵـڵای کـوڕی عومەریـان تێگەیانـد، کـە ئەسـما لـە مزگەوتـە، عەبدوڵـڵا بـە هەڵـەداوان خـۆی پـێ گەیانـد، پێـی گـوت: دایـە ئەسـما! لاشـەی مـرۆڤ گرینـگ نییـە، ڕۆح گرینگـە، ڕۆحـی عەبدوڵـڵای کـوڕی تۆ لای خودایە، ئارامت بێ! گوتـی: ڕۆڵـە چـی وام لـێ بکا ئارام نەگرم، سـەری حەزرەتـی یەحیایـان نەبـڕی! بـە دیـاری بـۆ سـتەمکارێکیان نەنـارد؟ دوایـی ئەسـما قسـەیەکی کـرد، بـوو بـە پەنـدی پێشـینان گوتـی: کاتـی ئـەوە نەهاتـووە ئـەم سـوارە لـە ئەسـپ بێتـە خـوار؟ قسـەکە گەیشـتە حەججـاج و لـە حاڵـی خـۆی خەجاڵـەت بـوو، فەرمانـی کـرد لاشـەی بەدارکـراوی عەبدوڵلایـان هێنایـە خـوار.

ئەسـما بـە دەسـتی خـۆی عەبدوڵـڵای شـۆرد، کفنـی کـرد و لـە گـۆڕی نـا.

## هاجەرە و ئیسماعیل (سەلامی خودایان لێ بێت)

ئەم چیرۆکە زۆر درێژە و لقوپۆپ و وێستگەی زۆرە، پڕی لە پەند و وانەیە...

لە وانەکانی پێشوودا سەرەتا فەرموودەم دەهێنا و دوایی وانەکەم باس دەکرد، بەڵام لێرە پارچە پارچە فەرموودەکە دەهێنمەوە و دوایی وانەکەی باس دەکەم...

بوخاری ڕیوایەت دەکا:

پەیامبەر فەرمووی: یەکەم ژنێ پشتێنی بەکار هێنابێت، هاجەرە بوو، پشتێنی بەست --بۆ ئەوەی بوو جلەکانی هەڵبکێشێ و دوایی شوێنیان بکاتەوە -تا شوێنی خۆی بسڕێتەوە و خاتوو سارا پێی نەزانێت.

### وانەی یەکەم

پشتێنبەستن لای ئافرەتان بۆ گورجوگۆڵی بەکار دەبرا، پشتێنی دەبەست و جلەکانی لە پشتێنەکەوە دەهێنایە سەرەوە بۆ ئەوەی لە کاتی کاردا، جلکەکانی نەخشێن بەسەر زەویدا، بەڵام لە ڕاستیدا خاتوو هاجەرە بۆ ئەوەی نەبوو، ئیبراهیم دەیویست هاجەرە و ئیسماعیلی کوڕی لە سارە دوور بخاتەوە. کاتێ ئیبراهیم و هاجەرە

کەوتنە ڕێ، هاجەرە پشتێنێکی بۆ بەست، جلکەکانی شۆڕ کردەوە بۆ ئەوەی دوولۆ بێتەوە و بەسەر زەویدا بخشێت و شوێن پێی خۆی و ئیبراهیم لەسەر زەوی بسڕێتەوە، تاکوو سارا شوێنپێیان لێ هەڵنەگرێت و نەزانێ بەرەو کوێ ڕۆیشتوون.

ئەم چیرۆکە بۆ لای غیرەی نێوان هەوەکانمان ڕاکێش دەکات، جا پێش ئەوەی باسی غیرەی نێوان هەوە و ژنان بکەین، پێش باسی سارا و هاجەرە، دەبێ باسی گەورەیی سارە بکەین و پشتگوێی نەخەین، خاتوو سارە ئەو ژنە بوو، تاکە کەس بوو باوەڕی بە ئیبراهیم هێنابوو، ئەو ژنە بوو کاتێ حەزرەتی ئیبراهیم لە عێراق شاربەدەر کرا و بەرەو میسر ملی ڕێگای لێ گرتە بەر، بە سارەی گوت: جگە لە من و تۆ نەبێ، تاکە ئیمانداری ئەمڕۆ لەسەر زەوی نییە، خاتوو سارە ئەو ژنە بوو کاتێ کە فیرعەونی میسر گرتی، داوای لێ کرد شووی پێ بکا، بەڵام ئەو پەنای بە خودا گرت، خودا پاراستی، فیرعەونیش زۆر بەڕێزەوە هاجەرەی وەک دیاری بە سارە دا و ئازادی کرد، بەڵام مرۆڤ خاوەن سروشتی خۆیەتی، سروشت هەقی بە باوەڕدار و بێباوەڕەوە نییە، ئافرەت هەرچەند باوەڕدار بێ،

بەڵام هێشتا پیاوی زۆر لا خۆشەویستە، پیاویش هەرچەند خاوەن دین بێ، هێشتا ئەوینداری ژنە، ئەمە سروشتی مرۆڤە و خودا خۆی خوڵقاندویەتی و خۆیشی کارزان و لێزانە، ئایینیش بۆ ئەوە نەهاتووە، سروشتی مرۆڤ لەناو ببات، بەڵکوو دەیەوێ سروشتەکان پاک بکاتەوە و خەوش و خاڵی لێ بکاتەوە و لەسەر ڕێگەی ڕاستی دابنێ، غیرەی نێوان هەوەکانیش سروشتی هەموو ژنانە.

ئیبن حەجەر لە کتێبی (فتح الباري)دا دەفەرموێ: غیرەی ژنان

شتێک نییە بیانەوێ پەیدای بکەن، غیرە سروشتی ئافرەتە و لەگەڵ گیانی ئافرەتایە و کەس ناتوانێ غیرەی نەبێ.

پەروەردگار لەسەر سروشت هیچ مرۆڤێک دادگایی ناکا، بەلام لەسەر کاردانەوەی ئەو سروشتە لێپرسینەوەی لێ دەکرێ.

دەبێ لامان ئاسایی بێت، خاتوو سارەیش غیرەی هەبێ و دڵی لای مێردەکەی خۆی بێت.

چوون ماوەیەکی زۆر تاکە ژنی ئیبراهیم هەر سارە بووە.

ئێستا سەرەڕای ئەوەی ئیبراهیم ژنی دووەمی هێناوە، کەچی منداڵیشی لەم ژنە هەیە و سارەیش وەک جاران بێمنداڵە، بۆیە غیرە لەنێو دڵیدا ئاگرێکی داگیرساندبوو.

جا لەنێوان دوو هەوەدا چی ڕوو دەدات، لای سارە و هاجەرەیش ڕووی دا، ئەمەیش زۆر زۆر سروشتییە و هەر وا بە سەرپێییەوە باس دەکرێت و پێویست ناکا لێی ورد بینەوە.

با لایەک بە لای دایە عایشەدا بکەینەوە:

شەوێک پەیامبەری لا بوو، لەو شەوەدا سەوودەی خێزانی پەیامبەر قاپێک چێشتی بۆ پەیامبەر بە کارگوزارێکدا نارد تا مێردەکەی لێی بخوات و برسی نەبێت...

خاتوو عایشە کردی بە قاپدا و کێشای بە زەویدا و شکاندی.

هەندێ لە هاوەڵانی پەیامبەریش، چاویان لێ بوو ئەم هەڵسوکەوتە لەو کاتە چەندە ناخۆشە؟ بەلام سەرکردەی کارزان و پەیامبەری کانگای سۆز و دەروونناس و زانا و مەزن،

تەنیا بزە دەیگرێت و بە هاوەڵانی دەفەرموێ: بڕوانن دایکتان غیرە گرتی!

پاشان بە عایشە دەڵێ: قاپێکی ساغ بۆ سەودە بنێرەوە.

کارەکە کۆتایی پێ دێ.

## وانەی دووەم

**پاداشت بە گوێرەی کردارە:**

کەمێک باسی غیرەی خاتوو سارامان کرد، با هەندێکیش باسی ئاکاری جوان و خۆشخوویی ئەو ژنە بکەین، دوای ئەوەی فیرعەونی میسر خاتوو سارەی گرت و داوای لێ کرد شووی پێ بکا، خاتوو سارە بە گوێی نەکرد، بە ئیرادەی خودای مەزن فیرعەون داوای لێبووردنی لە سارا کرد و خاتوو هاجەرەی وەک دیاری پێ بەخشی.

بە گوێرەی دابونەریتی ڕۆژگار هاجەرە بوو بە بەندەی سارا، خاتوو سارای بەڕێز منداڵی نەدەبوو، دەیشیزانی ئیبراهیم زۆر حەزی لە منداڵە و پێی خۆشە ببێ بە باوک، لەسەر حیسابی خۆشبەختیی خۆی حەزی بە خۆشبەختیی مێردەکەی کرد...

پێی ناخۆش بوو مێردەکەی لەبەر ئەو وەجاخکوێر بێت و تامی باوکایەتی نەکا...

بۆیە داوا لە ئیبراهیم دەکا هاجەرە بهێنێ، ئیبراهیم هاجەرەی هێنا و بەرهەمەکەی ئیسماعیل بوو، خودای میهرەبان جەزای چاکەی سارەی دایەوە، ئەو سارەیەی کە نەزۆک بوو، ژیانی بەرەو پیری دەچوو، کەوتە سکوزاکردن و ئیسحاقی بوو، ئەو ئیسحاقە بوو بە باپیرە گەورەی تەواوی پەیامبەرانی بەنی ئیسرائیل لە نەتەوەی ئیسماعیلیش یەک پەیامبەر پەیدا دەبێت، ئەویش پێغەمبەری ئیسلامە، بەڵام چۆن پەیامبەرێ! پەیامبەرێکی زۆر مەزن، گەورەترین پەیامبەر بوو، جا ئەم پەیامبەرە مەزنە چیرۆکەکە تەواو دەکا و دەفەرموێ:

ئیبراهیم هاجەرەی هێنا بۆ لای مەککە و ماڵی خودا ئیسماعیلی لە کۆشدا بوو شیری پێ دەدا.

لە لای دارێکی گەورەدا، لەسەر زەمزەم
لە سەرووی مزگەوتی پیرۆز
هاجەرە و ئیسماعیلی دانا
ئەو ڕۆژگارە شاری مەککە چۆڵوهۆڵ بوو
نە کەس نە ئاو نە سەوزایی
ئا لەو شوێنە ئیبراهیم هەندێ خورما و کوندەیەک ئاو لای هاجەرە دادەنێت و بەجێیان دەهێڵێ.
هاجەرە بەدوای ئیبراهیمدا ڕادەکات و پێی دەڵێ:
ئەی ئیبراهیم! بۆ کوێ دەڕۆی؟
بۆ لەم دۆڵە چۆڵوهۆڵە بەجێم دەهێڵی؟
بۆ لەم شیوە قاقڕەدا تەنیام دەکەی؟
چەند جار ئەمەی دەگوتەوە...
ئیبراهیم ئاوڕی لێ نەدەدایەوە
هاجەرە گوتی: فەرمانی خودایە؟
گوتی: بەڵێ.
گوتی: دەی مادەم ئاوایە،
خودا بە میهرە لەناومان نابا.
پاشان بەرەو لای ڕۆڵەکەی گەڕایەوە.
ئیبراهیم ڕۆیشت تا گەیشتە لای سەنییە[1] هاجەرە و ئیسماعیل ئەویان نەدەدیت.
ئیبراهیم ڕووی لە ماڵی خودا کرد و هەردوو دەستی بەرز کردەوە و پاڕایەوە و فەرمووی:
﴿ رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ

١ شوێنێکە لە مەککە.

﴿يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾﴾ (إبراهيم).

(پەروەرندەی هەموو لامان! من لەناو شیوێکی قاقڕ لە پەنا ماڵی پیرۆزت، یەکێ لە زارۆڵەکانم جێ کردەوە، پەروەرێنمان! بۆ ئەوە کە نوێژان بکەن، دەسا تۆیش کارێکی وا بکە خەڵک بە دڵ خۆشی بوێن، لە بژیویش بەشیان بدە، شایەتا شوکری تۆ بکەن.)

## وانەی سێیەم

ئێستا من نازانم سەرم لە کێ سوور بمێنێ؟

لە ئیبراهیم؟ ئەو پیاوەی وا هەموو ژیانی کردە قوربانی لەبەر خودا؟

هەر لە سەرەتای منداڵیی هەتا پیری تێکۆشان و خەباتکردن

بتشکاندن، فڕێدرانە ناو ئاگر؟

بەرانبەری نەمرود وەستان، لە زێدی خۆی ئاوارە بوو

کۆچکردن بۆ فەلەستین و

لەوێش وەستانەوە بەرانبەر

ئەو کافرانەی پەرستنیان بۆ ئەستێرە بوو

دیسان لەوێش کۆچکردن و

هەڵاتن بەرەو میسر و تووشی فیرعەون بوون و ئازاردیتن

ئێستا وا بە سەری پیری تازە باوکە

فەرمانێکی پێ کراوە ڕۆڵەکەی خۆی لە قاقڕا بەجێ بهێڵێ

لای کێ؟ لە کوێ؟

لە شیوێکی بێ ئاو و وشک؟

نە ڕێبوارێ، نە دانیشتووی نێو دەوارێ، هیچ کەس لەوێ تێناپەڕێ

بەلام ئیبراهیم لەمانە ناپرسێت و فەرمانی خودا بەجێ دەهێنێ
یاخود سەرم لە هاجەرە سوور بمێنێ؟
ئەو هاجەرەی منداڵەبەر و شیردەر
بەدەم گریانوزارەوە شوێنی ئیبراهیم دەکەوێ
لێرە بەجێمان دەهێڵی؟
هیچ وەلامێک نابیسێت و خۆی پێی دەڵێ:
ئەمە فەرمانی خودایە؟
دەڵێ: بەڵێ.
ئەویش زۆر بە دڵنیاییەوە دەڵێ: خودا لەناومان نابا.
ئەمانە چ خێزانێکن؟ ئەمانە چۆن مرۆڤێکن؟ دەبێ اللەیان بۆ بڵێی:
الله الله لەم خێزانە! الله الله لەم کەسانە.

## وانەی چوارەم

ئیبراهیم لە رووی هەستی مێردایەتی و باوکایەتی ناتەواو نەبوو، هاجەرەیش زۆر پێویستی بە پیاوەکەی بوو، بەلام لەناو دڵی مێژوودا کەسی وا هەن، بۆیە دەبن ئامۆژگاریی لێ وەرگرین، باوکی بەسۆز کورپژگەی خۆی بەجێ دەهێڵێ لەبەر خودا ئافرەتێکی منداڵەبەر، بێکەسی و تەنیایی خۆی لە لا خۆشە لەبەر خودا.

ئەمە یانی رێگای بەرەو لای خوداچوون لە زۆر کاتدا پێچەوانەی ویست و خواستی مرۆڤ دەبێ لەوانەیشە بە بەردەوامی ئاوا بێت ئەو کەسانەی دەگەن بە خودا، کە لە دژی نەفسی خۆیان بە جەنگ دێن و بە گوێی ناکەن، ئەو کەسانەی پارە و ماڵیان بە خەڵکی دەبەخشن و پارە و ماڵیشیان خۆش دەوێ، ئەو کەسانەی پێیان خۆشە لە تویێی نوێندا پرخەیان بێ، بەلام هەڵدەسن بۆ شەونوێژ،

ئـەو کوڕانـەی بـە دڵ حەزیـان لـە تێکەڵاویـی کچانـە، کەچـی خۆیـان دەپارێـزن.

ئـەو کەسـانەی لەنێو ماڵدا زۆر ئاتاجی دینارێکن، کەچی خۆیان لە بەرتیل و پارەی حـەرام دەپارێزن، ئـەو کچانەی بە دڵ حەزیان لـە تێکەڵاویی کوڕانە، کەچی خۆیان دەپارێزن.

ئـەو کچانـەی پێیـان خۆشـە سـیمای خۆیـان بـەدەر بخـەن، خـۆ بنوێنـن کەچـی خۆیـان دەپارێـزن.

ئـا ئەمانـە دەگەنـە خـودا، دەگەنـە ڕەزامەنـدی و لێخۆشـبوونی پـەروەردگار.

ڕاسـتە! دۆزەخ بـە شـتی خـۆش داپۆشـراوە، ڕێـگای بەهەشـت لـە ناخۆشـی ئاخنـراوە.

## وانەی پێنجەم

هاجەرە دەپرسێ: ئا لێرە بەجێمان دەهێڵی؟
ئیبراهیم بێ وەڵام دەبێ
قەت پرسیوتە بۆچی ئیبراهیم ئاوڕی نەدایەوە؟
تەنانەت بێ وەڵامیش بوو؟
ئەمە خۆبەزلزانی بوو؟
پەنا بە خودا! ئیبراهیم زۆر لەوە مەزنترە لووتبەرز بێت.
بەڵام دەیویست بە بینینی کوڕەکەی و خێزانەکەی
لەوە زیاتر ئاگر نەگرێ.
نەکا سیمای زەردی هاجەرە
بابە بابەی منداڵەکەی
لەو فەرمانەی پێی کراوە، پەشیمانی بکەنەوە.
بەڵێ، ئەو گەورە پیاوانە کەمێ لە خۆشەویستی خودا

ناگۆڕنەوە بە ژن، بە ماڵ، بە منداڵ و تەنانەت بە گیانی خۆیان.
وەک دەزانی بۆ باوەڕدار نزاکردن چەکێکی قورس و گرانە،
شمشێرێکە و لە کالانە.
ئیبراهیمیش شمشێری لە کالان کێشا
هەردوو دەستی بەرز کردەوە، لە پەروەرێن پاڕایەوە:
﴿ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ ﴿٣٧﴾ ﴾ (إبراهیم)، (دەسا تۆیش کاریٚ وا بکە خەڵک بە دڵ خۆشی بوێن).
زۆر لە مێژە نزای ئیبراهیم گیرایە
تەنیا هۆزی جورهوم نەبوون
بە دڵ ئەوانی خۆش دەویست
بەڵکوو دڵی هەموو باوەڕدارەکانیان
لەو کاتەوە هەتا پەسڵان لەگەڵدایە.
ئەوەتا ئەو ماڵی خودایە، کە ئیبراهیم نوێی کردەوە، دڵی هەموو باوەڕدارانی سەر زەویی بۆ لای خۆی وا ڕاکێشاوە هەر مەپرسە لە هەر چوارقوڕنەی دونیاوە، لە بەرزایی و لە نزمایی خەڵک پۆل پۆل دێن و دەچن، زیارەتی کەعبە دەکەن، هۆزێک دێت و لە مەککەدا دادەبەزن، ژنێکی بێکەس و تەنیا و منداڵێکی شیرەخۆرە، لە پەنا بناغەی کابە دانیشتوون و چاویان لە سۆزی خودایە، ئەو منداڵەی دوێنی باوکی بەجێی دەهێڵی، ئەمڕۆ دە پیاو چاودێریەتی، ئەو ئافرەتەی کە بێکەس بوو، ئەمڕۆ هەر وەک سەرۆکهۆزێک لێی دەڕوانن.
بەڵێ، مەلەفی ئەم دوانە لە ئاسمانە
ئەم زەوییەی کە دەسووڕیٚ لە بەرزەوە
فەرمانی بۆ دێتە خواریٚ
ئەی ئەو کەسەی کە نەخۆشی!

شیفای تۆ تەنیا لای خودایە.
ئەی ئەو کەسەی کە هەژاری!
دەوڵەمەندی مەزن خودایە.
ئەی ئەو کەسەی کە خەمباری!
دڵخۆشی لە لای خودایە.
ئەی ئەو کەسەی کە مەزڵوومی!
فریادرەسی بەهێز خودایە.
ئەی ئەو کەسەی کە بێکەسی!
کەسی بێکەسان خودایە.
ئەی ئەو کەسەی داخ لە دڵی!
ئارامیی دڵ لای خودایە.

ئەو خەڵکە تەنیا هۆکارن، لەوە زیاتر هیچ بە دەست نین، هەموو شتێک بە دەست خودایە.

ئەگەر خودات لەگەڵ بێت بەسە، نەکەی بەرەو هۆکار بچی و پەروەردگار لە بیر بکەی.

کارکردن تەنیا هۆکارە، ڕۆزیدەریش هەر خودایە.

هاوسەرگیری هەر هۆکارە، ڕۆڵە بەخشیش تەنیا خودایە، تیر تەقاندن هەر هۆکارە، ئامانجپێکەر تەنیا خودایە: ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ﴿١٧﴾﴾ (الانفال)، (کە هاویشتت هاوێژەرەکە تۆ نەبووی، خودا هاویشتی، هۆکار بگرە و بەریمەدە، بەڵام هەرگیز هۆکارەکان پەروەرێنت لە بیر نەبات).

## وانەی شەشەم

ئایا فەرمانی خودایە؟
چەندە پرسیارێکی جوانە...

ئەو وەڵامەیش چەند شیرینە بڵێی فەرمانی خودایە.
ئەو باوەڕە چەند بەهێزە و چەندە جوانە کارەکانمان تەنیا لەبەر فەرمانی پەروەرێنمان بێت!
بۆ جوانیی خۆت بەدەر ناخەی؟
چونکە خودا فەرمانی کرد بیشارمەوە
بۆ گوێ بۆ مێردەکەت دەگری؟
چونکە خودا وای پێ خۆشە.
بۆ ڕێزی خێزانت دەگریت؟
چونکە خودا وای فێر کردم.
بۆچی بەرتیل وەرناگری؟
چونکە فەرمانی خودایە.
بۆ نوێژ دەکەی؟ زەکات دەدەی؟
ئەوەیش هەر فەرمانی خودایە.
بۆچی؟ بۆچی؟
تەنیا لەبەر فەرمانی خودا.
کام وەڵام هێندەی ئەم وەڵامە جوانە؟
دڵنیا بە! خاترجەم بە!
ئارخەیان بە!
هەرکەس فەرمانی پەروەرێن بەجێ بهێنێ
خودا کاری بۆ ئاسان دەکا.
هەر کەس دەست بۆ حەرام نەبا
خودا ڕۆزیی پاک و حەڵاڵی پێ دەدا.
هاوکێشەیەکی سەنگینە
زۆر کەس لەم هاوکێشەیە ناگا.
ئەو حەرامەی کە تۆ دەیخۆی ڕزقی خودایە،

بەڵام گەر خۆڕاگر بیت، خودای مەزن بە حەلاڵی پێتدەبەخشێ.
ئەو پارەیەی لە بەرتیلا وەرتگرتووە ڕزقی خودایە، بە ناڕەوا پەیدای دەکەی،
ئارام بگری بۆت پاک دەکا و نۆشی گیانت.
بە ناڕەوا سەیری کچی خەڵکی دەکەی
لەو بینینە چێژ وەردەگری
ئەگەر کەمێ خۆڕاگر بیت
چێژی بینینی ئافرەتت دەست دەکەوێ بە حەلاڵی
دواتر پەیامبەری مەزن
باسی چیرۆکەکە دەکات و دەفەرموێ:
دایکی ئیسماعیل شیری بە ئیسماعیل دەدا
لە ئاوی نێو کوندەیشی دەخواردەوە، ئاو تەواو بوو، تینووێتی تینی بۆ هێنا
ئیسماعیلیش لە تینواندا دەپلکاوە، هاجەرە لە تاوی ئەوەی کەوا چاوی بە ئیسماعیل نەکەوێ ملی ڕێگای لێ گرتە بەر کێوی سەفا نزیکترین کێو بوو دەیدی.
ڕۆیشتە سەری، بە چواردەوردا سەیری دەکرد تا بزانێ داخۆ کەسێ بە دی ناکا؟
کەس دیار نەبوو، پاشان لە سەفا دابەزی تا گەیشتەوە نێو شیوەکە، چاکی هەڵ کرد -نەکا پەنجەی پای لێی گیر بێ و بەسەر زەویدا بکەوێ-
پاشان وەک مرۆی تێکۆشەر دەستی بە پەلەقاژە کرد
تا شیوەکەی تێپەڕاند و گەیشتە مەڕوە،
لەسەر بەرزایی مەڕوەوە
دەستی کرد بە ملەقوتە، داخۆ هیچ کەسێ دەبینێ

لەوێیش کەسی بەدی نەکرد
حەوت جار ئاوا دەهات، دەچوو
ئەو حەوت جارە بۆ حاجییان بڕیار درا.
بۆ دوایین جار لەسەر مەڕوە بە حاڵ گوێی لە نوزەیەک بوو،
خۆی بە خۆی گوت: بێدەنگ! بێدەنگ!
ئەم جارە باش گوێی بۆ شل کرد
دیسان دەنگی کەوتە بەر گوێ
هاواری کرد: فریام بکەوە!

تەماشای کرد فریشتەیە و لەو جێگەیە کە ئێستا بیری زەمزەمە، بە قولەقاپ یا بە باڵ بوو خەریکی زەویکوڵین بوو، ئاو هاتە سەر، هاجەرەخان زۆر بەپەلە حەوزی بۆ ئاو دروست دەکرد، جاربەجاریش بە گوێل و مست ئاوی لە کوندەکەی دەکرد هەر جار بە مست ئاوی دەبرد، ئاو هەڵدەقوڵی و شوێنە مستەکەی پڕ دەکرد ڕەحمەتی خودا لە هاجەرە بێت، ئەگەر لەو ئاوە گەڕایە وەکوو ڕووبار ڕەوان دەبوو، خۆی تێراو بوو، ئیسماعیلی تێر کرد بە شیر.

فریشتەکە پێی فەرموو: هەرگیز نەترسن، ئێرە جێگای ماڵی خودایە ئەم منداڵە لەگەڵ باوکیدا ماڵی خودا سەرلەنوێ ڕاست دەکەنەوە، خودای مەزن بەندە ڕاستەقینەکانی لەناو نابات.

## وانەی حەوتەم

ئەگەر هاجەرە دابنیشتایە و پڕ بە قوڕگی بۆ خۆی بگریایە، هیچ کەس سەرکۆنەی نەدەکرد.

ژنێک بە تاقوتەنیایی، هەموو کەسی منداڵێکی شیرەخۆرە، ئەو منداڵە هەرچەند جاران مایەی ئارامی و دڵخۆشی هاجەرە بوو، بەڵام ئێستا لە خەم زیاتر مایەی چییە؟

ئەو چەند ڕۆژەی خورما و ئاوی لە لا مابوو، شیری هەبوو، ڕۆڵەکەی مایەی ئارامی و دڵخۆشی بوو، بەڵام ئێستا جگە لەوەی کە تینووە، برسییەتی، گەرمای خۆر پێستی دەسووتان، وا خەریکە بە چاوی خۆی منداڵەی دەبینێ چۆن لە تینواندا لە خاک و خۆڵدا دەگەوزێ، هەم بە جەستە و هەم بە دەروون ئازار تینی بۆ هێنابوو، بەڵام هێشتا تەسلیم نابێ و سەنگەری لە نائومێدی هەڵچنیوە، ڕادەکا بۆ کێوی سەفا، تا بزانێ کەس دەبینێ؟

کاتێ لە سەفا دێتە خوار بە غار
بەلەز بەرەو مەروە ملی ڕێگا دەگرێتە بەر.
لەنێو ڕێدا بە لای ڕۆڵەی تێدەپەڕێ تا بزانێ هێشتا ماوە؟
بەڵێ ماوە، بەڵام هێشتا لە تینواندا هەر پێچ دەخوات.
ئەم وانەیە بۆ تێکۆشان زۆر گرنگە.

هەرچەند تەنگانە ڕووت تێبکا، ناگا بە تەنگانەی هاجەرە بە لاق هەڵدێ، بە چاو لەو دەشتە دەڕوانێ، بۆ فریادڕەسێ دەگەڕێ تێکۆشان بۆ بەدەستهێنانی نان و ئاو، پێچەوانەی پشتبەستن بە خودا نییە، هاجەرە هاوسەری پەیامبەرێک، دایکی پەیامبەرێکی تر بوو، کەچی خۆیی تەسلیم ناکا، چاوەڕوانی ئەوە نەبوو، هەر وا لەپڕ کەسێک بێت و فریای بکەوێ، یا موعجیزە ڕووبدات و نان و ئاوی بۆ بباری، چاک دەیزانی ئەگەر کار گەیشتە ئەوپەڕی تەنگانە، خودا خۆی فریای دەکەوێ، لەگەڵ ئەوەیش تێدەکۆشێت، ئەو مرۆڤەی تێکۆشەرە، چۆن لەگەڵ ئەو مرۆڤەی دۆش داماوە دەبن بە یەک؟ ئەم دونیایە جێگەی هەوڵ و تێکۆشانە، دەی تێبکۆشە! هیچ شتێ هەر وا لە خۆوە بە دەست نایە، جسنی مرۆڤ لەگەڵ خەمدا بەدی هێنرا، هەموو شتێ پێویستی بە ماندووبوونە، نەفسی مرۆڤ گەر لەگەڵیدا نەجەنگی و ماندوو نەبی، ئەو نەفسە نایەتە سەر ڕێ،

ئەگەر لەگەڵ نەفسی خۆتدا تێر نەجەنگی، ڕێگەی بەهەشت ناگریتە بەر منداڵ! منداڵ! ئەو منداڵەی پارچە جەرگی دایک و باوکە بەبێ ئازار گەورە نابێت، ڕزق و ڕۆزی! ئەگەر جەستەت هیلاک نەکەی، ڕزق و ڕۆزی پەیدا ناکەیت.

## وانەی هەشتەم

پاداشت لە جۆری کردارە.

ئەم قسەیە بەڵگەی ناوێت و لە هەموو جار و بارێکدا و لە گشت جێگایەک دەگوترێت.

ئەو ئافرەتەی کە وا دەیگوت: خودا ئێمە لەناو نابات، خودا فریشتەیەکی بۆ نارد تا پێی بڵێ: پەروەردگار بەندەکانی نافەوتێنێت، خەڵکی ئاتاجی ئەوەیە قسەیەکی باش بشنەوێ.

خەڵکی ئاتاجی ئەوەیە، لە کاتێکدا لێی دەقەومێ یەکێک بێت دڵنەوایان بێت، پێویستیان بە کەسێ نییە باری خەفەتیان گران بکا، کاتێ سەردانی بیمار و نەخۆش دەکەی، باسی چاکبوونەوە بکە، کاتێ کەسێ لە کارێکدا سەرکەوتن بەدەست ناهێنێ، باسی ورە و هەوڵدان و کۆڵنەدانی لە لا بکە.

کاتێ هەژارێک دەبینی، ئەوە بڵێ کە زەنگینبوون گران نییە و هەموو کەس ڕۆژێکی هەیە.

کاتێ یەکێک کوڕی دەمرێ، باسی پەیامبەر بە نموونە بهێنەوە، کە چۆن ئەویش مەرگی کچ و کوڕی خۆی دی، ئەگەر یەکێ لای تۆ گوتی کوڕەکەم زۆر بۆم خراپە، باسی پەیامبەر نووحی بۆ بکە، کە چەند کوڕەکەی خراپ بوو، گەر یەکێ گلەیی لە ژنەکەی هەبوو، دیسان باسی نووح و دواتر باسی پەیامبەر (لوط)یشی بۆ بکە، گەر لاوێ بە دەست باوکیەوە گیرۆدە بوو، باسی ئیبراهیم

بێنە ناو، ئەگەر پیاوێک کێشەی بێمنداڵیی هەبوو، باسی زەکەریای بۆ بکە، کە بە پیری خودای مەزن کوڕێکی باشی پێ بەخشی، گەر ژنێک بێ منداڵ بوو، باسی سارەی لە لا بکە، کە بە پیری ئیسحاقی بوو، کەسێکی بێ کارت بینی، هیوای بەرێ، ئەگەر کەسێک کێشەی هەبوو، دڵی خۆشکە و بڵێ هەرچی کێشە هەیە تەواو دەبن، ئەو کەسانەی نائومێدن پێیان بڵێ: ئاسۆ ڕوونە، ئومێد هەر دێت.

خەڵک پێویستی بە کەسێکە جێی ئومێد بێت، ژیان گرانە، خەڵکی لەنێو ئازاری ژین دەتلێنەوە، تۆیش مەبە بار، باریان لەسەر شان دابگرە.

## وانەی نۆیەم

ئەم جیهانە هەمووی بە دەستی خودایە.

بۆ خودا بژی، خودایش ژیان و گوزەرانت ئاسان دەکا.

تاکە تاکی فریشتەکان دەیانتوانی بە فەرمانی خودای مەزن ئاو بۆ هاجەرە هەڵبقوڵێنن، بەڵام خودا لە نێوانی هەر هەموویاندا جوبرەئیلی نارد، تا پێمان بڵێ: سەرەخۆشی بە ئەندازەی ناخۆشی دێت، سەرەخۆشی پەروەردگار چەندە جوانە! با بزانی جوبرەئیلیش لە شێوازی پیاوێکدا هات، بۆ ئەوەی هاجەرە نەترسێ، خودا دەیویست پێش هەموو شت سەرەخۆشی لە هاجەرە بکا، نەک دەسەڵات و گەورەیی خۆی نیشان دا فریشتە و جین بە پێچەوانەی بەشەر، دەتوانن خۆیان بگۆڕن، لە چەند شێوەی جیاواز جیاواز خۆ نیشان بدەن.

بەڵام یەک جیاوازی هەیە: هەر کات پەری بە هەر شێوەیەک خۆی گۆڕی، بە ئەندازەی ئەو شێوەیە هێزی هەیە، یانی ئەگەر پەری خۆی بە مرۆڤ گۆڕی، هێندەی پیاوێک هێزی هەیە، بە

تیر دەتوانی بیکوژی، ئەگەر ڕۆیشتە شێوەی مەلێک، بە دارلاستیک بۆت دەکوژرێ.

بەڵام فریشتە وا نییە، لە شێوەی مەل یا مرۆڤ بێت، هێزی تەواوی خۆی هەیە و هیچ کەم ناکات، فریشتەکان لەسەر شێوەی ڕاستیی خۆیان زۆر بەسامن.

تەنانەت پەیامبەری مەزن تەنیا دوو جار جوبرەئیلی وەک خۆی بینیوە.

کە یەکەمجار چاوی پێی کەوت ترسی لێ نیشت.

لەبەر ئەوە ئا لەو کاتەی جوبرەئیل و ئیسرافیل و میکائیلیش هەرسێ ڕۆیشتن بۆ ماڵی پەیامبەر (لوط)، لەسەر شێوازی پیاو ڕۆیشتن، خودا نەیویست جگە لە خەمی خەڵکەکە، ترسی بینینی فریشتەیش بۆ پەیامبەر (لوط) زیاد بکا.

## وانەی دەیەم

هاجەرە ئاوی زەمزەمی گیر نەدابایە وەکوو ڕووبار ڕێگای دەبڕی.

مرۆڤ هەرچەند بێگوناه- و لەخوداترس بێت هەر مرۆڤە.
وا نەزانی ئەو کەسانەی ئیماندارن، ئیتر ئەوانە فریشتەن
لە بیرت بێ ئەوانەیش مرۆڤن وەک تۆ
خۆشەویستی و ڕقیان هەیە، حەزیان هەیە
چاویان لە خۆشیی دونیایە، حەزیان لە ماڵ و منداڵە
جارجار بەهێز، جارجار بێهێز، ئیتر ئەوانیش مرۆڤن
ئەگەر ڕۆژێ چاویان لە خۆشیی دونیا بوو، وا نەزانی ئیمانیان فت
کەی ئیمان لەگەڵ خۆشیی دونیا دژە؟

دونیا و بازاڕ، ڕزق و ڕۆزی، خەو و خۆراک
هەرگیز دژی بەهەشت نین و هەرگیز نابن
تەنانەت ڕێگەن بۆ بەهەشت (ئەگەر هات و لێی بزانی و بۆ چاکەیان بەکار بهێنێت).
هاجەرە هێندە تینو ببوو، خەریک بوو لە تینواندا بمرێ
ئاساییە گەر بیەوێ ئاوی زەمزەم گل بداتەوە و ڕاییوەستێنێ
گەر بەو جۆرەی نەکردایە، ئەو کاتە نائاسایی بوو
جارە جارە خەم و خەفەت
کارێ بەسەر مرۆی باوەڕدار دەهێنن
وەختە تەواو بێئومێد بێت.
جارەجارەیش هێند خۆشحاڵە
وەختە هەموو شتی دونیای لە بیر بچێت.
دەزانی بۆ؟ چوون مرۆڤە.
کە پەیامبەر لەمەڕ هاجەرەوە دەفەرموێ: گەر زەمزەمی گیر نەدایە، ڕەوان دەبوو.
ئەمە مانای زەمکردنی هاجەرە نییە، بەڵکوو ئەمە هەواڵێکە لە بارەی پەیامبەر موسایشەوە، پەیامبەر هەواڵی داوە ئەو کاتەی موسا گەیشت بە خدر، داوای لێ کرد شتی فێر بکا.
ئەویش مەرجێکی بۆ دانا، پرسیاری هیچی لێ نەکات، بەڵام کاتێ کەوا خدر تەختەی کەشتییەکەی شکاند و ئاو هاتە ژوور موسا یەکسەر سەرکۆنەی کرد ئەو کاتەیش وا کوڕێکی کوشت دیسان موسا سەرکۆنەی کرد، ئەو بەڵێنەی کە پێیدابوو لە بیری چوو.
سەرلەنوێ بەڵێنی دا: جارێکی تر لەمەڕ هیچ شت پرسیار نەکات.
لە دوای ئەوەی خدر دەستی دایە دیوارڕاستکردنەوە، موسا

دیسان بەڵینەکەی لەبیر نەما و سەرکۆنەی کرد، ئەمە سروشتی مرۆڤە، بە بینینی شتی نامۆ پرسیار دەکا.

موسایش مرۆڤە و دەپرسێ ئاساییە گەر موسا پرسیار بکا، لە کارێکدا سەرسووڕماو بێت، شتێک بە نامۆ بزانێ، دوای سێیەم جار خدر گوتی: ئێستا کاتی لە یەکترجیابوونەوەیە.

پەیامبەری ئیسلام فەرمووی: ڕەحمەتی خودا لەسەر موسا، ئەگەر کەمێک لەسەرخۆبا شتی سەیرترمان دەبینی.

## وانەی یازدە

ئەو کەسەی لە دەستی بێت
لە بیابان ئاو دەربهێنێت
لە دەستی دێت چارەسەریش
بۆ ئاریشەی هەموو خەڵکی پەیدا بکا،
تا دەتوانی لە بەرانبەر کاری خودا گەشبین بە و گومانت باش بێ
هیچ لە خودا یاخی نابێ.

ئەو کارانەی دژوار بوون و خودای گەورە ڕایی کردن، هەر هەموویان لە ئاریشە و کاری دژواری جەنابت گەورەتر بوون، ئیتر بۆچی ئاریشەی خۆت لا گەورەیە و لە لات وایە چارەسەری هەرگیز نایە؟

ئەو خودایەی لە بەردێک وشتر دەربهێنێ، لای ئاسانە سۆزی دڵی کاربەدەستان هەڵقوڵێنێ، ئەو کەسەی بە هێمای گۆچان دەریا لەت بکا، لای ئاسانە کێشەکانت لەناو ببا.

ئەو خودایەی لە بەدکاران تۆڵە بۆ نووح بسەنێت و لەناویان ببا، دەتوانێ تۆڵەت بستێنێت.

ئـەو خودایـەی زەکەریـای پیـر بـکا بـە خاوەنـی منـداڵ، دەتوانـێ ڕۆزیـی تۆیـش بـدا.

ئـەو خودایـەی خـۆر بـۆ یوشـەع بوەسـتێنێ، دەتوانـێ نەیارانـی تۆیـش بوەسـتێنێ.

خودا هێزی خۆی دەردەخا، هەتا ئێمە پەنا بەو هێزە بگرین.

باسـی سـزا و تۆڵـە دەکا، تـا خۆمـان لـە تووڕەیـی خـودا بپارێزیـن. باسـی سـۆزی خۆیشـی دەکا، تـا مـن و تـۆ هـەوڵ بـۆ سـۆزی خـودا بدەیـن، دوو ڕێگەیشـت نیشـان دەدا، یـەک ڕێگـەی ڕاسـت، دوو ڕێگـەی چـەوت دوایـی خۆیشـت سەرپشـک دەکا، ڕێگـەی ڕاسـتت دەوێ یـا چـەوت؟

بـا بێینـەوە فەرموودەکـە تـەواو بکەیـن: بناغـەی کەعبـەی پیـرۆز کەمێـک لـە زەوی بەرزتـر بـوو، لافـاو دەهـات لـە ڕاسـت و چـەپ هـەر جـارە و کەمێکـی دەبـرد بـەو شـێوە مـا، هـۆزی جورهـوم لـە خـوار مەککـەوە تێدەپەڕیـن چییـان بینـی؟ وا باڵندە لـە ئاسـمانی مەککـە دیـارە.

ببێ و نەبێ لـەو جێگەیـە ئاوێـک هەیـە زۆر جـار لێـرە تێپەڕیویـن. بـەڵام هەرگیـز کانـی و ڕووبارمـان نەدیـوە! یـەک دوو کەسـیان کەوتـە سـۆراخ، دەبینـن ئەمـە ئاوێکـە، گەڕانـەوە، هەواڵیـان بـە خەڵکەکـە دا، هەمـوو بـەرەو زەمزەم هاتـن، دەبینـن وا ژنێـک بـە منداڵێکەوە لای ئـەم ئـاوە دانیشـتووە گوتیـان: (دادە) تـۆ دەهێڵـی ئێمـە لێـرە بارگـە و بنـەی خۆمـان بخەیـن؟

گوتی: بەڵێ، بەڵام کانی کانیی خۆمە.

گوتیان: باشە.

هاجـەرە خاتـوون ئـەو هەلـەی لـە کیـس خـۆی نـەدا، چـوون پێـی خـۆش بـوو، ئەویـش لەنێـو خەڵکـدا بـژی، هـۆزی جورهـوم بارگەیـان خسـت، مەککـە ئـاوەدان بـووەوە، ئیسـماعیل وردەوردە گـەورە بـوو،

بوو بە لاوچاک، فێری عەرەبیی ڕەسەن بوو، ژنێکی لە جورهوم هێنا.

## وانەی دوانزە

جورهوم زۆر و هاجەرە تەنیا.

داوای مۆڵەتیان لێ کرد و مەرجی دانا: کانی هەر کانیی خۆم بێت و مافتان نەبێ داگیری بکەن. ئەوانیش بە مەرج ڕازی بوون، ئەم وانەیە وانەیەکی ئەخلاقییە و زۆر گەورەیە، جورهوم لەسەر ئایینی ئیبراهیم نەبوون، بەڵام ئاکاریان هێند بەرز بوو، وەک ئاکاری ئاینداران.

هۆزێکی زل داوای مافی پەنابەری لە ژنێکی بێکەس دەکەن.

نایانەوێ شتێک کە هیی ئەوان نەبێ داگیری بکەن.

ئەگەر کەسێکی بێ ئایین، ئاکار و ئەخلاقی باش بێت عەجیب نییە.

سەیر ئەوەیە مرۆڤێکی باوەڕدار و خاوەن ئایین ئەخلاق و ئاکاری بەد بێ!

لە ڕاستیدا ئەم ئایینە هەموو ئاکاری شیرینە.

جا هەر کەسێ زیاتر ئاکاری شیرین بێت، ئەوە زیاتر باوەڕدارە

جێگای داخە کە مسوڵمان بە ناسنامە مسوڵمان بێ و

لە ئاکار و ئەخلاقیشدا تەپ لە دینەکەی نەپێکێ.

عەرەبی کۆن، بەبێ ئایین، هێشتا ئامادەی ئەوە نین مافی ژنێک پێشێل بکەن، بەڵام ئێستا ئێمە خۆمان بە ئایندار دەناسێنین، مافی یەکتری دەخۆین و بە ناڕەوایشی نازانین، ئەم بابەتە چزە لە دڵ هەڵدەسێنێ.

## وانەی سێزدە

گەر تەماشای وشەی (ئینسان) بکەین لەگەڵ وشەی (ئونس)-ی بە مانا هۆگری، سەروکارێکی هەیە، یانی مرۆڤ هەم هۆگری شتی ترە و شتی تریش هۆگریەتی.

مرۆڤ کاتێ تەواو دەبێ بە مرۆڤ و دادەمەزرێ، هەم هۆگر بێت و هەم خەڵکانیش هۆگری بن.

دەبێ برسی لامان تێر بێ و ئۆخەی بکا.
دەبێ خەمبار بە بینینمان خەم بە با بدا.
دەبێ هاوکاری مەزلووم بین.
ئێمە کاتێ شت دەبەخشین لە ڕاستیدا
بەخشینەکە پێش ئەوەی بۆ خەڵکی تر بێت، بۆ خۆمانە
جوامێریمان وەکو کاڵا بە باڵای خۆمان بڕیوە.
گشت گیاندارێک دەتوانێ گیانداری ببێ
بەڵام مرۆڤ پێویستە بە ئاکاری بەرز
ڕەفتاری جوان خۆی نیشان بکا.
گەر دەتەوێ بزانی تۆ مرۆڤێکی خۆش ڕەفتاری
وەرە لە خۆت ڕابمێنە،
هێندە باشیی دایک و باوکت شانازی بە بوونت بکەن؟
هێندە چاکی منداڵی خۆت بە باوکە، یاخود بە دایکە گازت بکەن؟
دەتوانی پشتی برا بی؟
دەتوانی بۆ هاوسەرەکەت دۆست و
هاوڕێ و خۆشەویست بی؟
خۆشکت ئومێدی پێتە؟
دراوسێکەت لێت ڕازییە؟
ئەم خاڵانە پێوەری گەورەیی تۆن و هەرگیز فەرامۆشیان نەکەی.

## وانەی چواردە

لەنێو هەموو پەیامبەراندا تەنیا چوار لەوان عەرەب بوون: شوعەیب، سالح، هود، موحەممەد، ئیسماعیل باوکی عەرەبە، بەلام هەموومان لە ئادەم، ئادەم لە خۆل، ئەم ئایینەیش هەرچەند لەسەر دەستی عەرەب بلاو بووەوە، بەلام هەر هیی عەرەب نییە، ئەم ئایینە ئایینی گشت مرۆڤێکە، ڕەشپێست، سپی، سوورپێس، ئەسمەر... هەرگیز نەکەی دەمارگیر بیت، شانازی بە نەسەبەوە بکەیت.[٢]

تەماشا بکە بیلال خەڵکی حەبەشە بوو، دەچتە بەهەشت، ئەبولەهەب مامی پەیامبەر دەچێتە ناوەڕاستی دۆزەخ، سوهەیبی ڕۆمی، ماڵی لەنێو بەهەشت دەبێت، وەلیدی بە ڕەسەن عەرەب ڕێگەی بەرەو دۆزەخ دەچێت، پەیامبەر بە خزمەکانی خۆی دەفەرموو: مامە عەباس! خوداپەرست بە، فاتمە! کچم خۆت هەوڵ بدە، نەکەن لە ڕۆژی پەسلاندا خەڵک بە کار و کردەوە بۆ لای من بێت و ئێوەیش بڵێن: خزمی خۆتین، گەر خودای مەزن ڕێزی لە تیرەی عەرەب نا و پەیامبەری لەناو عەرەبدا بژاردە کرد:

وا نەزانی ئیتر عەرەب
لە هەرچی تیرەی دونیایە هێژاترە.
ئەمە باوەڕی جاهیل و نەفامانە.

ئێمە دەبێ لەبری ئەو سۆزەی خودا کە لە ئێمە پەیامبەری بژاردە کرد، زیاتر دەست بە ئایینەوە بگرین، دەبێ دڵمان فراوان بێت، هەر کەسێک لە غەیری عەرەب هات بۆ ناو ئایینی ئیسلام،

---

٢ مەحویی شاعیرمان دەفەرموێت:
(فەزیلەی ئەصڵ و فەصڵ ئینسانی پێ نابێ بە صاحێب فەزڵ
کە تۆ کوسەی بە تۆ چی مامە ڕیشی باب و باپیرت؟)

بە گیان و دڵ بەخێرهاتنی لێ بکەین و ڕێزی بگرین، باش بزانن خزمایەتی و پێوەندییەک باوەڕ دروستی کردبێ، زۆر لە پێوەندییەک بەهۆی لق و تیرە و عەشایەری عەرەبی بێت، هێژاترە.

گەر وا نەبا پەیامبەر چۆن لەگەڵ قورەیش جەنگی دەکرد؟

گەر پەیامبەری خودا شارگەرایی و لادێچێتیی بکردایە، چۆن مەککەی بەجێ دەهێشت و لە مەدینە جێگیر دەبوو؟ گەر خزمایەتی و تیرەچێتی بکردایە، چۆن حاشای لە مامی دەکرد؟

بەڵێ، باوەڕ بە خودای گەورە و دەستووری ئایینی پیرۆز، لە خزم و کەس، لە تیرە و هۆز، لە ڕەگ و خوێن، لە خاک و خۆڵ مەزنترە. با بێینەوە فەرموودەکە تەواو بکەین:

خاتوو هاجەرە وەفاتی کرد، ئیسماعیلیش ژنی هێنا، ئیبراهیم لە پاش چەندساڵێک سەری لە کوڕەکەی خۆی دا، کە گەیشتە ماڵی ئیسماعیل، ئیسماعیل لە ماڵ نەبوو، پرسیاری ئیسماعیلی کرد، ژنەکەی ئیسماعیل گوتی: چووەتە دەر شتێک بۆ خواردن پەیدا بکا.

ئیبراهیم لە حاڵ و گوزەرانی ماڵی ئیسماعیلی پرسی، بووک دەستی کرد بە بۆڵەبۆڵ: ژیانمان نییە، گوزەرانمان زۆر خراپە، ئیبراهیم بە بووکەکەی گوت: گەر مێردەکەت هاتەوە، سڵاوی منی پێ بگەیەنە و بڵێ پێشدەرگەی بگۆڕێ، کاتێ ئیسماعیل هاتەوە، هەستی دەکرد باوکی هاتووە بۆ سەردانی گوتی: کەس هاتووە بۆ ئێرە؟

گوتی: بەڵێ پیاوێکی پیر ئاوا و ئاوا، هات پرسیاری لە تۆ دەکرد، دوایی لە ژیانمانی پرسی، منیش گوتم: هیچ باش نییە.

گوتی: هیچ ڕاسپاردەی هەبوو؟

گوتی: بەڵێ، سەلامی لە تۆ دەکرد و گوتی: پێش دەرگەت بگۆڕی.

گوتی: ئەوە باوکم بووە، مەبەست لە پێش دەرگە تۆ بووی، بڕۆ تەلاقت کەوتبێ.

ئیسماعیل ژنەی تەڵاق دا و ژنێکی تری لێ هێنان.

دوای ماوەیەک ئیبراهیم دیسان هاتەوە، رێک وەکو جاری رابردوو، ئیسماعیل لە ماڵ نەبوو، لە ژنی ئیسماعیلی پرسی:

گوتی: چووەتە دەرێ نان پەیدا بکا.

گوتی: ژیان و حاڵ و گوزەرانتان لە چیدایە؟

گوتی: لە سایەی خوداوە باشین.

گوتی: خواردنتان چییە؟

گوتی: گۆشت.

گوتی: ئەی خواردنەوە چی؟

گوتی: ئاو.

گوتی: خودایە پیت و بەرەکەت بخەیتە ئاو و گۆشتیان.

لەو سەردەمە و لەو جێگایە دانەوێڵە نەبوو، ئەگەر نا داوای لە خودا دەکرد پیتی تێبخات.

لە هەر شوێنێ جگە لە مەککە، خواردن تەنیا ئاو و گۆشت بێت گوزەرانی پێ ناکرێ.

دواتر ئیبراهیم پێی فەرموو: ئەگەر مێردەکەت هاتەوە سڵاوی منی لێ بکە و بڵێ پێش دەرگەی توند بکات.

کە ئیسماعیل گەڕایەوە، گوتی: کێ بۆ ئێرە هاتووە؟

ژنە گوتی: پیاوێکی پیری سیما جوان.

هەندێکی تر تاریفی کرد.

دوایی گوتی: پرسیاری تۆی لە من دەکرد، دوایی پرسیی باری گوزەرانتان چۆنە؟

ئیسماعیل بە ژنەکەی گوت: ئەی ڕاسپاردەی هیچ نەبوو؟

گوتی: بەڵێ، گوتی بە پیاوەکەت بڵێ: پێش دەرگەکەی قایم بکا.

گوتی: ئەوە باوکم بووە، پێش دەرگە تۆی، مەبەستی بوو تۆ

ژنم بێ و تەلاق نەدرێت.

## وانەی پانزە

تۆ تەماشا دوورنیازی (کنایە) چەندە جوانە!

بڵێ: پێش دەرگەی بگۆڕێ.

بڵێ: پێش دەرگەی قایم بکات.

زۆر جار وتەی بێ توێکڵ و سوور و سافی مرۆڤەکان دڵی گوێگر دەڕەنجێنێ، ئەگەر سوور و ساف بیگوتایە: بڵێ ژنەکەت تەلاق بدە، زۆر گران بوو، ئیبراهیمیش قەت نەیدەویست دڵشکێن بێت.

ئەو قسانەی کە دەیویست بە کوڕی خۆی بگەیەنێ بە توێکڵەوە پێی دەگەیاند، زۆر کەسیش هەن شەرم دەکەن هەندێ قسە بەبێ توێکڵ بگەیەنن، وەک ئەو ژنە دەشتەکییە کە هات بۆ لای سەرکردەکە و سکاڵای کرد پێی گوت: قوربان ماڵمان یەک مشکی لێ نییە!

سەرۆک گوتی: تەماشا بکەن چەند بە جوانی مەبەستی خۆی پێگەیاندم، بڕۆن لە نان و لە ڕۆن و لە گۆشت، چەندی دەوێ پێی ببەخشن. تۆیش هەر کات ویستت مەبەستێک بگەیەنی بە توێکڵەوە بیگەیەنە، زۆر جار هەیە دوورنیازی ئابڕووی مرۆڤ دەپارێزێ.

## وانەی شانزە

ئەگەر خودا شتێکی بە تۆ بەخشیوە، ئەوە شتێکی پێ داوی هیی خۆت نییە

ئەگەر خودا لە شتێک بێبەشی کردی، دیسان ئەوە هیی خۆت نییە

که وا بوو هەر کات پێی بەخشیت سوپاس بکە

هەر کاتێکیش پێی نەبەخشیت خۆڕاگر بە

بەخشین و نەبەخشینی خودا هەمووی پڕە لە کارزانی

پێزانین و خۆڕاگرییش، دوو جۆرن لە خوداپەرستی

هەردوو کردەوەی نێو دڵن، هیچیان بە جەستە ناکرێن

شوکری تەواویش ئەوەیە بیکەی بە ئاکاری خۆت و وەک ڕێگەیەک بیگریتە بەر

گەر خودا ماڵی پێ دایت، سوپاسی خودا بە بەخشین و دەستگرۆیی هەژار دەبێ

ئەگەر لەشساغیی پێ بەخشیت یارمەتیی لێقەوماو بدە

ئەگەر زانستی پێ داویت خەڵک فێر بکە

ئەو خەڵکانەی کە وا ژیرن، هەرگیز لە هەمبەر بەشی خودا مل بانادەن، ناڕازی نین،

سوور دەزانن ناڕازیبوون هیچ کێشەیەک چارە ناکات.

بەڵکوو دەبێتە بەلا و لەسەر بەلا توێ دەبەستێ، یەکەم بەلا بەشنەدانی خودای گەورە، دووەم بەلا ناڕازیبوون لە کاری خودا، دەوڵەمەندی ڕاستەقینەیش ئەو کەسەیە، کە وا دڵی دەوڵەمەند بێت، هەرچەند ئەسپێ لە باخەڵیدا چۆپی بگرێ، تێڕوانینی مرۆڤەکان بۆ دەوروبەر باری ژیانی مرۆڤەکان دیاری دەکا.

لەو دوو جارەی کە ئیبراهیم سەر لە ئیسماعیل دەدا، ژیانی ئیسماعیل وەک خۆی بوو، بەڵام بە لای ژنی یەکەم، تەواو ناخۆش، لە لای دووەم ژیانێکی خۆش، ژنی یەکەم هەرچی هەبوو لە لای کەم بوو، شوکری خودای نەدەکرد و چاویشی لە زیاتر دەبڕی، ژنی دووەم ئەوەی هەیبوو پێی ڕازی بوو، شوکری خودای لەسەر دەکرد، چاوی لە زیاتریش نەبوو... نهێنیی خۆشبەختی وایە، کەم

کەسێکیش پێی دەزانن. هیچ شت ئەوەندەی هەڵسوکەوت لەگەڵ مرۆڤی ناشوکور گران نییە، هیچیش ئەوەندەی هەڵسوکەوت لەگەڵ مرۆی سوپاسگوزار تامدار نییە، خۆ ئیبراهیم مەبەستی تێکدانیماڵی ئیسماعیلی کوڕی نەبوو، بەڵکوو دەیویست هەتا مردن بەختەوەر بێت.

## وانەی حەڤدە

ئێمە بەرفەرمانی چاکەین.

بەلام گەر باوکت گوتی: خێزانی خۆت تەلاق بدە، تەلاقدانی چاکەیەکە و بۆت دەنووسرێ؟ یان قسەی باوکت بشکێنی، گوناهباری؟ بە بێگومان قسەشکاندنی باوکت تاوان نییە، چونکە هەرچی باوک هەیە ئیبراهیم نییە، هەموو کوڕێک ئیسماعیل نییە، کوڕ دەزانێ ژینی لەگەڵ ژنەکەیدا باشە یان نا! زۆر جار هەیە پێکەوە ژیان لەگەڵ خێزان -هەرچەند ئاریشەیشتان هەبێ- لە تەلاقدان زۆر باشترە.

جارەجارە کێشەی نێوان ژن و مێردان بە تەلاقدان نەک هەر کۆتایی پێ نایە، بەڵکوو گەورەتریش دەبێ، جارجارێکیش دایک و باوک بڕیاری باشیان پێ نادرێ، ئەگەر وابێت پێویست نییە بە فەرمانی دایک و باوکت، ژن تەلاق بدەی، هیچ تاوانیشت ناگاتێ.

بەڵکوو تاوانبار ئەوەیە. لەبەر خاتری ژنەکەی لە دایک و باوکی بتۆرێ و تەرکی هاتوچۆیان بکا

دەستی ژنەکەت بەر مەدە و ڕێزی دایک و باوکت بگرە.

بێینەوە سەر چیرۆکەکە:

جارێکی تر ئیبراهیم هات، بینی ئیسماعیل لەژێر دارێکی گەورەدا نزیک زەمزەم تیر دەتاشێت، ئیسماعیلیش چاوی پێی کەوت و لەبەر

باوکی هەستا، وەک باوک و کوڕی تامەزرۆ یەکتریان لە ئامێز گرت و لە حاڵی یەکتریان پرسی، دوایی فەرمووی: ئیسماعیل ڕۆڵەی شیرینم! خودا فەرمانێکی پێ داوم ئەویش فەرمووی: چیی پێ گوتی جێبەجێی بکە.

گوتی: جا یارمەتیم دەدەی؟

گوتی: ئەی چۆن!

گوتی: خودا فەرمانی پێ داوم ئا لێرەدا پەرستگایەک دروست بکەم.

دوایی سووچە بەرزەکانی ماڵی کەعبەی بە ئیسماعیل نیشان دەدا و لەسەر بناغەی کۆنی خۆی کەعبەیان دروست کردەوە.

ئیسماعیل وەک کرێکار و ئیبراهیمیش وەکو وەستا کاریان دەکرد تا دیواریان هێندە بەرز کردەوە دەبوو بچنە سەر شتێک و دیوارەکە بەرزتر بکەنەوە، چوونە سەر ئەم بەردەیە و دیواریان تا سەر هەڵچنی بە دەم کارەوە دەیانگوت: ﴿ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ ﴾ (البقرە) «پەروەردگارمان! ئەم کارەمان لێ وەرگرە، تۆ بەڕاستی زۆر بیسەر و فرە زانای».

## وانەی هەژدە

ئیسماعیل پیاوێکی ڕاوچی و نیشانەشکێنێکی چاک بوو.

ئەم چیرۆکەیش بەڵگەی ڕاستی ئەم قسەیەی تێدا هەیە.

لە سەحیحی بوخاریدا فەرموودەیەکی تێدایە خۆشەویست دەفەرموێ:

بهاوێژن و تیرئەنداز بن، باپیرە گەورەکەی ئێوە نیشانەشکێنێکی چاک بوو. خۆت دەزانی ئەم ئایینە بە خەبات و بەرخودان و تێکۆشان هاتە کایەوە.

بۆیە زۆر زۆر ئاساییە پەیامبەر خەڵکی هان بدا و فێری

سـەربازییان بـکا.

بۆیە فەرمووی: هێز نیشانەشکێنییە... هێز نیشانەشکێنییە، پێشـەوا عومەریش فەرمووی: منداڵ فێری سـواری و مەلـە و نیشانەشکاندن بکەن.

## وانەی نۆزدە

خـودا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى بِبَكَّةَ ﴿٩٦﴾ ﴾ (آل عمران) (یەکەمین مـاڵ کە بۆ مـەردم سـاز کراوە، هـەر ئەوەیە وا لـە مەککـە)، وشــەی (بەککـە) دوو بۆچوونـی لەســەر هەیـە:

یەکـەم دەڵـێ: بەککە و مەککـە لـە مانـادا وەک یەکن، لـە عەرەبیدا زۆر جـار پیتـی میـم و بـا بـە یـەک دەگۆڕێن، وشـەی (لازم) جارجـار دەکرێ بـە (لازب) لـە مانـادا هیـچ ناگـۆڕێ.

دووەم دەڵـێ: بەککە ڕێـک جێی ماڵـی خودایە، بـەڵام مەککە هـەم ماڵـی خـودا هـەم تـەواوی شـارەکەیە کـە وابـوو مەککـە لـە بەککـە گەورەتـرە و بەککە بەشـێکی مەککەیـە، من ئـەم بۆچوونەم لا پەسـەندە.

ئەبـوزەڕ (خـودای لـێ ڕازی بێـت)، لـە خۆشەویسـتی پرسـی: کام مزگەوتـە پێـش هەمـووماڵەکانـی خـودا دروسـت کـرا؟

فەرمووی: کەعبە.

گوتی: دوای ئەو؟

فەرمووی: مزگەوتی ئەلئەقسا.

گوتی: چەند ساڵیان نێوان بوو؟

فەرمووی: چل ساڵ.

پێشــتر ئەوەیشــمان پـێ گوتـن: فریشــتەکان ماڵـی خودایـان لـە مەککـەدا دروسـت کـرد و تۆفانەکـەی نـووح تێکـی دا، پاشـان ئیبراهیـم سـەرلەنوێ ماڵـی خـودای ئـاوا کـردەوە.

## وانەی بیست

**کەعبەی پیرۆز ئێستا وەکو ئەو کاتەیە کە ئیبراهیم دروستی کرد؟**

بێگومان وەڵام نەخێرە، خۆشەویست فەرمووی: ئای عائیشە! کەعبە جاران دوو دەرگای بوو، گەر هۆزەکەت تازە مسوڵمان نەبووبان دەمڕوخاند و وەک ئیبراهیم دیسان چاکم دەکردەوە. باشە بۆچی هۆزی قورەیش وەک ئیبراهیم کاعبەیان چاک نەکردەوە؟

دەزانن بۆ؟ ئەو سەردەمەی کە خۆشەویست هێشتا لاو بوو، لافاو کەعبەی ڕووخاند و قورەیش کۆبوونەوە، هەرچی پارەی حەڵاڵیان بوو خڕیان کرد و کەعبەیان پێ چاک کردەوە، پارە کەم بوو، نەیانتوانی وەک خۆی چاکی بکەنەوە، چەند گەزێکیان لێ بەجێ هێشت، تاکو ئێستایش هەر جێماوە و بە دیوارێکی کورتیلە بونیادیان نا.

لە سەردەمی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیردا کەعبەیان نوژەن کردەوە، بەڵام دیسان ئەو کەمەیان بەجێ هێلا، سەردەمانێک ئەبومەنسوور ویستی چاکی بکاتەوە، پرسی بە ئیمام مالیک کرد، ئیمام فەرمووی: چاکی مەکە، با نەبێتە یاری دەستی پاشا و کاربەدەستان، بۆیە ئێستایش وەک سەردەمی قورەیش ماوە.

## وانەی بیستویەك

**ئەم بەشەمان بە کورتە باسێکی کەعبە و بەشەکانی تەواو دەکەین.**

**یەکەم: بەردە ڕەشەکەیە.**

فریشتەکان ئەو بەردەیان لەنێو بەهەشت هێنایە خوار،

فەرموودەیەک هەیە دەڵێ: کاتێ ئەو بەردەیان هێنا، ڕەنگی لە شیر سپیتر بوو.

گوناهی بەندەکانی خودا ئاوای لێ کرد.

با لێرەدا ڕابوەستین

گەر گوناه- بەردی بەهەشت وەک قیر لێ بکا

دەبێ چی بەسەر دڵ بهێنێ

خۆ دڵ لە خاکی سەر زەوی چێ کراوە.

ئەو بەردە ئێستا هەشت پارچەیە.

سەردەمانێک قەڕامیتە هاتن کەعبەیان داگیر کرد، بەردیان دزی، لە دوای بیست ساڵ هێنرایەوە. قەڕامیتە هۆزێکی زۆر تاوانبار بوون، هاتن مەککەیان داگیر کرد. ڕۆژێک پێش ڕۆژی عارەفە دەستیان کرد بە حاجیکوشتن، لاشەی بیست هەزار مسوڵمان خرایە ناو بیری زەمزەم، ئەبوتاهیری قەرمەتی (نەفرینی خودای لەسەر بێت)، لە لای دەرگای شاری مەککە لەسەر ئەسپەکەی وەستابوو.

دەیگوت: من خودام، خودایش منم، خۆم ئەم خەڵکەم بەدی هێنا، خۆم هەموویان لەناو دەبەم.

یەکێکی تر لە بێشەرمیی قەرمەتییەکان: ڕۆژێک یەک لەو قەرمەتییانە بە پیاوێکی زانای دەگوت: خودا دەڵێ: ﴿ فِيهِ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ مَّقَامُ إِبۡرَٰهِيمَۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنٗاۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾ ﴾ (آل عمران).

دەی کوا خودای ئێوە لەکوێیە؟

زانا فەرمووی: ئەیهو نەزان! خودا فەرموویەتی هەر کەس چووە نێو کەعبەوە ڕێزی بگرن، بیپارێزن.

ئەم ئایەتە بۆ فەرمانە.

دووەم شوێنی ماڵی کەعبە ئەو شوێنەیە کە پێی دەڵێن حیجری

ئیسماعیل.

ئەمەیش نیوە بازنەیەکە، لە تەنیشتی ماڵی خودا لە شەرعدا ئەم نیو بازنەیە بەشێکە لە کەعبەی پیرۆز هەر کەس لەنێوان ماڵی خودا و دیواری ئەو نیو بازنەیە تەواف بکات، دروست نییە، چونکە تەواف بریتییە لە هەڵسوڕان بە دەوری کەعبەی پیرۆزدا، ئەودیو ئەو دیوارە نزمە بەشێکە لە خودی کابە.

سێیەم: مەقامی ئیبراهیم.

ئەو مەقامی ئیبراهیمە بریتییە لەو گاشە بەردە گەورەیە کە کاتی خۆی ئیبراهیم لەسەری وەستا و دیواری کابەی هەڵچنی، بە ویستی خودای گەورە و مەزن لەو دەمەدا کە ئیبراهیم لەسەر ئەو بەردە وەستا بوو، جێی هەردوو پێی لەسەر بەردەکە وەدەر کەوت.

دیسان لێرەیش دەبێ بوەستین، ئیبراهیم بە هێزی باوەڕ دڵی خۆی بۆ پەروەردگار نەرم کردبوو، خودایش تەختەبەردی ڕەقی لەژێر پێیدا نەرم گەڕاند، هۆزی قورەیش دەیانزانی ئەم شۆپانە شوێنەواری پێی حەزرەتی ئیبراهیمە. ئەو بەردەیش لە تەنیشت دیواری کەعبە بوو.

بەڵام بە فەرمانی عومەر، چەند گەزێک دوور خرایەوە، هەتا حاجی بە ئاسانی نوێژی مەقامی ئیبراهیم بەجێ بهێنن.

# موسا و خدر

پێشەوایان بوخاری و موسلیم فەرموودەیەک دەگێڕنەوە، خۆشەویست فەرموویەتی:

ڕۆژێ موسا گوتاری بۆ خەڵکی دەدا.

لێیان پرسی: زاناترین مرۆڤ کێیە؟

فەرمووی: من.

خودا گلەیی لە موسا کرد، بۆچی نەتگوت: خودا دەزانێ؟

پاشان خودا سروشی بۆ موسا نارد، لەو جێگەیەی دوو دەریاکە یەکتر دەگرن پیاوێک هەیە، زانیاریی لە تۆ زیاترە،

موسا فەرمووی: پەروەردگار چۆن پێی بگەم؟

فەرمووی: ماسییەک بهێنە بیخەرە ناو زەنبیلەیەک، لە هەر شوێنێ ماسیت ون کرد، ئەو لەوێیە ماسی خستە ناو زەنبیلە و لەگەڵ یوشەع ملی ڕێگایان گرتە بەر، گەیشتنە لای تاشە بەردێک، ڕاکشان و کەمێک نوستن، ماسی گیانی وەبەر هات و لە زەنبیلەکە دەرپەڕی کەوتە نێو ئاو، ڕێگەی ناو دەریای گرتە بەر: ﴿ فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ سَرَبًا ﴿٦١﴾ ﴾ (الكهف).

یانی: ئەویش بە هەڵتەک و داتەک خۆی گەیاندەوەتە دەریاکە لە پاش ئەوەی لە خەو هەستان، یوشەع بیری چوو پێی بڵێ ملی

ڕێگایان گرتە بەر، ڕۆژی دوایی موسا گوتی:

﴿ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَـٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَـٰذَا نَصَبًا ﴿٦٢﴾ ﴾ (الكهف).

یانی: لەو سەفەرە زۆر شەکەت بووین، ئادەی خواردنەکە بهێنە، یوشەع بە بیری هاتەوە و باسی ماسی گێڕایەوە ﴿ قَالَ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَـٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ ۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا ﴿٦٣﴾ ﴾ (الكهف).

گوتی: ئەوسا کە لە پەنا بەردەکەدا دەساینەوە دیتت چلۆن من ماسییەکەم لە بیر چوو؟ دیارە شەیتان نەیهێشت وە بیرم بێتەوە، ئەمیش وەک شتی سەمەرە ڕێگەی دەریای گرتە بەر.

موسا گوتی:

﴿ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ ۚ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا ﴿٦٤﴾ ﴾ (الكهف).

یانی: ئێمەیش هەر شتێکی وامان دەویست ئیتر بە شوێنپێی خۆیاندا بە چاوگێڕان گەڕانەوە.

ئەم جار بۆ دوا گەڕانەوە تا گەیشتنەوە جێگای خۆیان، پیاوێکیان بینی خۆی لە جلوبەرگ پێچابوو، موسا سڵاوێکی لێ کرد، پیاوەکە بە موسای فەرموو: کوا لەم ئاخە سڵاوکردن بوونی هەیە؟

موسا فەرمووی: ئەمن موسام.

گوتی: موسای پەیامبەری ئیسرائیلی؟

گوتی: بەڵێ، هاتووم تا لەو زانیاریانەی خودا پێی بەخشیت فێرم بکەی.

گوتی: موسا! خودای گەورە هەندێ شتی فێری من کرد تۆ نایزانی، هەندێ شتی فێری تۆ کرد، من نایزانم.

موسا گوتی: شوێنت کەوم؟

گوتی:

﴿ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴿٦٨﴾ ﴾ (الكهف).

یانی: تۆ هەرگیز ناتوانی لەگەڵ مندا دەر بەری، نەخوازە گەر ئاگاداری کاریش نەبی، چۆن دەردەبەی؟

موسا گوتی:

﴿ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعْصِي لَكَ أَمْرًا ﴿٦٩﴾ ﴾ (الكهف).

یانی: ئەگەر خودا حەز بکا خۆڕاگریم دەبینی و هیچ نافەرمانیەکت ناکەم.

خدر گوتی:

﴿ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْـَٔلْنِي عَن شَيْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴿٧٠﴾ ﴾ (الكهف).

یانی: گەر شوێنم کەوتی هیچ شتێکم لێ مەپرسە هەتا بۆ خۆم دەربارەی باست بۆ دەکەم.

جا دەستیان کرد بە ڕۆیشتن و بە قەراخی دەریاکەدا ملی ڕێگایان گرتە بەر. لەو دەمەدا کەشتییەک لەوێ تێپەڕی، بە کەشتیوانەکەیان گوت: سوارمان دەکەی؟

کەشتیوان خدریان ناسی، بێ بەرانبەر سەریان خستن... لەدوای سوار بوون، خدر بە نوێڵ بەر بووە تەختەی ژێر کەشتی و یەک دوو پارچە تەختەی شکاند، موسا گوتی: ئەوە چیت کرد، ئەوان خاتریان گرتین و بە خۆڕایی سواریان کردین، تۆیش دەتەوێ کەشتییەکەیان ژێر ئاو بخەی؟ ئەو خەڵکانە دەخنکێنی؟کارێکی ناشیرینت کرد.

گوتی: نەمگوت تۆ ناتوانی لەگەڵ مندا بەردەوام بیت؟

موسا گوتی: لە بیرم چوو، لێم ببورە و بە ئاسایی لێم وەرگرە.

لەو دەمەدا باڵندەیەک لەسەر لێواری کەشتییەکە لەنگەری گرت، یەک دوو دەنوکی لە ئاو دا.

خدر گوتی: ئەو باڵندە چەند لەو ئاوەی کەم کردووە، زانستی هەردووکمان هێندەی لە زانیاریی خودای مەزن کەم نەکردووە. لە پاش ئەوەی دەریاکەیان بەجێ هێشت و دوور کەوتنەوە دایان بە لای منداڵێکدا، لەگەڵ منداڵانی تردا کایەی دەکرد خدر مستێکی وای لێ دا، هەر لەوێدا گیانی دەرچوو.

موسا گوتی: چۆن گیانێ پاکت زایە کرد، بەبێ ئەوەی هیچ تاوانێکی کردبێ و کەسی بە ناهەق کوشتبێ؟ کارێکی زۆر نابەجێت کرد.

خدر گوتی: ئەی من نەمگوت تۆ ناتوانی لەگەڵ مندا خۆڕاگر بی؟

موسا گوتی: پاش ئەم جارە ئەگەر هیچم لە تۆ پرسی هاورێم مەبە و هیچ گلەییشت لێ ناکەم، دیسان ڕۆیشتن، هەتا گەیشتنە خەڵکی شارێ، داوای خواردنیان لێ کردن، ڕازی نەبوون ڕایانبگرن، دیوارێکیان لەوێ بینی، خەریک بوو بە لادا دەهات، خدر نۆژەنی کردەوە.

موسا گوتی: گەر بتویستایە کرێی ئەم کارەت وەردەگرت.

خدر گوتی: لە یەکتر جیا دەبینەوە، وا ئێستاکە نهێنیی ئەو ڕووداوانەت بۆ باس دەکەم، کە نەتتوانی خۆت بگری.

پەیامبەر فەرمووی: خودا سۆزی خۆی بەسەر موسادا ببارێنێ، ئەگەر خۆڕاگر بوایە، خودا زۆر شتی لەوە زیاتری بۆ باس دەکرد.

## وانەی یەکەم

تۆ خاکی بە.

زۆربەی جار مرۆڤ حەزی لە خۆبینی و پۆزلێدانە، بە واتایەکی تر بڵێم: زۆربەی زۆرمان لە کاری خۆ، وا دەزانین کەس ئەوەندەی

ئێمە شارەزایی نییە، کەم جار پزیشکێک دەبینی، خۆی لە ئەبوعەلی سینا بە پزیشکتر نەزانێ، کەم جار شاعیرێک دەبینی، خۆی بە گەورەترین و شاعیرتر نەیەتە بەر چاو، زۆربەی مامۆستا و وانەبێژ وا دەزانن کەس وەک ئەوان لە وانەبێژی نازانێ، ئەندازیار و کارەباچی و وەستای دیوار... ئەوانیش وان، تەنانەت ئافرەت لە ماڵدا وا دەزانێ کەس وەکو ئەو چێشت لێنانێ ڕێزلەخۆگرتن شتێکە و خۆت لە هەموو کەس زاناتر بێتە بەر چاو شتێکی ترە.

هەرچەند موسا کەلیموڵڵا و بژاردە و پەیامبەریش بوو، هەرچەند یەک بوو لەو پێنجانەی لە ئاست پەیامبەرانی تر لە لای خودا پلەوپایەیان بەرزترە، هەرچەند موسا سروشی لای خوداوە بۆ دێ، بەڵام هێشتا خودای گەورە گلەیی لە موسا دەکا.

بۆچی گوتت: هیچ کەس وەک من زانا نییە، بۆچی نەتگوت، خودا دەزانێ؟ بەڵێ! وا نەزانی تۆیش لە گشت کەس زاناتری، هەرچەند تۆ لە زۆربەی کەسان زاناتر بی، بەڵام باش بزانە لەو بوارەی کە پسپۆڕی لە خەڵکی تر زاناتری، نەک لە هەموو بوارێکدا.

تۆ لە یەک شت، خەڵکی تریش لە سەدان شت وەک تۆ زانا، بگرە لە تۆ زاناترن.

هەموو کەسێ هەم زانایە، هەم نەزانە.

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ (النحل). «ئەگەر ئێوە نەتانزانیوە، سا لەو کەسانە بپرسن کە کتێبیان خوێندۆتەوە»، نەبووە و نابێ تاقە کەسێ هەموو شتێک بزانێت و لە هەموو کەس زاناتر بێت، ئەگەر تۆ کوردیزانێکی زۆر مەزنی و لقوپۆپی زمانی کوردی گشت دەزانی، ئەمە واتای ئەوە نییە تۆ پزیشکی ئەندازیارێکی بێوێنەی، ئەمە مانای ئەوە نییە کە پسپۆڕی لە دادگادا، پزیشکێکی فرەزانی، ئەمە مانای ئەوە نییە تۆ

موفتی و شەرعزانی، ڕێزی کاری خەڵکی بگرە، هەرچەند ئەو کارە لە لای تۆ بێبایەخ بێت، لەوانەیە سەدان پزیشک نەتوانن بەلوعەیماڵێک چاک بکەنەوە.

هەزار ئەندازیاری مەزن لە ئاست نەشتەرگەریی نەخۆشێک دەبنە مام حاجی و ناتوانن هەرە لە برە جیا بکەنەوە.

خودای گەورە، بۆیە خودا زانایە بە هەموو شتێک، پێویستی بە هیچ کەس نییە، کارێکی وایشی کردووە مرۆڤەکان ئاتاجی یەکتر ببن و بەبێ یەکتر نەیانکرێ.

## وانەی دووەم

ئەم چیرۆکە پرسێک لای خوێنەران دروست دەکات، پایەی خدر یان هیی موسا کامیان لای خودا بڵندترە؟ بێگومان بە پایەی موسا... باس هاتە سەر پایەبەرزی پەیامبەران، پایەی پەیامبەری ئیسلام لە هیی هەموو پەیامبەران بڵندترە، دوای ئەو پایەی ئیبراهیمە، دوای ئەو نووح و موسا لەگەڵ عیسا، خودا خۆی دەزانێ کامەیان پایەی لەوی تر بەرزترە.

چۆن دەبێ زانستی خدر لە هیی موسا زیاتر بێت؟ وەڵامەکەی زۆر ئاسانە، بەڕێزی و پایەبڵندی لە لای خودا تەنیا بە زانست نابێت، نابێ تەنیا یەک سووچ بەر چاو بگری و ئەوانی تر فەرامۆش بکەی، تۆ تەماشای هاوەڵانی پەیامبەر بکە، (ئوبەی) لە قورئان خوێندندا یەکەمین بوو، کەچی عومەر پایەی بەرزترە، لە کاتی جەنگدا کەس وەک خالید نەیدەتوانی نەخشەکێش بێت، بەڵام ئەبوبەکری سدیق پایەی لە هیی پایەی خالید مەزنتر بوو.

لە هەندێ ڕووەوە موعاز لە عوسمان زاناترە، بەڵام پایەی عوسمان لە هیی موعاز گەلێ بڵندترە، هەندێ هاوەڵ لە هەندێ کار

لە عەلی زاناتر دەبوون، بەڵام پایەی عەلی لە هیی ئەوان بەرز و بڵندترە.

خدریش وا، لە هەندێ شت لە موسا زاناتر بووە، بەڵام پلەی موسا زیاتر خودا گلەیی لە موسا کرد: بۆچی نەتگوت خودا دەزانێ کێ لە گشت کەس زاناترە؟ بەڵام فرمانی پێ نەکرد بە شوێن خدردا عەوداڵ بێ.

کەچی موسا خۆی حەز دەکا کەسێکی زانا ببینێ و زانست فێر بێت، بەڵێ زانا زۆر گەورەکان ئا بەم جۆرە خاکی دەبن، موسایش کەسێکی مەزن بوو، هەرگیز نەکەی لە لات نەنگ بێت لە لای کەسێک زانست فێر بی، تەمەنی لە تۆ کەمتر بێت، چاو لە گەورەیی موسا بکە، وەکو ئەو بە، لە چەند ئایەتدا خودای گەورە بە شێوەیەک باسی دەکا، هەموو کەسێ خۆزگە بە موسا دەخوازێ.

﴿ وَٱصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي ﴿٤١﴾ ﴾ (طه) «من تۆم کردە تایبەتیی خۆم».

﴿ وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِيٓ ﴿٣٩﴾ ﴾ (طه) «تا لەژێر چاودێری خۆم بپەروەرێی».

﴿ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي ﴿٣٩﴾ ﴾ (طه) «ڤیانی خۆم خستە سەر تۆ».

﴿ وَأَنَا ٱخْتَرْتُكَ ﴿١٣﴾ ﴾ (طه) «هەر خۆم تۆم دەستنیشان کرد».

ئەم موسایە کە ئەم هەموو ڕێزەی پێ درا، وای لێ نەهات بڵێ: من چۆن بچمە لای کەسێکی تر زانست فێر بم.

پیاوی گەورە بەم جۆرەیە، تۆیش گەورە بە.

## وانەی سێیەم

زانست فێربوون ئاسان نییە.

تۆ تەماشا مستە ئاردێ چەند بە گران دەبێ بە نان، ئەی زانست چۆن خوتوخۆڕا چنگ دەکەوێ؟ تۆ تەماشای بوخاری بکە،

بۆ یەک حەدیس لە شارێک بۆ شارێکی تر سەفەر دەکا، شافیعی بە دەستنوێژی نوێژی عیشا، نوێژی بەیانیشی دەکرد.

دەزانی بۆ؟ چونکە شەوان هەتا بەیان، نوستن نەبوو، هەر خەریکی زانست دەبوو.

وەک لەم چیرۆکەدا دیارە موسا بیری لە ناخۆشیی ڕێگا و سەفەر نەکردەوە و بۆ فێربوونی زانست کۆشا.

نە ئۆتۆمبێل و نە فڕۆکە، هیچیان نەبوون، ڕێیەکی زۆر لە ماوەیەکی زۆر کەمدا تێپەڕێنێت.

نووسینگە هەر نەبوو، تا بڕوات و مامۆستاکەی تێدا ببینێ. ئامێری لەبەرگرتن و ئیستینساخیش نەبوو، کاغەز و قەڵەمیش نەبوو، دەشتێکی کاکیبەکاکی، چۆڵەوانی، بەرز و نزم، ڕێگای سەختی هەمووی بە پێی خۆی دەبڕی، تاڵیچەشتن لەبەر زانست هەر تاوێکە، بەڵام تاڵاوی نەزانین تا کۆتایی ژیان لەگەڵتە، هەرکەس چەند ڕۆژ تاڵاو چێژبێت، تاڵاوی ژینێکی درێژ دەتفێنێتەوە.

## وانەی چوارەم

خدر شتێکی وای فەرموو، پێویستە لێی ڕابمێنین، خدر فەرمووی: من زانستێکی وام لایە -خودا بە منی نیشان داوە- تۆ نایزانی، تۆیش جۆرێ زانستت لایە -کە خودا بە تۆی نیشان داوە- من نایزانم.

زانست بە گشتی دوو جۆرە:

یەکەم: جۆرە زانستێکە خوداییە، خودای مەزن بە هەندێ کەسی دەبەخشێ.

جۆری دووەم: زانستێکە -پاش ویستی خودا- مرۆڤ بە گەڕان بە شوێنیدا و هەوڵدان و خۆڕاگری چنگی دەخا.

جۆری یەکەم ڕێگەیەکی دیاری نییە تا مرۆڤ بۆی بگرێتە بەر، بەڵام ڕێگای جۆری دووەم زۆرە و هەیە، پەیامبەریش فەرموویەتی: زانست تەنیا بە فێربوونە، باری ژیانیش ڕێک ئاوایە، جارجار خودا بەبێ هۆکار زۆر شت بە مرۆڤ دەبەخشێ.

زۆر جار پێویستی بە هەوڵ و تێکۆشانە، مرۆی ژیریش دەست بە هۆکارەوە دەگرێ و وەک تاکە ڕێ بۆ گەیشتن بە ئاوات و ئامانجەکان لێی دەڕوانێ، لە هەمان کات لە بیری ناکات، کە هەموو شت بە دەست خودایە، گەر نەیەوێ پێت ببەخشێ، سەدان هۆکار بەکار بهێنی، پێت نابەخشێ. گەر خودای مەزن شیفا بۆ ئەیوب دەنێرێت -بەبێ ئەوەی ئەیوب دەرمان بەکار بهێنێ - ئەمە مانای وەها نییە کە تۆیش چیتر نەچیتە لای پزیشکێک و دەرمان نەخۆیت.

گەر منداڵ بە مەریەمی پاک دەبەخشێ بەبێ ئەوەی هاوسەرگیری بکات، ئەمە مانای ئەوە نییە بەبێ هاوسەرگیری، کیژان منداڵیان ببێ.

ئەگەر خودا یونس لەنێو زگی نەهەنگ دەپارێزێ، ئەمە مانای ئەوە نییە زگی نەهەنگ بۆ ژیان دەبێ، ئەگەر خودا بەهۆی گۆچانەکەی موساوە، دەریای مەزن دوو لەت دەکا، ئەمە مانای ئەوە نییە هەرچی گۆچانە ئاوایە، ئەم کارانە مانای وایە کاروباری ئەم جیهانە هەمووی بە دەستی خودایە، یاسا و ڕێسای بۆ داناوە و لە خۆی زیاتر کەس ناتوانێ لێی لا بدا.

دەبێ ئێمەیش بەپێی ڕێسای ئەم گەردوونە کار بکەین و لێی دەرنەچین، ئەگەر مرۆڤ هیچ پێویستی بە هۆکار نەبا، ئەوا پەیامبەری خودا لە هەموو کەس شیاوتر دەبوو، کە پێویستی بە هیچ نەبێ، کەچی پەیامبەر دەستی لە هۆکار بەند دەکرد. تەماشا بکە، لە کاتێکدا لە مەککەوە بەرەو مەدینە کۆچی کرد، بزانە چی

کرد... پێش هەموو شت هاوەڵێکی دیاری کرد و کردی بە هاوڕێ و هاوسەفەر لە پاش ئەوەیش شارەزایەکی پەیدا کرد ڕێگەکەیان پێ نیشان دا.

دواییش کەسێکی دیاری کرد کە خواردنیان بۆ بهێنێت،

ئینجا یەکێکی دیاری کرد بە ڕانی بزن و مەڕەوە بەدوایاندا بچێ و جێپێی خۆی و ئەبوبەکر بسڕێتەوە، لە دوای ئەوەیش لە ڕێیەکی چەپەکەوە سەفەرەکەیان دەست پێ کرد.

بەم کارانە پەیامبەر فێری ئەوەمان دەکا واقیعبین بین.

## وانەی پێنجەم

خودای گەورە جارجار مرۆڤ تووشی کێشەیەکی بچووک دەکا و لە ئاریشەیەکی مەزن دەیپارێزێ، هەرچی کێشە و ئاریشەیشە، پڕیەتی لە سۆزی خودا، بەڵام بیر و چاوی مرۆڤ بۆی ناچێت و نایشیبینێت، جا ئەو سۆزە یان بۆ دونیا بەکەڵک دێت و سوودی هەیە، یان لە ڕۆژی قیامەتدا دەگات بە فریای ئەو کەسە، کە لە دونیا تووشی ئاریشەکە بووە.

گەر خدر کەشتییەکەی کون نەکردایە، پاشا لێی داگیر دەکردن، دەی خۆت بڵێ کامە باش بوو؟

کەشتییەکەی بۆ خاوەنە هەژارەکانی بمێنێ -هەرچەند سەرنشینەکانی کەمێک تووشی ئەزیەت و ترس و بیم هاتن- یاخود ئەوەی بە یەکجاری کەشتییەکەیان لەدەست دابا؟

بێگومان هەندێ ئاریشە لە هەندێکی تر کەم ئێشترە، بەڵام مرۆڤ خۆی نازانێ.

گەر قورئان ئەو چیرۆکەی باس نەکردبا، ئێمەیش نەماندەزانی کە حیکمەتی کونکردنی کەشتی لە کوێدایە، گەر ژیانی مرۆڤەکان

مرۆڤیان لەسەر دوو ڕێیان -یەکێ ڕێگەی دەربازبوون و یەکێ ڕێگای نەهامەتی- داناباییە، زۆر ئاسان بوو کام ڕێگەیان هەڵبژێری.

بەڵام زۆر جار لەنێوان دوو ڕێگا دەبین هەردوو خراپ!

پێشەوا عومەر دەفەرموێ: مرۆڤی ژیر ئەوە نییە چاک و خراپ لێک بکاتەوە، ژیر ئەوەیە لە دوو خراپ خراپترین دەستنیشان بکا.

جارجار زیانێکی بچووک لە خەسارەتێکی مەزن دەتپارێزێ، بۆیە دەبێ لای ئەو بچووکە بگری.

جار جار پزیشک کورپەی نێو زگ لەناو دەبا، تا دایکەکە سەلامەت بێ، زۆر کەس دەستی دەبڕنەوە، یاخود لاقی، لەبەر ئەوەی لە نەخۆشی دەربازی بێت و هەموو لاشەی داگیر نەکا، زۆر بژاردە هەیە، تاڵە، بەلام چی بکەی؟ ڕزگاری بەو بژاردەیەوە بەستراوە.

ماندوویی و خۆڕاگریی زۆر لە بێکاری باشترە، من پێت ناڵێم هەتا مردن هەر ماندوو بە، بەڵکوو دەبێ تا کارێکی ئاسانتر و لەبارترت دەست دەکەوێ، خۆڕاگر بیت، زۆر جار هەیە ژنێ لە لای مێردی بەدفەر دابنیشێت و خۆڕاگر بێت، هەم بۆ خۆی و هەم بۆ منداڵی وا باشترە.

چونکە لەنێوان دوو ڕێگادا قەتیس ماوە، ئەو ڕێگەیان کە شیرینە وەک گوژاڵکی دیمی تاڵە.

بەلام چ بکا شیرینەکە وەک گوژاڵک بێت، دەبێ تاڵەکەیان چۆن بێت؟ مرۆڤی ژیر ڕادەمێنێت، کامیان کەمێ کەمتر تاڵە ئەویان دەستنیشان دەکا... جارجارێکیش ژینێکی تاڵ لەگەڵ ژنێکی بەدفەڕدا لە تەلاقدان شیرینترە، چونکە جارجار ئەو ڕێگەیەی تۆ پێت باشە، کۆتاییەکەی لە بەردەرگای کێشەی گەورە و خراپترە.

کەمێ پێش ئێستاکە گوتمان: جا ئەو سۆزە یا بۆ دونیا بەکەڵک

دێت و سوودی هەیە یان لە ڕۆژی قیامەتدا دەگات بە فریای ئەو کەسە کە لە دونیا تووشی ئارێشەکە بووە.

باسی ئەوەی دونیامان کرد، با بێینە سەر باسی ئەوەی بۆ قیامەت دەگات بە فریای ئەو کەسە.

ئەم نموونە لە کوژرانی ئەو منداڵە خۆ دەنوێنێ، خدر کوشتی زۆر شت هەن مرۆڤ سەری لێ دەرناکا، چونکە کەوشەنی زانستی مرۆڤەکان زۆر بەرتەسکە، ئەو دایک و باوکە چوزانن ڕۆڵەکەیان گەورە ببێت، دەبێت بە کافرێکی وا، کە ئەوانیش کافر دەکا؟ خودای مەزن لە نێوانی دوو خراپدا، خراپی سووکی پێ دان و ئیمانیانی سەلامەت کرد.

بێگومان بە! منداڵ مردن هێندەی باوەڕنەمان بە خودا گران نییە، دیسان لەوەیش بێگومان بە، کە خودای گەورە مادەم باوەڕی ئەو دوانەی مەبەست بووە، دڵیشیان ئارام دەکاتەوە و سەبووریيان پێ دەبەخشێ، کاتێ خودا شتێک لە تۆ دەسەنێت، تۆ نازانی حیکمەتەکەی لە چیدایە، بەڵام تەواو دڵنیا بە، ئەو شتانەی تۆ بە خراپیان دەزانی، مەرج نییە هەموویان خراپ بن، ئەو شتانەیش تۆ بە باشیان دەزانیت و هەناسەی بۆ هەڵدەکێشی، مەرج نییە هەموویان وا چاک بن، چاک لەو بەش و پاژەدایە خودا بۆ تۆی ڕەوا دیوە.

## وانەی شەشەم

گەر لە ئایندەی منداڵت ترست هەیە، نەکەی حیساب بانکی گەورە و ماڵ و میراتیی زەبەندە بەجێ بهێڵی، هەرکەس تەنیا میرات بۆ منداڵەکانی بەجێ بهێڵێ، ئەو کەسەیە منداڵی بۆ هۆکارەکان جێهێشتووە، بەڵام هەرکەس خوداپەرستی بەجێ بهێڵێ، ئەو کەسەیە

منداڵی خۆی بۆ خودای هۆکار بەجێ دەهێڵێ، هۆکارەکان دێن و دەچن، تەواو دەبن، بەڵام خودا هەرگیزاوهەرگیز تەواو نابێت و هەر دەمێنێت.

تەماشای بەری ئیمان بکە لە لای خودا پیاوێکی باش لەسەر زەویی خودا لە قورئان پەسنی دەدات، نە ئێمە دەزانین کێیە، نە موسا دەزانێ کێیە، نە خدریش، بەڵام خودا بەندەکانی خۆی دەناسێت، ئەو پیاوە چەند مەزنە، لەسەر زەوی کەس نایناسێ، بەڵام لە ئاسمانەکاندا ناوی هەیە و تەنانەت لە قورئانیشدا باسی دەکرێ، خودای مەزن پەیامبەرێکی زۆر گەورە و پیاوباشێکی خۆی دەنێرێت، تا دیواری نیو رووخاوی ئەو کەسە سەرلەنوێ چاک بکەنەوە، تا گەنجینەکەی ژێر دیوار کەس نەیبات و بۆ منداڵی ئەو کەسە بمێنێت و زایە نەبێت.

دڵنیایی لەمە زیاتر؟ چیت گەرەکە؟ کێ دەتوانێ وەکو خودا مافی خەڵکی بپارێزێ؟

ئەو رۆژەی کە مەنسوور بووە کاربەدەست و سۆزیان پێ دا، موقاتیل سەردانی کرد و مەنسوور گوتی: ئەی موقاتیل ئامۆژگارییەکم بکە! گوتی: بە چی، بەو شتانە کە من دیومە؟ یان بەوانەی کە بیستوومە؟

مەنسوور گوتی: بەو شتانەی کە بینیوتە.

ئەویش گوتی: قوربان عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ئەو رۆژەی مرد یانزە کوڕ و هەژدە دیناری میرات بوو.

پێنج دیناریان دا بە کفن، چواریش بە قەبر، نۆ دیناریش بوو بە بەشی کوڕەکانی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیکیشم بینی، ئەو رۆژەی مرد یانزە کوڕی لێ بەجێ ما، هەر کوڕێکی یەک ملیۆن دیناری بەر کەوت، بە خودا قوربان، لە رۆژێکدا کوڕێکی عومەرم بینی،

سەد ئەسپی بۆ غەزا دەنارد -هەر هەمووی کردبوو بە خێر- لە هەمان ڕۆژ کوڕێکی هیشامم بینی لە بازاڕدا سواڵی دەکرد.

## وانەی حەوتەم

ئەم چیرۆکە فێرمان دەکا لە بەرانبەر خودای گەورە زۆر بە شەرم و بەئەدەب بین.

چەند گرنگە لەم ڕۆژانە مرۆڤ ئەدەب بەکار بهێنێ، لەم ڕۆژانە شەرم و ئەدەب خەریکە کەم دەبێتەوە وەک دەزانی ئەو کارانەی خدر کردنی، هەمووی بە فەرمانی خودا بوون، بەڵام کاتێ لەو کارانەی کە وا کردنی، ئەوانەی وا بە ڕواڵەت خراپ دەبوون دەیگوت خۆم بووم، ئەوانەیشی کە چاکە بوون، دەیگوت خودای گەورە ویستی.

بۆ نموونە: موسا پرسیی: ئەم کارانە هۆکەی چی بوو؟

خدر گوتی: ﴿ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَٰكِينَ يَعْمَلُونَ فِى ٱلْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴿٧٩﴾ ﴾ (الكهف)

(کەشتییەک بۆ هەژارانێک بوو، لە دەریا کاریان دەکرد، ویستم کە عەیبداری بکەم، کە لەم لایان پاشایەک بوو هەموو گەمییەکی زەوت دەکرد.)

ئەها سەیر بکە: دەڵێ: ویستم عەیبداری بکەم.

چەند بەئەدەب باسی شکانی کەشتییەکە دەخاتە سەر گەردنی خۆی، خۆ خودا فرمانی پێ دابوو وای لێ بکا.

بۆ باسی منداڵەکەیش خدر دەڵێ: ﴿ وَأَمَّا ٱلْغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَآ أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدْنَآ أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَوٰةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴿٨١﴾ ﴾ (الكهف). کوڕێژگەکەیش دایی و بابی مسوڵمان بوون، ترسم بوو ناچاریان بکا لە فەرمانی خودا دەر بچن و کافر

ببن، ئێمە ویستمان پەروەرندەی دایی و بابی بە ڕۆڵەیەکی دڵپاک و بەزەدارتر بۆیان تێهەڵنێتەوە) لێرە خدر بە -اردنا- قسە دەکا، یانی: ویستمان، لەم بەشەدا بە ناوی خۆی و خودای گەورەوە قسە دەکا، کوشتن دەخاتە ئەستۆی خۆی، ڕەحمەتەکەیش هەواڵەی خودای گەورە دەکات، دیسان لە باسی دیواردا تەماشاکە:

﴿ وَأَمَّا ٱلْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِى ٱلْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُۥ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ﴿٨٢﴾ ﴾ (الكهف).

«دیوارەکەیش بۆ دوو کوڕیژگەی سێوی بوو لەم بازێڕە، لەژێریدا گەنجێ هەبوو هی ئەوان بوو، باوکیشیان لە مێرخاسان بوو، پەروەرندەت ویستی ئەم دوانە پێبگەن و گەنجینەی خۆیان دەربێنن، ئەمەیش بەزەیی خودا بوو». لەم باسەدا کارەکان هەر هەمووی چاکە، بۆیە خدر هیچ کارێکیان بە خۆی نادا، بەڵکوو دەڵێ: خودا ویستی.

پاراستنی گەنجینەکە، جەزای چاکەی ئەو مێرخاسە، خدر هیچی بە خۆی نەدا، هەمووی هەواڵەی خودا کرد.

لەم جۆرە ئەدەب و شەرمە لە قورئاندا گەلێک زۆرە، با چەند دانەی تر باس بکەین:

ڕۆژی پەسڵان خودای گەورە بە عیسای مەریەم دەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴿١١٦﴾ ﴾ (المائدە) «ئەرێ عیسای کوڕی مەریەم! تۆ گوتووتە بەم مەردومە -غەیرەز خودا- دەبێ ئێوە من و دایکم وەک دوو خودا بپەرستن؟»

هێندە بەس بوو عیسا بڵێ: نە، سوێند بە خودا.

وەڵامەکەیش پڕ بە پێستە و هیچ کێشەیشی تێدا نییە.

بەڵام شەرمی پەیامبەران بەرانبەر خودا زۆر زۆر لەوە مەزنترە عیسا گوتی: ﴿ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ ﴾ (المائده).

«ئەگەر ئەو قسەم کردبا خۆت دەیزانی، هەرچییەکیشم بە ناخی دڵدا ببوری تۆ دەیزانی، تەنیا منم کە دەربارەت هیچ نازانم، هەر تۆ لە هەموو نەدیاران ئاگاداری» ئیبراهیمیش بە هەمان جۆر لەگەڵ خودای خۆیدا بەئەدەب و شەرمێون بوو، تەماشەکە چی دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهۡدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِي هُوَ يُطۡعِمُنِي وَيَسۡقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضۡتُ فَهُوَ يَشۡفِينِ ﴿٨٠﴾ ﴾ (الشعراء) «ئەوی منی دروست کرد و هەر ئەویش شارەزام دەکا، هەر ئەویشە خواردەمەنیم پێ دەدات و ئاویشم دەفریا دەخا، ئەگەر تووشی نەساغیش بم هەر خۆی چاکم دەکاتەوە».

نەخۆشین بە دەستی خودایە، ئیبراهیم نەخۆش دەکەوێ، نەک ئەوەی خۆی نەخۆش بخات.

بەڵام لەبەر ئەدەب فەرمووی: ئەگەر تووشی نەخۆشی بووم. نەیفەرموو: خودا نەخۆشم بخا.

بەڵام کاتێ باسی شیفا دێتە گۆڕێ، دەفەرموێ، خودا شیفام دەدا، نافەرموێ خۆم شیفام بۆ دێت.

ئەو شتانەی کە چاکە بوون، وەک شیفادان، خواردنپێدان، دروستکردن، هیدایەتدان، هەمووی هەواڵەی خودا کرد، بەڵام چونکە نەخۆشکەوتن بە ڕواڵەت شتێکی باش و چاک نییە، فەرمووی خۆم نەخۆش دەکەوم.

تەماشا حەزرەتی ئەیوب، ئەویش بەرانبەر خودای گەورە چەند بەشەرمە: ﴿ ۞ وَأَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ

ﭐلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ (الأنبیاء) «ئەی خودایە -مەینەتی تووشم هاتووە و تۆیش لە هەموو دڵسۆزەکان دڵسۆزتری».

نەیفەرموو: پەروەردگارا! تۆ نەخۆشیت بەسەر مندا زاڵ کردووە. دەیشیزانی هەر بەڵایەک کە دێتە خوار، خودا دەینێرێ، بێفرمانیی خودای مەزن هیچ ناکرێ.

فەرمووی: خودایە! مەینەتی تووشم هاتووە.

هەر وەک بڵێی مەینەتیی خۆی بە تەنیا هاتووەتە خوار، باسی شیفایشی هەر نەکرد، هێندە ئەدەب بە خەرج دەدا لە ڕووی نایە، بڵێ شیفام بۆ بنێرە، بەڵکوو فەرمووی: تۆ لە هەموو دڵسۆزەکان دڵسۆزتری!

دابی پەیامبەران وابوو، لەو کاتەدا داوای شتیان لە خودا دەکرد، پێش هەموو شت پەسنێکی زۆر باشیان دەدا، لە پاشا ئەوە داواکاریی ئادەم و حەوایش هەر وابوون.

﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾ (الاعراف) «گوتیان: ئەی پەروەردگارمان! ناهەقیمان لە خۆمان کرد، ئەگەر تۆ لێمان نەبووری و بەزەییت پێماندا نەیەتەوە بێ شک لە زیانبارانین»، لەمەوپێش باسی گفتوگۆی نێوان موسا و ئادەممان کرد، ئادەم بە موسای فەرمووبوو: خودا لە چارەی منی نووسی لە بەری ئەو دارە بخۆم.

تەماشای ئادەم! لە کاتێکدا لەگەڵ بەندەیەکی خوادا قسە دەکات، چۆنی دەکا، بەڵام لە خزمەت خودادا جۆری قسەکەی دەگۆڕێ و ئەوپەڕی شەرم بەکار دەهێنێت.

کاتێ لەگەڵ موسا گفتوگۆ دەکات بەرگری لە خۆی دەکات و دەڵێ: چارەنووسم وا بوو.

بەڵام کاتێ داوا لە خودای گەورە دەکات، شەرم و ئەدەب بەکار

دەهێنێت و دەفەرموێ: زوڵمم لە خۆم کرد، بە هیچ جۆرێ باسی لە چارەنووس ناکات و ناوی نابات، تەنانەت جنۆکەکانیش زۆر شەرمنن بەرانبەر بە خودای گەورە، بزانن جنۆکە چی دەڵێن:

﴿ وَأَنَّا لَا نَدْرِيٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴿١٠﴾ ﴾ (الجن)

«تێیشنەگەیوین ئاخۆ دەربارەی ئەوانەی لە زەمیندان بڕیاری خراپ دراوە یان پەروەردگاریان ویستویە ڕاستەڕێیان نیشان بدات»، خودا ئاگاداری گشت شتە، شەڕ یان چاکە، هیچ لە خودا پەنهان نابێت و ناتوانێ خۆی تاقەت بکا.

بەڵام کاتێ باسی خراپە دەکەن و ناوی دەبەن، دەڵێن: بڕیاری خراپ دراوە، یانی کاری بکەر نادیار بەکار دەهێنن، بەڵام کاتێ باسی خێر و چاکە دەکەن، ناوی دەبەن، کاری بکەر دیار دەهێنن: «یان پەروەردگاریان ویستویە ڕاستەڕێیان نیشان بدا».

## ئەو پیاوەی غەدری لە خۆی کرد

پێشەوایان بوخاری و موسلیم هەردوو ڕیوایەت دەکەن، پەیامبەر فەرموویەتی: زەمانی زوو پیاوێ هەبوو غەدری لە خۆی دەکرد و گوناهی زۆری دەکرد، کاتێ گەیشتە گیانەلا و خەریک بوو ڕۆحی دەتکا... بە کوڕەکانی گوت: ڕۆڵە گەر مردم بمسوتێنن، دوایی جوان جوان بمکوتن و بمکەن بە خۆڵەمێش دوایی ڕۆژێکی ڕەشەبا بمدەن بە دەم باوە، بە خودا ئەگەر خودا بیەوێ سزایەکی وەهام دەدا، سزای کەسی وا نەدابێ، لەدوای مردن وایان لێ کرد خودای مەزن فەرمانی دا بە زەوی و پێی فەرموو: وردە وردەی لاشەی ئەو پیاوە کۆ بکەوە.

زەوی خۆڵەمێشی کۆ کردەوە، یەکسەر پیاوەکە زیندوو بووەوە

خودا بە پیاوەکەی فەرموو: بۆچی واتکرد؟

گوتی: خودایە لە ترسی تۆ.

لەبەر ئەوە خودا لێی خۆش بوو.

### وانەی یەکەم

لەم فەرموودەیەوە بینیمان کە ئەو پیاوە زۆر تاوانبار و گوناهکار بوو، بینیمان لەو دەمەی کە لە دونیا دەردەچوو -جگە لە تاوان- هیچ کردەوەی چاکی نەبوو کوڕوکاڵ لای کۆ دەبنەوە، ئەویش دواقسەی

دڵی بە کورەکانی دەڵێ...
بمسووتێنن با لە پێست و گۆشت دەرباز بم.
جوان بمکوتن با لە ئێسقان ڕزگارم بێ
هاڕاوەکەم بدەن بە با
با هیچ شتێکم نەمێنێ شایەتی بەدفەڕیی من بێ
ئەمانە هەموو بۆچی بوو؟
چوون دەیزانی کە سزای خودا زۆر بەژانە
لەو دەمەیشدا لە بەردەم خودا دەیوەستێنن کەس ناتوانێ ڕزگاری بکا
ئەم پیاوە خۆی دانی بە تاوانیدا نابوو، دەیزانی هەرچی پێ بکەن شایەنیەتی
دەیشیزانی جگە لە خودا هیچ کەس هیچی بە دەست نییە
دەیزانی ژیان کۆتایی هات
دەیویست بە هەر جۆرێ هەبێ خۆی ڕزگار بکا
دەیزانی ماوەی تاوانی کۆتایی هات
دەیویست خۆی لە باری تاوان ڕزگار بکا
دەیویست بە دەم باوە بڕوا.
باش دەیزانی تاوانبارە و دەبێ سزای کارەکانی وەربگرێت و هیچ بیانوویشی لە لا نییە تا داکۆکی لە خۆی بکا، لەوانەیشە هێندە زانیاریی لا نەبێ، کە بەرەو لای خودایەک دەڕوا... ئێسکی پواو، گۆشتی نەماو، وەک خۆی دروست دەکاتەوە.

## وانەی دووەم

ئەو خوداناسییەی بە دڵ دەکرێ، بناغەی خوداناسییەکانە، ئەو خوداناسییەی کە تەنیا بە لاشە دەکرێ و دڵ بەشداریی تێدا ناکا کەڵکی

نییە، ئەو نوێژەی بە جەستە دەکرێ و دڵ ئاگای لەو نوێژە نییە، تەنیا جموجووڵە و تەواو، دەبێ مرۆڤ ئاگادار بێ، ئەو قسانەی لەناو نوێژن هەمووی گفتوگۆی مرۆڤە لەگەڵ خودای خۆیدا دەیکا، ڕۆژووگرتن ئەگەر مانای خوداپەرستی تێدا نەبێ، هەر ئازاردانی جەستەیە، لەوە زیاتر چیتر نییە، ئەگەر مرۆڤ لەو کاتانەی بەڕۆژووە، خەڵکی هەژاری لەبیر بێ، واز لە ئارەزووی خۆی بهێنێ، ڕوو لە خودا بکا، ئەو کاتە ڕۆژووی گرتووە.

بێینە سەر حەج، سەفەرکردن بۆ حەجکردن سەیران نییە، دەبێ مرۆڤ لەو کاتانەی کە حەج دەکات، دڵ و گیانی تێر بە نووری خوداپەرستی تێراو بکا، ڕۆحی خۆی خاوێن بکاتەوە.

ترسان لە خودا، خوداپەرستی و عیبادەتە بە دڵ دەکرێ، گەر مرۆڤ بە دڵ باوەڕی بە بوونی خودا نەبێ، چۆن ترسی خودای لە دڵ دەبێ؟

ئەو پیاوەی نێو چیرۆکەکە باوەڕی بە خودا هەبوو، بەڵام پیاوێکی گوناهبار، لەناو گوناهدا ڕۆچووبوو، هیچ دەریچەی نەدەبینی، تا خودای گەورە لێی ببورێ، خۆی دەیزانی کە شایانی سزای خودایە، دەیزانی خودا تۆڵەسێنە، بەڵام ئەو کەسەی سۆزی ئەو هەموو دونیای داپۆشیوە، تەنیا لە شیرک خۆش نابێت و هەموو تاوانێک دەخاتە بەر لێخۆشبوون.

دەزانی چیت لە دڵدایە، پێی خۆشە ناز و نیعمەتت پێ ببەخشێ، چاوەڕێتە دەرگای توبە بکەیتەوە، لێت ببوورێ، ئەگەر پڕاوپڕی دونیا گوناه بکەی، ئەویش پڕاوپڕی دونیا لێخۆشبوونی بۆ تۆ هەیە.

گەر چاوت لە بەخشینی خودا بڕی -هەرچەند گوناهت هێند زۆر بێت وەک تووکی سەر-

خودا دەفەرموێ: لێت خۆش دەبم، باکیشم لە هیچ کەس نییە.

خودا دەیزانی کە ئەو پیاوە لە تەمەنیدا بەرەو چاکە نەڕۆیشتووە،

بەڵام بە دڵ لە خودا ترسا.

خودای گەورە گوناهەکانی گشت بەخشی.

دەزانی بۆ؟ چونکە خودا بەخشندەیە، هەرکەس لە کاتی پرسیاردا دان بە تاوانیدا بنێت و داوای لێخۆشبوونیش بکا، لێی خۆش دەبێ، لە سزای خۆی دەیپارێزێ.

ئەو پیاوە هەرچەند درەنگیش لە خودا ترسا، بەڵام دیسان فریای خۆی کەوت.

## وانەی سێیەم

ترسان لە خودا چەند جۆرێکە

مرۆڤ هەیە لە ترسی خودا تاوان ناکا

مرۆڤ هەیە لە ترسی خودا لە تاوانی ڕابردووی خۆی پاشگەز دەبێتەوە، مرۆی خۆشبەخت ئەو کەسەیە پێش مردنی تۆبە دەکا و لە گوناهی پاشگەز دەبێتەوە، مەرجیش نییە مرۆڤ ئیللا گوناهبار بێ، پاشان لە خودای خۆی بترسێ -هەرچەند چینی گوناهباران دەبێ زیاتر ترسی خودایان لە دڵدا بێت- ئەو کەسانەی خودا دەناسن هەمیشە لە خودا دەترسن.

تۆ تەماشای عومەر بکە، چەند خاوێن و خۆپارێز بوو، بەڵام هێشتا ترسی هەبوو بەزەیی خودا نەیگرێت و سزای بدا، بۆیە دەیگوت: گەر سەربازێکی خودا لە ئاسمان بانگی هەموو خەڵکی بکا: هۆ خەڵکینە، خودای مەزن لە گوناهی هەر هەمووتان چاوپۆشی کرد، تەنیا تاقە پیاوێک نەبێ، دەترسم ئەو پیاوە من بم.

دیسان ئەگەر سەربازێکی خودا لە ئاسمان بانگی هەموو خەڵک بکا: هۆ خەڵکینە، خودای مەزن هەر هەمووتان دەخاتە نێو دۆزەخەوە، تەنیا تاقە پیاوێ نەبێ، هیوام هەیە ئەو کەسە بم.

ترسان لە خودا بەشێکە لە باوەڕ بە خودا.

ئەگەر مرۆڤ ترسی خودای لە دڵدا هەبێ، ئیتر لە هیچ کەس ناترسێ.

دەزانێ ڕزق و ڕۆزییەکەی بە دەست خودایە کەس ناتوانێ لێی دابڕ بکا

دەزانێ کە مەرگ و ژینی بە دەست خودایە، کەس ناتوانێ بەبێ خودا، گیان و ڕۆحی لێ بسەنێت دەزانێ خەڵکی هۆکارن، هەمەکارە هەر خودایە، چارەی گشتی بە دەست ئەوە، گەر بیەوێ شتێ چاک بکا هێندە بەسە بڵێ: ببە، ئیتر دەبێ. بەڕێوەبەر لە کارگەدا یان فەرمانگە بەندەی خودایە، ڕۆزیی ئەویش بە دەست خودایە، ئیتر بۆچی لێی بترسی، نانت ببڕێ؟

وەزیر، گزیر، شوان و سەپان، سەرۆک، هەژار، ڕەئیسعەشرەت، کاربەدەست و بەڕێوەبەر هەر هەموویان بەندەی خودان، بێ خودا هیچیان پێ ناکرێ، تەنیا خوداناسی ڕاستییە مرۆڤەکان لێک جیا دەکاتەوە، ئەو هەژارەی کە خوداناسە، لە لای خودا پلەی زۆر زۆر لەو سەرۆکە بڵندترە، کە هەرگیز خودای نەناسیوە.

دەی کە وا بوو ڕێز بۆ هەموو مرۆڤەکان لە جێی خۆیدا بەکار بهێنە، ترسان لە خودایش مەکە دوو بەش، بەشێک بۆ خودا بەشێک بۆ خەڵک، ئەگەر ڕێزی خەڵک بگری، ئەمە مانای ئەوە نادات، تۆ وا بزانی چارەنووست بە دەست ئەوە، یان لە پێش خودا ئەو کەسە لە خۆت ڕازی بکەی، یان بۆی هەیە تۆ وەک بەندەی خۆی سەیر بکا.

دەبێ هەموومان بزانین، خودای مەزن لە هەموو کەس مەزنترە.

ترسان لە خودا لەگەڵ ترس لە غەیری خودا زۆر جیاوازە، ترسان لە خودا ڕزگارییە، عیبادەتە، ئەم عیبادەتە گەورەیە تەنیا لایەق بە خودایە.

## وانەی چوارەم

دان بە هەقدانان گەورەییە دان بە هەقدانان بوێرییە.

هەرچەند مرۆڤ لە ترسدا ئەو کارە بکا، گەورەترین پۆزش لای خودا پۆزشی ئەو بەندانەیە دانیان بە هەقدا دەنێن و داوای لێبوردنیش دەکەن.

خراپترین خراپەکان خراپەی ئەو کەسانەیە دان بە تاوانیاندا نانێن و لێی لا دەدەن، یان بەهانەی بۆ دەهێننەوە، کاتێ تووشی هەڵە دەبی دانی پێدا بنێ، گشت مرۆڤی شایانی هەڵەکردنە، هەر کەس هات و بەرانبەرت تاوانبار بوو، داوای لێبوردنی لێت کرد، تۆیش لێی خۆش بە، نەکەی هەر لەبەر ئەوەی وا بە سەرکزی هاتووەتە لات، لووتبەرز بیت، بە چاوی خوار لێی بڕوانی، بەخشندە ئەو کەسەیە، کە هێزی تۆڵەی هەیە، بەڵام لێبوردن پێش تۆڵە دەخات، مرۆی بەڕێز هەڵە ناکا، گەر کردی لێی ڕاناکات، دان بە هەڵەی خۆیدا دەنێ، هەڵەیەکی وەهایش ناکا، وەک پەڵەی ڕەش بە ناوچاوانیەوە دیار بێ.

سروشتی مرۆڤ وەهایە هەڵە بکا.

تەنانەت وای لێ هاتووە هەڵەکردن وەک گەورەیی لە بۆ مرۆڤ بێتە هەژمار

مرۆڤی ژیر کە هەڵەی کرد ئامۆژگاریی لێ وەردەگرێ، فێری ڕێگەی ڕاستی دەبێ، دڵی خۆی پاڵفتە دەکات.

ئەو دەمەی وا هەڵە دەکەین، یەکسەر بە بیرمان دێتەوە کە مرۆڤین، بە خۆماندا دەچینەوە.

لە خۆمان دەپێچینەوە، ئەو شتانەیش فێر دەبین کە لە ئەنجامی هەڵەکردندا بە سەرمان دێت

لە فەرموودەیەکدا هەیە، «ئەگەر ئێوە هەڵە نەکەن، دەترسم لە

هەڵەکردن خراپترتان بەسەردا بێت، خۆتان لە خۆتان ڕازی بن.»
ئەو زەلیلی و گریە و زارییەی دوای تاوان دێ لە لای خودا لەو خۆلەخۆڕازیبوونە باشترە لە دوای چاکە دێت.

دیسان فەرمووده دەفەرموێ: «گەر ئێوە گوناه نەکەن، خودا هەمووتان لەناو دەبات و کەسانی وا دروست دەکا هەڵە بکەن، لە پاش هەڵە داوای عەفووی خودا بکەن.»

## وانەی پێنجەم

ئەگەر کار لە کار ترازا باوەڕهێنان سوودی نابێ خودا دەفەرموێ:
﴿ يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفۡسًا إِيمَٰنُهَا لَمۡ تَكُنۡ ءَامَنَتۡ مِن قَبۡلُ أَوۡ كَسَبَتۡ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيۡرٗاۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓاْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾ ﴾(الانعام) «ئەوی ڕۆژێ کە ئەم جۆرە نیشانانە بێتە لایان هەرکەسێ پێشتر بڕوای نەهێنابێ و ئاکاری چاکی نەبووبێ بڕواهێنان تازە بەهرەیان بۆ نادا» ئەو کاتەی وا فیرعەون و دارودەستەکەی لەنێو دەریای سووردا خنکان، شەپۆلی دەریا هەموویانی هەڵدەشەپاند، گیانی فیرعەون هەم لە ترسا و هەم لەبەر شەپۆلی دەریا نزیکی دەرچوون بووەوە، ئا لەو کاتە فیرعەون ئیمان دەهێنێت و پەروەردگار ئیمانەکەی قەبووڵ ناکات، خودا دەفەرموێ: فیرعەون گوتی: ﴿ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾ (یوونس) یانی «من باوەڕیم هێنا، هیچ کەس بۆ پەرستن ناشێ، مەگین ئەوەی کە تۆرەمەی ئیسرائیلی دەیپەرستن، منیش لە تەسلیمبووەکانم».

بەڵام تازە لە پاشی چی؟

بۆیە خودا لە وەڵامی فیرعەوندا فەرمووی: ﴿ ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٩١﴾ ﴾ (یونس).

«جا تازە؟ تۆیەک لە پێشدا یاخی بووی و لە ڕیزەی خراپکاران بووی.»

فیرعەون هەتا بۆی چووە سەر باوەڕی بە خودا نەبوو، بەو خەڵکانەی هەموو دەگوت: من خودای هەرە بەرزتانم، ئەو کەسانەی باوەڕیان بە خودا هێنابوو، هەر چی جۆری سزا هەیە بە دەست فیرعەونەوە چێشتیان، هەتا دەمی خنکانەکەی شوێنی ئەو خەڵکە کەوتبوو بیانگرێ و سزایان دا، بەڵام ئەو پیاوەی کە گوتی بمسووتێنن، باوەڕدار بوو، گوناهەکانی زۆر بوون، بەڵام نێوان خۆی و خودای خۆی، مافی خەڵکی نەخواردبوو، خودای گەورە و میهرەبانیش عەفووی کرد و ڕەوانەی نێو بەهەشتی کرد.

بەڵام گەر تاوانبارێ مافی خەڵکی پێشێل بکا، یان دەبێ ماف بە خاوەن ماف بداتەوە، یاخود ئەو خاوەن مافانە لە مافی خۆ چاوپۆشی بکەن، دوایی خودا لێی خۆش دەبێ.

ئەمەیش دادگەریی خودایە، هەرچەندە خودا خۆی خاوەنی هەموو کەسە، بەڵام دیسان مافی خەڵکی پێشێل نابێ و دادگەرانە هەرکەس بە مافی خۆی دەگا، ئەو کەسانەی دزی دەکەن، خودای گەورە لەو دزییە قەت خۆش نابێ، ئیللا دەبێ دوو مەرج هەبێ، دەبێ ئەو کەسەی کە دزە، دزراوەکە بە خاوەنی بداتەوە، یان خاوەن ماڵ لە مافی خۆی چاوپۆشی بکا و گەردنی دز ئازا بکا.

هەرکەس باسی ناڕەوای خەڵکی دەکا، بەو مەرجە خودا لێی خۆش دەبێ کە ئەو کەسەی بە خراپە باس کراوە، گەردنی باسکەر ئازا بکا، یاخود باسکەر بە ئەندازەی غەیبەتەکەی لە چاکەی خۆی بەشی خاوەن ماف بدات، هەرکەسێ کە ستەمکارە، دەبێ مافی ئەو کەسانە بداتەوە، کە کاتی خۆی ستەمی دەرهەق کردوون، یاخود مەزڵووم گەردنی زاڵم ئازا بکا، ئەو کەسەی وا زوڵمی بۆ خۆی ڕەوا نەدی، زوڵم لە هیچ کەسێ ناکا، لە پەسلاندا مافی ئاژەڵانیش دەدا چ جای مرۆڤ!

## وانەی شەشەم

**دەبێ زیندوو وەسیەتی خزمی مردووی خۆی بەجێ بهێنێ**

**بەجێهێنانی وەسیێتی دایک و باوک چاکەیەکە لە تای تەرازوو دادەنرێت**

**گوێڕایەڵیی دایک و باوکیش دەبێ بۆ کاری چاکە بێ**

دەبێ مرۆڤ لەو کارانەی کە خراپەن گوێڕایەڵی هیچ کەس نەبێ، تەنانەت دایک و باوکیشی، بەڵام لێرە وا بینیمان ئەو کوڕانە ئەو وەسیێتە سەیرەی باوکیان بەجێ هێنا.

سەرەتا سووتان، دوایی کوتان دواتر بە دەم ڕەشەبادان.

گوێگرێکی چەندە سەیرە و چاکەیەکی چەند جیاوازە، وەسیەتەکە چەندە سەیرە گوێگری لەوە سەیرتر ئەو وەسیێتە سەیرە بوو بە هۆکاری لێخۆشبوون، بەجێهێنانی وەسیێتیش بوو بە چاکە بۆ کوڕەکان، هەموو جارێ پێویست ناکا مرۆ وەسیەتی باوکی خۆی بەجێ بهێنێ.

پاش مردنی باوک و دایک دیسان هۆکاری وا هەیە کە پێوەندیی نێوان باوک و ڕۆڵەکانی بەردەوام دەکات، خێربۆکردن، داواکردنی لێخۆشبوون، نزای خێر و سەدەقەدان، چاکە لەگەڵ دۆستەکانی دایک و باوکت، جگە لەوەیش تۆ بەرانبەر خەڵکی چاک بە، خەڵکی ڕەحمەت بۆ دایک و باوکت دەنێرێن، چاکەی مەزن لە دوای مردنی باوک و دایک دەست پێ دەکات.

هەر مردوویەک جگە منداڵ هیچ چاکەی لە دونیا نەبوو، ئەوە زیاتر پێویستی بە چاکەی ڕۆڵەکانی هەیە، هیچ کات دایک و باوکی مردووت لە یاد مەکە و دەم بە نزا و پاڕانەوە زۆر دوعای خێریان بۆ بکە.

## **یونس** (سەلامی خودای لێ بێت)

ئیبن ئەبی شەیبە ڕیوایەت دەکا دەفەرموێ، خۆشەویست فەرموویەتی:

یونس (سڵاوی خودای لێ بێت) هۆزەکەی خۆی ئاگادار کردەوە: لەدوای سێ ڕۆژ سزای خودا بە سەرتاندا دادەبارێ، پاشان یونس خۆی شاردەوە، هۆزی یونس لە مرۆڤدا هەرچی دایک و ڕۆڵە هەیە، لە ئاژەڵدا هەر چی دایک و بەچکە هەیە -وەک دەربڕینی ملکەچی و پەشیمانی- هەر هەموویانی لێک جیا کردەوە.

پەنایان بردە بەر خودا و داوای لێخۆشبوونیان لێ کرد، خودا سزای خۆی نەباراند.

یونس چاوەڕێی سزا بوو، سزا نەهات، لەو دەمەیشدا هەر کەس درۆی بکردایە و شایەتیکی نەهێنایە بۆ قسەکەی، لە دار دەدرا... ئیتر یونس بە دەم داڵغە و خەفەتەوە ملی ڕێگای گرتە بەر، گەیشتە دەریا، لە کەناری دەریاکەدا چەند کەس سواری کەشتییەک دەبوون.

ئەویان ناسی، لەگەڵ خۆیان سواریان کرد، هەر یونس سوار بوو، کەشتی کەوتە لەقەلەق و بە لای ڕاست و چەپدا دەکەوت، خەریک بوو لە ئاو نوقوم بێ.

یونس گوتی: ئەوە چییە؟

گوتیان: ئێمە هیچ نازانین.

فەرمووی: من دەزانم کەسێک لەنێو ئەم کەشتییەدا ڕایکردووە، لە خاوەنی خۆی تۆراوە.

تا ئەو کەسە فڕێ نەدرێ ئەو کەشتییە هەر وا دەبێ (مەبەستی یونس هەر خۆی بوو).

گوتیان: قوربان! ئێمە چۆن تۆ فڕێ بدەین؟

یونس فەرمووی: دەوێکی[٣] بۆ بکەن هەر کێ دەرچوو فڕێی بدەن.

سێ جار تیروپشکیان کرد و لە هەر سێ جار یونس دەرچوو، فڕێیان دایە نێو دەریا، نەهەنگێک هات، هەڵیلووشی نەهەنگ چووە نێو قولایی دەریاوە.

یوونس لەوێ گوێی لە زیکری بەردە وردەی نێو دەریا بوو: ﴿ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٧ ﴾ (الأنبياء) (تا لەناو تاریکاییدا هاواری کرد، لە غەیرە تۆ هیچ خودایەکی شک نابەم پاکی و بێعەیبی بۆ تۆیە من لە ڕیزەی ناهەقان بووم.) سێ تاریکی، ناوزگی حووت، لەناو دەریا، لە کاتی شەو پاش ماوەیەک نەهەنگەکە لە ڕۆخ دەریا یونسی هەڵهێنایەوە یونسی چی؟ لەبەر گەرمایی ناو زگی نەهەنگەکە، وەک جوجەڵەی تازە لە هێلکە دەرهاتوو کە هیچ پەڕی پێوە نەبێ و بەرگەی خۆر و هەوا نەگرێ.

خودای مەزن بنجێکی زل تەرزی کولەکەی بۆ ڕواند، لە سێبەری تەرزی کودی دادەنیشت و کودی دەخوارد، پاش ماوەیەک کودی وشک بوو.

یونس گریا!

---

٣ دەو: تیروپشک

خودا فەرمووی: بۆچی دەگریت؟ بۆ کولەکە؟ ئەی بۆ ویستت پتر لە سەد هەزار کەسان تێدا بچێ و فرمێسک لە چاوت نابارێ؟ یونس لە بن تەرزی کودی هاتە دەرێ، چاوی بە شوانێکی گەنج کەوت.

فەرمووی: شوانە! تۆ خەڵکی کوێی؟

گوتی: لە هۆزی یونسم.

فەرمووی: گەر چوویتەوە ماڵ بە خەڵک بڵێ: یونسم بینی سڵاویشی لێ دەکردن.

شوانە گوتی: ئەگەر بە ڕاست تۆ یونس بی، چاک دەزانی سزای درۆ سێدارەیە.

کێ بکەمە شایەتی خۆم، تا لە کوشتن دەرباز ببم؟

فەرمووی: ئەها ئەو دارە و ئەو جێگایە.

شوانە گوتی: پێیان بڵێ هەر ئێستا شایەتییەکم بۆ بدەن با ببینم.

یونس فەرمووی: هۆ دارەکە! ئەی جێگاکە! هەر کات ئەم شوانە بەڕێزە ویستی شایەتی بۆ بدەن، یەکسەر بیدەن.

گوتیان: باشە.

شوان گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی، لە ماڵ باسی یونسی کرد، براکانی بوونە لەمپەر باسی یونس لای کەس بکا، شوانە چوو بۆ لای پادشا، گوتی: قوربان یونسم بینی، سڵاوی لە ئێوە دەکرد.

پاشا گوتی: زوو بیکوژن، درۆزنە!

شوانە گوتی: شایەتم هەیە.

پاشا دوو سێ کەسی نارد تا گەیشتنە لای دارەکە و لای جێگاکە.

شوانە گوتی: تووخودا یونس ئێوەی نەکرد بە شایەتم؟

گوتیان: بەڵێ.

ئەو کەسانە بە ترسولەرز گەڕانەوە، چۆن دارێک و پارچە ئەرزێ دەبنە شایەت؟

چوونە خزمەتی پادشا و سەربوردەیان بۆ گێڕاوە، پاشا دەستی شوانەی گرت و لەسەر کورسیی پادشایی دایینیشاند و گوتی: ڕۆڵە! تۆ شیاوی پادشایەتیت.

شوانە چل ساڵ پادشا بوو.

## وانەی یەکەم

خودای مەزن فەزڵی هەندێ مرۆڤ دەدا بەسەر هەندێکی تردا، تەنانەت پەیامبەرانیش هەندێ لە هەندێ گەورەتر، بەڵام هیچ کەس لە لای خودا بەقەد پەیامبەرەکانی بەڕێز نییە.

ئاشکرایە لەنێوان پەیامبەرانیش جیاوازی هەیە.

وەک گوتمان: هەندێک لە هەندێکی تر مەزنترە، خۆشویستنی پەیامبەران عیبادەتە، ڕێزگرتنیان فەرزە و پێویستە گەر جارجار پەیامبەران کارێک بکەن، خودای مەزن گلەیی خۆی لەوان بکا.

هۆکاری ئەو کارانەیان هیی ئەوەیە کە مرۆڤن، ئەمەیش بە ئەمری خودایە، هەتا ئێمە ئامۆژگاریی لێ وەربگرین خودای گەورە پەیامبەران دەپارێزێ و تووشی هەڵە و تاوان نابن.

هەرگیز تووشی شتێک نابن زەرەر لە ئاکاریان بدا، نابێ و نەبووە پەیامبەرێک تاقە جارێک درۆ بکا، بەڵام لە کاری دونیایی ئەوانیش وەک مرۆڤی تر لەوانەیە هەڵە بکەن، پەیامبەر کە کۆچی کرد بۆ مەدینە تەماشای کرد مەدەنییەکان داری خورما پێوەند دەکەن.

فەرمووی: بۆچی پێوەندی دەکەن؟

گوتیان: با تۆوەکان لێک نادا.

وازیان لە موتوربە هێنا، داری خورما بەری نەگرت

هاتن بۆ لای پەیامبەر و گوتیان: قوربان دارەکانمان بەری نەگرت!

فەرمووی: ئێوە لە کاروباری دونیادا شارەزاییتان زیاترە.

ئەو ڕۆژەی موسا هۆزەکەی بینی پەیکەری گوێرەکەیەکیان داتاشیوە دەیپەرستن،

هێند تووڕە بوو، قژ و ڕیشی هاروونی برای ڕاکێشا

خودا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلَا بِرَأْسِيٓ ﴿٩٤﴾ ﴾ (طه)

«هاروون گوتی: کوڕی دایکم! ڕیشم مەگرە و قژم بەردە».

ئەو کارەی کە یونس کردی، هۆکارەکەی هەر ئەوە بوو کە یونسیش مرۆڤ بووە، خودا پێی فەرموو: سێ ڕۆژی تر سزا بەسەر هۆزەکەتدا دادەبارێ، ئەویش لە جێگایەکی دوور لە شارەکەی خۆی دەڕوانی.

سزا نەهات.

چوون هۆزەکەی پێش بارینی سزای خودا، بە گیان و دڵ گەڕانەوە بۆ لای خودا و تۆبەیان کرد، کۆرپەیان لە دایک بڕی، بێچووەکانیان جیا کردەوە، بەم کارەیان لەجیاتیی سزا، سۆزی خودایان بۆ خۆ کێشا، بەڵام یونس بەم کارانەی نەزانیبوو.

چونکە یونسیش مرۆڤ بوو، ئەگەر خودا لە ڕێی سروش شتێکی پێ نەگوتبایە نەیدەزانی.

بۆیە یوونس بە تووڕەیی لە هۆزەکەی خۆی هەڵات و خۆی شاردەوە، ئەوەیش لەبەر دوو هۆکار بوو.

یەکەم: سزا بۆ ئەو هۆزەی کە یونسیان وەک درۆزن چاو لێ دەکرد، دانەباری.

دووەم: سزای درۆکردن هەر کوشتن بوو.

لەو کاتەی وا هاتە کەنار دەریاکەوە، داوای لە کەشتیوانەکان کرد سەری بخەن کە سواریان کرد، هەرچی کەشتیی ئەو ناوە بوو هەمووی ڕۆیی تەنیا کەشتییەکەی ئەمان بوو نەدەڕۆیی.

یونس گوتی: ئەم کەشتییە بەندەیەکی وای تێدایە ڕای کردووە -مەبەستی یونسیش خۆی بوو، فەرمووی: بیخەنە ناو دەریاوە با ئێوە ڕزگارتان بێت.

بەڵام ئەوان وایان نەکرد تاکوو سێ جار دەو هەر وەبەر یونس دەکەوت.

هێشتا خەڵکی حازر نەبوون یونس فڕێ بدەنە دەریا.

خۆی خۆی خستە ناو ئاوەوە

نەهەنگ هات و هەڵیلوشی

ئەو کەسانەی کە سواری کەشتییەکە بوون، بە چاوی خۆیان ئەم بەسەرهاتەیان بینی

بۆیە هەموو لە مەرگی یونس دڵنیا و بێگومان بوون، شوانەیش داوای شایەتیی لێ دەکرد.

دوایی کە یونس لە زگی نەهەنگەکە هاتە دەرێ و چاک بووەوە، گەڕایەوە شارەکەی خۆی

خۆشەویستیی خودا دەفەرموێ: هیچ کەس نەڵێ من لە یونس هێژاترم

ئەمەیش پاراستنی پلەوپایەی یونسی پەیامبەرە.

## وانەی دووەم

تۆبەکردن سزا لەسەر مرۆڤەکان هەڵدەگرێت و

پاڕانەوە قەزاوقەدەر لادەبات و گۆڕانکاریی بەسەر چارەنووسدا دەهێنێ

ڕوونکردنەوەی ئەم باسەیە بەم ئاوایە:
قەدەر خۆی دەکرێ بە دوو بەشەوە:
جۆری یەکەم: ئەو قەدەرەی گۆڕانی بەسەردا نایەت و دەبێ ببێ
جۆری دووەم: ئەو قەدەرەی بەهۆی نزا و پاڕانەوەوە دەگۆڕێت و کۆتایی دێت.
ئەو سزایەی کە بڕیار بوو هۆزی یونس بگرێتەوە، قەدەرەکەی لەو جۆرە بوو کە گۆڕانی بەسەردا دێت، یونس فەرمووی خودا سزاتان دەدات و هەر هەمووتان لەناو دەچن، ئەمەی زانی کە بڕیارە سزاکە بێت، بەڵام ئاگای لەوە نەبوو کە ئەو بڕیارە لە جۆری دووەمینە و شایانی گۆڕانکارییە.
بەم تێگەیشتنە ئەم باسەمان بە ئاسانی بۆ حەل دەبێ، نەکەی هەرگیز دڵت بۆ تۆبە لێ نەدا، یان لە نزا و پاڕانەوە بێئومێد بیت، تەنیا هەر خودا خۆی دەزانێ چەندین بڕیاری ترسناک لەبەر تۆبە و پاڕانەوەت بە قازانجی تۆ گۆڕاوە؟

## وانەی سێیەم

سروشتی خەڵکی جیاوازە و پەیامبەرانیش خەڵکین لە غەزای بەدر مسوڵمانان چەندین دیلیان لەژێر دەست بوو، لەبەر ئەوەی تا ئەو کاتە هیچ دەقێکی قورئان باسی دیلی جەنگی نەکردبوو، پەیامبەر پرس و ڕاوێژی بە هاوەڵەکانی خۆی کرد.
ئەبوبەکر فەرمووی: قوربان هەر بە چاکە ئازادیان بکە.
عومەر فەرمووی: نەخێر قوربان با خەڵکی پێ بترسێنین.
خۆشەویست فەرموودەیەکی زۆر جوانی لەمەڕ سروشت و میزاجی خەڵکەوە فەرموو.

فەرمووی: تۆ ئەی ئەبوبەکر وەک عیسا وای، خودا دەفەرموێ: عیسا گوتی: ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ (المائدة) «گەر بتەوێ ئازاریان بدەی، عەبدی خۆتن، گەر بیشتەوێ لێیان خۆش بیت خۆت دەزانی و هەر بۆ خۆتی کە دەستەڵاتت بە دەستە و لە کارزانی». ئەی عومەر! تۆیش وەکو نووح وای: ﴿ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ ﴾ (نووح) «نووحیش گوتی: پەروەرندەم! لەم سەر هەردە ئەو کەسانەی تۆ ناناسن جوقەواریان لێ مەهێڵە». لە پێش ئیسلام ئەو کەسانەی کە هێدین و بەکاوەخۆن، دوای ئیسلامیش هەر هێدین و بەکاوەخۆن.

ئەو کەسانەیش کە تووڕەن و توندوتیژن، هەر تووڕەن و توندوتیژن، ئەو کەسانەی کە بەڕێزن هەر بەڕێزن، ئەو کەسانەیش کە ڕاستگۆن و خۆپارێزن، هەر وەک خۆیان دەمێننەوە.

بە کورتی ئایینی ئیسلام یان هەر ئایینێکی تر بێت، لە هەموو ڕوویەکەوە سروشتی مرۆڤ ناگۆڕێ، بەڵکوو ڕەشمەی خەڵک دەگرێت و لە خراپە دەیپارێزێ

موحەمەدی خۆشەویست فەرموویەتی: «خەڵکی کانگەن، ئەوی کاتی خۆی چاک بووبێ، کاتی ئیسلامیش هەر چاکە، ئەگەر شارەزای ئایین بێت.» ئەبوبەکر لە پێش ئیسلام زۆر بەسۆز بوو، کاتی ئیسلامیش هەر وا بوو، عومەر لە کاتی پێش ئیسلام توندوتۆڵ بوو، لە سەردەمی ئیسلامیشدا هەر توندوتۆڵ بوو، خالید لە کاتی پێش ئیسلام سوارچاکێکی بەناوبانگ بوو، لە سەردەمی ئیسلامیشدا هەر سوارچاک بوو، ئەم قسانە هەرگیز نابن بە بەهانە هەتا بڵێین: مادەم وایە ئەو کەسانەی کە ئاکاریان ناشیرینە، نابێ سەرکۆنە بکرێن و داوای ئەوەیان لێ بکەین خۆیان چاک بکەن.

دەبێ مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا بجەنگێت و سروشتی خۆی بەرەو

چاکـە بگۆڕێت و ئاکارەکانـی شـیرین بـکا و هەرچـی ئـاکاری خـراپ و نالەبارییـە لـە ڕیشــەوە دەریبهێنــێ، جـا هەرکەســێ چەنـدە لەگـەڵ خـودی خـۆی بـە خراپـی بجەنگـێ و بەرانبـەری بچتـە مەیـدان هێنـدە باشـە.

هەموو پیاوێ حەزی لێیە ژنی هەبێ
هەموو ژنێ حەزی لێیە پیاوی هەبێ
خۆ ناکرێ هەرچی مرۆڤە دەس بۆ ئارەزووی خۆی شل بکا
ئەگەر وابوو دەبێ بزوێنێ بهێنین
بیخەینە دوای وشەی کۆمەڵ لە کۆمەڵگە
هیچ مرۆڤێ دژی ماڵ و سامان نییە
بەڵام مرۆڤی وا هەیە بە ڕێگەی هەق
سەروەت و سامان پێک دەنێت
هەیشە هەر کۆی بکاتەوە
ئیتر بە لایەوە گرینگ نییە ڕەوایە یا ناڕەوایە

## وانەی چوارەم

تیرووپشـک هـەر وا بێـت هـۆکار نەکـراوە، زۆر جـار تیرووپشـک کێشـەی کۆتـایـی پـێ هێنـاوە، بۆیـە کارێکـی ڕەوایـە تەنانـەت پێـت ئاسـایی بێـت ئەگـەر بڵێـم سـوننەتی پەیامبەرانـە.

هـەر کات خۆشەویسـت بۆ غـەزا بڕۆیشـتایە، لەنێوان خێزانەکانیدا تیرووپشـکی دەکـرد، هـەر کـەس لـەو دەورە دەرچووبـا لـەو سـەفەرە هاوڕێی پەیامبـەری خـودا دەبوو، ئەمـە دڵی هەموو لایەکی ڕادەگرت. گەر پەیامبـەر بەبێ تیرووپشـک یەکێکیانی ببردایە، ئەوانی تر غەمگین دەبوون.

دادپەروەرییـش لەنێـوان خێزانەکانیـدا ڕەنگـی نەبـوو، کەواتـە

تیروپشککردن کارێکی زۆر مەردانەیە و دڵی گشت کەسێک ڕادەگرێ، با ئێمەیش لە یادی نەکەین.

## وانەی پێنجەم

هێزی ڕاستی هەر هیی خودایە، فرمانی خودا لە نێوانی کاف و نوونە، هەر بفەرموێ: ببە، دەبێ (کن فیکون).

ئەو نەهەنگەی کە گۆشتخۆرە بە فەرمانی پەروەردگار پێش ئەوەی یونس بخنکێ قوتی دەدا و دەیپارێزی و هەرسی ناکا، یونس کاتێ نەهەنگەکە تفاندیەوە بەهۆی گەرمایی نێو گەدەی، لاشەی وەک سووتاو بێت وا بوو، ئەگەر خودا بیویستایە لاشەی یونس تەواو ساغ بێت، بەبێ گومان زۆر بە ساغی دەهاتە دەر،

وەک چۆن لاشەی ئیبراهیمی لە بڵێسەی ئاگر پاراست

بەڵام خودا چۆنی بوێ ئاوا خەڵکی دەپارێزێ

نازانم دروستە بڵێم:

دەزانی فەرقی نێوانی ئیبراهیم و یونس چی بوو؟

ئیبراهیم مووبەموو ئەمری خودای خۆی جێبەجێ کرد، بۆیەیش خودا زۆر بە جوانی دەیپارێزێ.

بەڵام یونس خۆی لە هۆزەکەی شاردەوە، بە تووڕەیی لە ماڵ دەرچوو، خودا لەبەر پلەوپایەی پەیامبەری گیانی پاراست، بەڵام لاشەی بە تەواوی نەپاراست و کەمێ سووتا، ئەو سووتانەیش بووە مایەی پاکبوونەوەی.

## وانەی شەشەم

ڕێزی خەڵک بگرە بە گوێرەی پایەی.

هەرچەند ئێمە وەک باوەڕدار دەبێ لەگەڵ هەموو کەسێک

باش ڕەفتار بین، ڕێزی هەموو کەسێک بگرین، بەڵام ئەوەیش فێر کراوین، کە هەندێ کەس پلەوپایە و کەسایەتیی لە هەندێ کەس فرەترە و ماقوڵترە، چونکە یونس لە نێو خەڵکدا پایەیەکی تایبەتیی بوو، لە کەشتییەکە بە یەکەم تیروپشک نەیانخەستە نێو دەریاوە، لە سەردەمی پەیامبەریش کچێکی حاتەمی تائی، ئەو حاتەمەی بە بەخشندە ناوبانگی بوو، هاتە خزمەتی پەیامبەر، ئەویش زۆر ڕێزی لێ گرت.

چونکە حاتەم پیاوێکی زۆر دەهەندە و دلاوا بوو. خالید پێش باوەڕهێنان سەرکردە بوو، لە دوای ئەوەی مسوڵمان بوو، پەیامبەری مەزن دیسان کردیەوە بە سەرکردە، ئەو عیکریمەی لە سەردەمی نەفامیدا شێرێکی زۆر دلاوەر بوو، لە یەرموکدا باڵی ڕاستی سوپای ئیسلامی بە دەست بوو، هەر گا کەسێکی زۆر بەڕێز هەڵەیەکی لە دەست قەوما، بە بەرچاویدا مەهێنەوە، مرۆڤەکان تەنگانەیان دێتە ڕێگە، چ بەڕێز بن، چ نابەڕێز بەتەنگەوەچوونی مرۆڤێکی خاوەن ڕێز و مرۆڤێکی سوکوسەلیم وەک یەک نییە، هەندێ کەس هەن لەکاتێکدا تەنگانەیان دێتە ڕێگە، پەنا دەبەن بۆ هەموو کەس، بەڵام مرۆڤی وایش هەیە ئەگەر لە برسدا بمرێت و چاوی بۆ پاروویەک زەرد بێت، داوا لە هیچ کەسێ ناکات.

چونکە هێندە ئابڕوودارن ئەو ئابڕووە ناخەنە ژێر پرسیارەوە.

## وانەی حەوتەم

نەکەی هەرگیز درۆزن بیت

لە پەیامبەریان پرسیار کرد

دەکرێ مسوڵمان نەوێر بێ؟

فەرمووی: بەڵێ.

دەکرێ پژد و چاوچنۆک بێ؟
فەرمووی: بەڵێ.
دەکرێ درۆ بکا؟
فەرمووی: نەخێر.
درۆ هێندە قێزەونە هەموو کەسێک ڕقی لێیە
هەر لە کۆنەوە وا بووە.
مرۆڤەکان درۆیان خۆش نەویستووە.
هۆزی یونس هێند درۆیان لا دزێو بوو،
سزای درۆزن کوشتن بوو.
یونسیش بۆیە ڕایکرد و خۆی شاردەوە
ترسا هۆزەکەی وا بزانن درۆی کردووە.
کاتێ بە شوانەکەیشی گوت
بڵێ یونس سڵاوی لێ دەکردن
شوانە داوای شایەتی کرد
نەکا وابزانن ئەو شوانە درۆزنە
تۆ تەماشا کافر ڕقی لە درۆیە
ئەی بۆ مسوڵمان باوەڕی خۆی بخاتە ژێر پرسیار و
بەهۆی درۆوە وا بکا خەڵکی نەک هەر خۆی
بەڵکوو دینەکەیش بە چاوێکی سووک سەیر بکەن؟
لەکاتێکدا پەیامبەری مەزن ڕاستگۆترین مرۆڤ بووە.

## یوشەعی کوڕی نون (سەلامی خودای لێ بێت)

بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە خۆشەویست فەرموویەتی:
سەردەمی زوو پەیامبەرێک چوو بۆ غەزا
ڕووی کردە هۆزەکەی فەرمووی: هەرکەس ژنی مارە کردووە، بەڵام شایی نەکردووە با لە غەزا بەشدار نەبێت.
هەرکەس خانووی دروست کردووە، بەڵام سەری نەگرتووە، ئەویش نەیەت. هەرکەس خاوەنی ئاژەڵی ئاوسی هێشتا نەزاوە، ئەویش نەیەت، لەو شارە نزیک بووەوە کە غەزاکەی تێدا دەکرا، کات نزیکی ئێوارە بوو، ڕۆژەکەیش ڕۆژی هەینی بوو، ئەگەر مەغریب بهاتایە، دەبوو بە ئێوارەی شەممە، ئیتر غەزا حەرام دەبوو تا یەکشەممە، لەبەر ئەوە ئەو پەیامبەرە پەلەی بوو.
ڕووی کرد خۆر، فەرمووی: تۆ فەرمانبەری خودای، منیش وەک تۆ فەرمانبەرم.
خودایە! ئەم خۆرە ڕاگرە و بیوەستێنە.
خودای مەزن خۆری ڕاگرت، دەستیان کرد بە غەزاکردن، سەرکەوتنیان بە دەست هێنا.
دەستکەوتەکان کۆ کرانەوە، ئاگرێک هات، دەستکەوتەکان هیچ نەسووتا.

فەرمووی: دزیی لێ کراوە، با سەرۆکی دەستەکان بێن، دیسان پەیمان نوێ بکەنەوە.

سەرۆکی دەستەکان هاتن، دانەدانە دەستیان دەخستە نێو دەستی و بەڵێنیان نوێ دەکردەوە.

دەستی سەرۆک دەستەیەکیان لکا بە دەستی پەیامبەرەوە.

فەرمووی: ئەوەی دزیی کردووە لەنێو دەستەکەی تۆدایە با هەموویان دانەدانە بەڵێن بدەن.

ئەو دەستە هەموویان هاتن دانەدانە بەڵێنیان دا، دەستی دوو کەس، یاخود سێ کەس لکا بە دەستی پەیامبەرەوە،

فەرمووی: ئێوە دزیتان کرد.

ڕۆیشتن تۆپێکی زێڕیان هێنا، بەقەد سەرە گایەک دەبوو، خستیانەوە ناو دەسکەوتەکان، ئاگر هات و هەمووی سووتان (لە ئایینەکانی پێشوودا دەستکەوتی جەنگ حەڵاڵ نەبوو.)

## وانەی یەکەم

ئەو پەیامبەرەی باس کرا، یوشەعی کوڕی نوون بووە، یوشەع هەمان ئەو گەنجە بوو لەگەڵ موسادا سەفەریان کرد بۆ لای خدر، بەڵام یوشەع لە دوای موسا خودا کردی بە پەیامبەر.

لەو چل ساڵەی کە هۆزەکەی موسا لە چۆڵەوانیدا سەرگەردان و بێدەرەتان مابوونەوە

لە دوای ئەوەی هۆزی موسا لە فیرعەون و داروودەستەی ڕزگاریان بوو

خودا موسای بۆ گفتوگۆ بۆ سەر کێوی توور داوەت کرد

ئا لەو ماوە (کە چل ڕۆژ بوو) موسا لە کێودا مایەوە، سامری هەرچی زێڕ هەبوو کۆی کردەوە تواندیەوە، کردی بە گوێرەکەیەک

و گوتی: ئەمە خودای ئێوە و خودای موسایە
سوژدەی بۆ ببەن، خەڵکی بە گوێی سامریان کرد
هەرچەند هاروون هاواری کرد بێ فایدە بوو
هەتا موسا خۆی هاتەوە، زۆربەی زۆریان ئەو بتەیان دەپەرست.
موسا کە هۆزەکەی خۆی بینی، تووڕەیی تینی بۆ هێنا، بتی شکاند و سووتاندی، پاشان سامریشی دەرکرد. موسا دەستووری دا فەرمووی: خودا فەرموویەتی بچین بۆ سەر زەویی پیرۆز.
گوتیان نایەین، خەڵکی ئەوێ زۆر بەهێزن، چاریان ناکەین
تەنانەت زۆر بێشەرمانە ڕوویان کردە موسا و گوتیان:
﴿ فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلَا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ ﴾ (المائدة) «ئەوا خۆت و پەروەردەت بچن دەگژیان ڕابچن و چاریان بکەن، ئێمە لێرە دائەنیشین چاوەنۆڕین».
ئا لەو کاتە خودا هەموویانی خستە سەرگەردانی و چل ساڵ سەرگەردان مانەوە. هەموو ڕۆژێ تا ئێوارە بەرەو سەرزەمینی پیرۆز ملیان دەنا تا کاتی خەو، کاتێ لە خەو هەڵدەستان و سەیری ئەملا و لایان دەکرد، دەیانزانی وەک بازنە خوولاونەتەوە و لە شوێن خۆیان نەجووڵاون.
لە سەرەتای ئەو چل ساڵەدا، هاروون کۆچی دوایی فەرموو، دوو ساڵ پاشتر موسایش لەوێ وەفاتی کرد، دواتر خودا سروشی بۆ یوشەع نارد و کردی بە پەیامبەری خۆی.

## وانەی دووەم

هەرگیز مەپرسە کە (چەندە)
هەمیشە هەر بڵێ (چۆنە)
هەزاران دۆستی خوارۆخێچ

فیدای دۆستێکی ڕاستگۆ بێت
ئەگەر سەد کەس لە دەورت بوون
فریو نەخۆی
لەو کاتەدا لە خۆشیدای دۆستت زۆرە
نازانی کامەیان ڕاستن
هەر کات کەوتیتە تەنگانەوە دۆستێ هات و
لە تۆی پرسی، ئەوە دۆستی ڕاستی تۆیە
تۆ تەماشای یوشەع بکە
باش دەیزانی سەرکەوتن بە
سەربازی زۆر بە دەست نایە
ئەو کەسانێکی هەڵبژارد خۆڕاگر بن،
هەڵبژاردە و دلاوەر بن
ئیتر هەقی بەوە نەبوو گوناهبارە
یان خاوێنە و بێگوناهە
هەر کەس دڵی لە لای کاری خۆی نەبوایە و
بە لاشە لە لای شوعەیب و
بە ڕۆح لە شوێنیکی تر بوایە
لەگەڵ خۆیدا نەیدەبرد و
نەیدەکردە سەربازی جەنگ
ئەو کەسانەی ژنیان لێ مارە کراوە و
هێشتا نەیان گواستووەتەوە
دڵیان لە لای جەنگ نابێت و
خواخوایانە هەرچۆنێ بێت کۆتایی
بە جەنگ بهێنن و بەرەو ماڵ بگەڕێنەوە
یان ئەوانەی خانووی نیوەناچڵیان هەیە

یان ئەوانەی مەڕومالآتی ئاوس و نەزاویان لە ماڵدا هەیە
ئەم جۆرانە بە باشی جەنگیان پێ ناکرێ.

بەڵـێ، مـرۆڤ دەبـێ چۆنـی و چەندێتـی لێـک جـودا بکاتـەوە و چۆنێتـی لـە بەرچـاو بگـرێ، دەبـێ ئەوەیـش بـاش بزانیـن کاروبـاری دونیا مرۆڤ سـەرقاڵ دەکا هەرچەند باوەڕیش سروشتی مرۆڤەکان سـازگار دەکا، بـەڵام دیسـان بـە یەکجـاری نایگۆڕێـت و لـە ڕیشـەدا دەری نـاکات.

دەبێ هـەردەم ئێمـە ئەمـە بزانیـن، چـوون ئێمـە لەگـەڵ مرۆڤـەکان مامەڵـە و هەڵسـوکەوتمانە.

دەبـێ بزانیـن کـە خەڵکـی هـەر خەڵکییـە، حەسـەن کچـەزای پەیامبـەرە، بـە منداڵـی لـە مزگـەوت بەردەبێتـەوە... پەیامبـەر لەسـەر مینبـەرە دێتـە خـوار و ئـەو ئایەتـە دەڵێتـەوە.

﴿ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ ﴿١٥﴾ ﴾ (التغابـن) «مـاڵ و دارایـی و منداڵتـان هـۆی ئەزموونـن».

جارێکـی تـر هـەر لـە مزگـەوت گوێـی لـە گریـەی منـداڵ دەبـێ، نوێژەکـەی کـورت دەکاتـەوە، دوایـی فەرمووی: ترسـام دایکـی منداڵەکـە لەبـەر سـۆز بـۆ منداڵەکـەی ئـاگای لـە نوێـژ نەمێنێـت و دڵـی لای منداڵەکـەی بێـت.

بەڵـێ مـرۆڤ هەرچەنـد بـاوەڕی بەهێـز بێـت، بـەڵام هێشـتا هـەر مرۆڤـە و نابێتـە فریشـتەی خـودا.

پیـاوی بـاوەڕدار هەمیشـە ژن و منـداڵ و دارایـی هـەر خـۆش دەوێ، ژنـی باوەڕداریش وەک پیـاو ئـەو شـتانەی هـەر خـۆش دەوێ، بـاوەڕداری خۆپاراسـتنە لـە حـەرام، نـەک لـەو شـتەی کـە حەڵاڵـە و خۆشـیی ژیانـە.

## وانەی سێیەم

ئەو غەزایەی کە باس کرا، لە کۆتایی ڕۆژی هەینی دەستی پێ کرد هۆز و تیرەی ئیسرائیلیش گەر هەینی تەواو بوایە و ڕۆژی شەممە بهاتایە بە هیچ شێوەیەک نەدەجەنگان لەبەر ئەوە یوشەع ڕوو لە خۆر دەکات و پێی دەفەرموێ:

من فەرمانبەر، تۆیش فەرمانبەر. ئەمە باوەڕێکی وایە بەهێزترە لەو هێزەی کێو لەق دەکات، هەموو شت بە دەستی خودایە، جنۆکە و پەری، مرۆڤ و مەل، ئاژەڵ، ماڵات، خشۆک، مێروو، گیاندار، بێگیان، وردودرشت بە دەست خودایە، هەر لە جیبریل تا دەگاتە وردە مێروو، هەرهەمووی دەستکردی خودایە، هیچ ناتوانێ لەژێر ڕکێفی خودای مەزن دەربچێت و یاخی ببێ، هەرچەند ئێمە دەست بە هۆکارەکان دەگرین لە بیرمان بێت کە ئێمەیش و هۆکارەکەیش بە دەست خوداین ئەگەر خودا لە چارەتدا نەینووسیبێ، هۆکار هیچ دادێکت نادا.

ئەگەر خودایش خۆی بیەوێ بەبێ هۆکار پێت دەبەخشێ، بەردەوام ئەوەیش بزانە مرۆڤ -بە تایبەت ئیماندار- لای خودا بەنرخ و بەڕێزە بە جۆرێک گەر ئیماندار بێت و ڕاستگۆیەکی ناوازە بێت، خودای مەزن یاسای دونیای بۆ دەگۆڕێ.

## وانەی چوارەم

هێند بەس نییە کە سەرکردەی و سوپا تەنیا لە جەنگ شارەزا بێ

هێند بەس نییە بەڕێوەبەر تەنیا لە بەڕێوەبردن شارەزا بێ

ئەندازیار و پزیشکیش وا

سەرکەوتوو کەسێکی وایە

له سروشتی خەڵک ئاگا بێ
لەگەڵ خەڵکی هەڵبکات و لێزانیش بێ
خەڵک حەز دەکەن پێش ئەوەی
بەرپرسی خۆیان بناسن
مرۆڤێکی باش بناسن
پێیان خۆشە پێش فەرماندە
هاوکارێکی باش بناسن
فەرماندەری ڕاستەقینە کارێک دەکا
خەڵک بە دڵ فەرمانی ئەو جێبەجێ بکەن، نەک بە یاسا

هەموومان دەزانین لە هەر فەرمانگەیەک کە وا بەڕێوەبەر مرۆڤێکی باش و چاک بێ، فەرمانبەری ئەو فرمانگەیە کارەکانی زۆر خۆش دەوێ، هەرکەس کاری خۆی خۆش بوێ، گوێ ناداتە کات و یاسا، لەوانەیە لە دوای دەوام هەر خەریکی کارکردن بێت.

بەلام بەرپرسی نابەرپرس هێندە تاڵە فەرمانبەری فەرمانگەکە دەڵێی بێگاریی شەیتانیان پێ دەکەن و خودا خودایەتی تەواو بێت و ئیتر بڕوا، بەرپرس دەبێ هێند شیرین بێ، فەرمانبەر خۆی پێی خۆش بێ کاری لە خزمەتدا بکا.

## وانەی پێنجەم

ئەو کەسانەیش لە بەرچاومان مرۆڤی زۆر هەڵبژاردەن هێشتا لە یەکتر جیاوازن

سوپای یوشەع ئەو کەسانەی بە سەربازی وەرنەدەگرت کە دڵیان لای سوپا نەبێ

هێشتا لەناو ئەو کەسانەیش دزی تێدا بوو
هەرگیز بڕوای چاوکوێرانەت بە کەس نەبێ

هێندەیش خانەگومان نەبی باوەڕ بە هیچ کەس نەهێنی
لەم نێوانە ئاگادار بە، نە چۆپی بە نە گاوانی
دونیا زۆر زۆر لەناوبەرە.
خۆشی دونیا سەری هەزار کەسی باشی لە قوڕ ناوە
مرۆڤی پاک ئەو کەسەیە خودا خۆی بە پاکی ڕایبگرێ.

## وانەی شەشەم

بەرنامەی گشت پەیامبەران لەمەڕ خوداناسی هەر یەکە، بەڵام لە شەرع و یاسادا لێک جیاوازن، تەواوی پەیامبەرانی خودا یەکخوداناس بوون، بڕوایان بە مردن و ژیان، بە پەسڵان و لێپرسین و بەهەشت و جەهەنم هەبوو، بەڵام جۆری خوداپەرستی لێک جیاوازە.

خودا خۆی چۆنی بوێ، ئاوا فەرمان دەکات، بۆ نموونە دەسکەوتی جەنگ بۆ هەموو پەیامبەران حەرام بووە.

بەڵام لە ئیسلامدا حەڵاڵ کرا، سوپای ئایینەکانی تر هەر هەموو دەستەکەوتەکانیان لە جێگەیەک کۆ دەکردەوە و ئاگرێک لە ئاسمانەوە دەهات دەیسووتاندن، ئەو دەستکەوتەی سوپای یوشەع بە یەکەم جار ئاگر کاری تێنەکرد و بۆی نەسووتا، چونکە دزیی لێ کرابوو.

لە دوای ئەوەی دزراوەکان هێنرانەوە ئاگر هات و دەستکەوتەکانی گشت سووتاند.

ئا بەم جۆرە دەیانزانی غەزاکەیان لە لای خودا بۆ نووسراوە و وەرگیراوە.

## زەینەبی کچی موحەمەد و ئەبی عاسی کوڕی ڕەبیع

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە فەرموودەی عائیشەوە دەگێڕێتەوە:

خەڵکی مەککە فیدیەی دیلەکانیان دەهێنا کە لە جەنگی بەدر بەدیل گیرا بوون.

زەینەبی کچی خۆشەویست لە فیدیە ئەبی عاسی کوڕی ڕەبیعی هاوسەری کۆمەڵێک پارە و خشڵی نارد، لەناو خشڵەکاندا ملوانەکەیەکی زەینەبی تێدا بوو، کاتی زەماوەندی لەگەڵ ئەبی عاس، خەدیجەی دایکی پێی بەخشی بوو. کاتێک باوکی (پەیامبەر) چاوی پێی کەوت، دڵی پڕ بوو، سۆزی بە جۆش هات و فەرمووی:

گەر دەتوانن دیلی زەینەبم بۆ ئازاد بکەن

فیدیەی هاوردووی بۆ بگێڕنەوە.

هاوەڵان گوتیات: فەرمانت بەجێیە ئەی پەیامبەری خودا. ئەبی عاس ئازاد کرا و ئەو خشڵەی بۆ فیدیەی هاتبوو، پێی درایەوە.

### وانەی یەکەم

ئەبی عاس جگە لە هاوسەر، کوڕی پوری زەینەبە، دایکی هالەی کچی خوەیلید خوشکی خەدیجەی خێزانی پەیامبەرە، پەیامبەر وەسفی ئەبی عاسی کوڕی ڕەبیعی کرد و فەرمووی:

(کچەم دایە ئەبی عاس، کوڕی ڕەبیع پەیمانی دا و ڕاستی لەگەڵ گوتم) ئەبی عاس پێش پەیامبەریی موحەمەد زەینەبی خواست،

خۆشەویست بانگەوازی ئیسلامی دا

زەینەب بە دەم بانگی باوکیەوە هات و ئیمانی هێنا

ئومێدی زەینەب بوو، هاوسەری وەک ئەو ئیمان بهێنێ و سەرفراز بێت

کاتێ ئەبی عاس زانیی هاوژینی شوێنکەوتەی ئایینی نوێیە

لێی نەڕەنجا، هەوڵی نەدا تا پشت لە ئایینی باوکی هەڵبکا

زیاد لەمە بە زمانێکی پڕ سۆزەوە بە زەینەبی گوت:

سوێند بێت هیچ تۆمەتێک نییە لەسەر باوکت

بە زمانی لێوانلێو لە میهرەبانییەوە گوتی:

خۆشەویستم، پێم خۆشە لەگەڵ تۆدا بە یەک ڕێدا بڕۆم

بەڵام پێم ناخۆشە پێمبڵێن

لەبەر ڕەزامەندیی هاوسەری

پشتی لە هۆز و خوێشی کردووە

باووباپیرانی وەلا ناوە

داوای لێبووردنم هەیە ئەی زەینەب.

زەینەبیش گوێڕایەڵی مێردەکەی بوو، بە ئومێدی ئەوەی ڕۆژێک هاوسەرەکەی لە ڕیزی مسوڵماندا چاو پێ بکەوێت. قوڕەیش تەنگیان بە کچەکانی پەیامبەر هەڵچنی، هەر لەسەر داوای ئەوان هەردوو کوڕەکەی ئەبولەهەب ڕوقیە و ئومولکەلسومیان تەڵاق دا، بە هەمان شێوە تەنگیان بە ئەبیعاس هەڵچنی، زەینەب تەڵاق بدات، ئەبیعاس لە وەڵامی داواکایاندا گوتی: سوێند بە خودا لە خۆشەویستەکەم جیا نابمەوە، هیچ ئافرەتێکی قوڕەیشم هێندەی هاوسەرەکەی خۆم بە لاوە خۆشەویست نییە.

پێکەوە درێژەیان بە ژیان دا، هەر یەکیان لەسەر ئایینی خۆی

ئەو کات شەریعەتی ئیسلام بریاری جیاکردنەوەی نێوان ئافرەتی مسوڵمان و هاوسەری بێباوەڕی نەدابوو.

دوای کۆچی خۆشەویست بۆ مەدینە، تەواوی خانەوادەکەی کۆچیان کرد، زەینەب بە تەنها لە مەککە مایەوە، گەرچی دڵسووتاوی بنەماڵەکەی بوو، بەڵام بریاری مانەوەی لەگەڵ ئەبی عاسی هاوسەری دا.

دۆخێکی پڕ حەسرەت.

پەیامبەر و باوکی لە لایەک، هاوسەر و خۆشەویستەکەی لە لایەکی تر.

هەموو ئەمانە تاڕادەیەک ئاسایی بوون، تا ئەو کاتەی هاوسەرەکەی چەکی لە دژی پەیامبەری باوکی بەرز کردەوە.

قورەیش تەپڵی جەنگی کوتا
پیاوانیان بۆ جەنگ کەوتنە ڕێ
ئەبی عاسیش وەک ئەوانی تر
بۆ جەنگی سوپای ئیسلام خۆی خستە ڕێ

لووتی قورەیشیان شکا، جەنگ بە سەرکەوتنی سوپای ئیسلام کۆتایی هات، زۆر لە قورەیشیان کوژران، ژمارەیەکی تریان بە دیل گیران. ئەبی عاس لە ڕیزی دیلەکاندا بوو.

دوای بانگەوازی پەیامبەر بۆ ئازادکردنی دیلەکان لە بەرانبەر برێک پارەدا، کەسوکاری دیلەکانی مەککە کەوتنە خۆ، هەریەکەیان برێک پارە و خشڵ و زێڕیان هێنا.

بە مەبەستی وەرگرتنەوەی دیلەکانیان، زەینەبیش وەک هەموو ئەوان ملوانکەیەکی وەک فیدیە نارد کە پێشتر خەدیجەی دایکی بۆ بوکێنی پێی بەخشیبوو.

کاتێک پەیامبەر چاوی بە ناو پارە و سامانی فیدیەی قورەیشدا گێڕا، چاوی کەوت بە ملوانکەکەی خەدیجە، خورپەی خۆشەویستی خەدیجە دای لە دڵی، چاوی پڕ فرمێسک بوو، زانیی زەینەب ناردوویەتی لەپێناو ئازادکردنی ئەبی ئەلعاسدا.

داوای کرد لە هاوەڵانی زاواکەی ئازاد بکەن و یادگارییەکی دایکی بگێڕنەوە بۆ زەینەب، هاوەڵان بە دەم داواکەیەوە چوون.

ئەبی عاسی ئازاد کرا و پەیامبەر داوای لێ کرد زەینەب ڕەوانەی مەدینە بکات، چوون ئەو کات فەرمانی خودایی دابەزی بە جوداکردنەوەی ئافرەتی مسوڵمان لە پیاوی موشریک.

ئەبی عاس پەیمانی دا داواکەی پەیامبەر جێبەجێ بکات. لە کاتی گەیشتنەوەی بە مەککە، بینیی زەینەب بە دڵێکی کەیل و چاوێکی پڕ فرمێسکەوە چاوەڕێی گەڕانەوەی دەکات، ئەویش بە دڵێکی بریندار و پەیمانی دابڕانی دەگەڕێتەوە، ڕووی کردە زەینەب و گوتی: باوکت داوای لێ کردووم بتگەڕێنمەوە بۆ لای ئەو، چونکە ئیسلام من و تۆ لێک جودا دەکاتەوە، ئیتر تۆ حەڵاڵی من نیت.

پەیمانم داوە بە باوکت بڕۆیت بۆ لای ئەو دڵنیا بە، هیچ کات لە پەیمانەکەم پەشیمان نابمەوە، زەینەب دانی بە خۆیدا گرت و بەوپەڕی ئارامی، متمانەوە گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگاری بوو.

ئەبی عاس بە یاوەریی لەگەڵ کەنانەی برای بۆ ئەوەی بیگەیەنێتە دەستی زەیدی کوڕی حارس و لەوێوە بۆ مەدینە، تاقمێک لە قورەیش ڕێیان لێ گرتن. ئەو تاقوتەرا مسوڵمانەی دوای جەنگی بەدر لە مەککە مابوونەوە، دووچاری توندوتیژییەکی زۆر هاتبوون، چونکە دوای بەدر قورەیشییەکان تەواو دڵیان گەرم بوو، دەیانویست بە هەر ڕێگەیەک بێت تۆڵەی ئەو شکستەیان بکەنەوە، یەکێک لەو تاقمەی قورەیش بە ناوی (هەباری کوڕی ئەسوەد)ـەوە

ڕمەکەی لێ ڕاکێشا و ترساندنی، کینانەی هاوەڵی زەینەب ڕاپەڕی و دەستی دایە تیرەکەی و بە قورەیشیەکانی گوت: سوێند بێت، ئێوە باش دەزانن هەر تیرێک بوەشێنم هەڵە ناکەم، ئامانج دەپێکم، هەر پیاوێک لێم نزیک بێتەوە، تیرێک لەسەر سنگی توند دەکەم.

ئەبوسوفیان پێی گوت: تیرەکانت لابە، وەرە پێکەوە قسە بکەین.

تۆ کارێکی باشت نەکردووە لە پێش چاوی خەڵکی، دەتەوێت لە مەککە بیبەیتە دەرەوە، لە حاڵێکدا ئێمە دووچاری چ کۆست و ناڕەحەتییەک بووین، گەر وا بکەیت خەڵکی وادەزانن ئێمە بەهۆی ئەو بەڵایەی بەسەرماندا هاتووە دووچاری ترس و شکست بووین. سوێند بێ، بە زیندانی و هێشتنەوەی ئەم ئافرەتە لێرە هیچمان لە باوکی دەست ناکەوێت.

ئێستا بیگێڕەوە تاوەکو هەموو لایەک هێور دەبنەوە، خەڵکی وادەزانن بەهۆی هەڕەشەی ئێمەوە گەڕاوەتەوە لە کات و دەرفەتێکی تردا بە نهێنیی بیگەیەنەرە لای باوکی.

کنانە ڕازی بوو... دوای ماوەیەکی تر زەینەبی بەنهێنی گەیاندە مەدینە.

بۆ ماوەی شەش ساڵ لە دووریی ئەبی عاس لەگەڵ دوو منداڵەکەی لە ماڵی پەیامبەر مایەوە.

ئەبی عاس لە مەککە سەرقاڵی کاری بازرگانی خۆی بوو، لەدوای بەدر بەشداریی هیچ جەنگێکی نەکرد دژی مسوڵمانان. ماوەیەکی کەم پێش فەتحی مەککە، قافڵەیەکی بازرگانیی قورەیشی خستە ڕێ، لە ڕێگە قافڵەکەی کەوتە کەمینی سریەیەکی سوپای ئیسلامەوە، دەستیان گرت بەسەر ماڵ و دارایییەکەیدا... ئەو هەر چۆن بوو خۆی دەرباز کرد و دەستگیر نەکرا... شەوێک بەدزییەوە خۆی کرد بە لای زەینەبدا و داوای لێ کرد پەنای بدات... ئەویش پەنای دا.

بەرەبەیان وەختی نوێژی بەیانی، کاتێک پەیامبەر خەریک بوو پێشنوێژیی بۆ مسوڵمانان دەکرد زەینەب بە دەنگی بەرز هاواری کرد: ئەی خەڵکینە، من داڵدەی ئەبی عاسی کوڕی رەبیعم داوە، پەیامبەر فەرمووی: سوێند بەو خودایەی گیانی منی بە دەستە، هیچم نەزانیوە ئێستا وەک ئێوە گوێم لێی دەبێت...

پەیامبەر چووە لای و پێی گوت: کچی خۆم رێز لە میوانەکەت بگرە، ئاگادار بە ئەو بە تۆ حەڵاڵ نییە.

دواتر پەیامبەر ناردی بە شوێن ئەو سریەیەی ماڵەکەیان داگیر کردبوو، گوتی: وەک دەزانن ئەو پیاوە لە ئێمەیە و ماڵ و داراییەکەیتان داگیر کردووە، گەر چاکە بکەن و بۆی بگێڕنەوە، ئەوا ئێمە خۆشحاڵ دەبین... ئەگەر نەیشیگێڕنەوە، ئەوا ئەو ماڵە مافی ئێوەیە گوتیان: فەرمانتە ئەی خۆشەویست، دەیگێڕینەوە.

تەواوی ماڵەکەیان بۆ گێڕایەوە پاشان ئەبی عاس گەڕایەوە بۆ مەککە و تەواوی کەلوپەل و ئەمانەتی گێڕایەوە بۆ خاوەنەکانیان، پاشان رووی کردە ئامادەبوانی قورەیش و گوتی:

ئەی قورەیش هیچ کەس لە ئێوە شتێکی لای من ماوە؟

گوتیان نەخێر ئەوەی لات بوو گێڕاتەوە.

ئەبی عاس: دەی من شایەتی دەدەم (اشهد الا اله الاالله وان محمدا عبده ورسوله)، سوێند بێت تەنها لەبەر ئەوە مسوڵمانبوونی خۆم لە مەدینە رانەگەیاند، نەبادا وا گومان بەرن بە تەماعی خواردنی ماڵ و دارایی ئێوە مسوڵمان بووم.

ملی رێی گرت بەرەو مەدینە و لەوێ جارێکی تر مسوڵمانبوونی خۆی راگەیاند، داوای کرد لە پەیامبەر زەینەبی پێ بداتەوە.

خۆشەویست داواکەی قەبووڵ کرد و زەینەبی بۆ گێڕایەوە...

پێکەوە ژیان تا کۆتایی تەمەنیان.

ئەبی عاس چەند ساڵێک دوای زەینەب ژیا
دواتر ئەویش بۆ لای پەروەردگاری گەڕایەوە.

## وانەی دووەم

زەینەب بە هۆکاری جۆراوجۆر لە هاوسەرەکەی جیا بووەوە. لە ساتێکدا تەواوی هۆی جیابوونەوەیان پێکڕا کۆبوونەوە ڕووداوەکانی ئەو قۆناغە ئاماژەی دیاری لێکجیابوونەوەیان بوو، بەڵام زەینەب لێی جودا نەبووەوە، هاوسەرەکەیشی بە هەمان شێوە.

هەردوو تا لووتکە ئەویندارى یەکتر بوون. کاتێک ئەوی ترمان زیاتر لە خۆمان خۆش دەوێت، بیرمان لای ئەو هۆکار و کەرەستانەیە پێکەوە کۆمان دەکاتەوە.

نەوەک لە یەکمان جیا دەکاتەوە. گەرچی ئەوەی پێکەوەمان دەبەستێتەوە تەنها سۆز و پێوەندییە ڕۆحییەکانە، لە ڕاستیدا تەواوی پێوەندییەکان ئاڵۆز بن.

بگرە بە تەواوی کۆتاییان هاتبێت، ڕۆژگار لێکی جودا کردنەوە. زەینەبی یەکتاپەرست کچی پەیامبەر، هاوسەری بێباوەڕ ئیتر ژیانی هاوسەرییان کۆتایی هات.

زەینەب تاکە ئیمانداری بێدەسەڵاتی نێو ماڵی هاوسەرەکەی، هاوسەرەکەی بەوپەڕی تواناوە دژی باوکی و پەیامبەرەکەی دەجەنگا.

زەینەب هەرچۆن بوو
لەسەر ئەم دۆخە ئارامی گرت
ئامادە بوو مێخ لە دڵی بدا و خۆ ڕاگرێ
ئارامی نەبوو لەسەر دابڕانی
کە ڕۆحەکان یەکیان گرت

ئیتر بەرژەوەندیی تایبەت نامێنێ
چەمکی (من) دەسڕێتەوە، (ئێمە) جێگەی دەگرێتەوە
گەیشتن بەم مەقامە
نارەحەتییەکان وەک خۆشی دەهێنێتە پێش چاو
لە حاڵی دەرچوون لە قۆناغی من
و گەیشتن بە مەقامی ئێمە
ئیتر ئازارە تایبەتەکانمان بایەخێکیان نییە
تەنها ئازارە هاوبەشەکان دەبنە جێی بایەخی ئێمە
وێنەی ئەبی عاسی بێباوەڕ
کە دژی بانگەوازی پەیامبەر وەستایەوە
لای زەینەب بوونی نییە
وێنای هاوسەر و خۆشەویستی هەمیشەیی
لە دڵی زەینەبدا جێگیر ببوو.

## وانەی سێیەم

ئیسلام گوزارشتە لە هەڵسوکەوت، پەروەردگاری سەیری ڕووکەش ناکات، سەیری نێو دڵان دەکات، مرۆڤی دڵپاک و سروشت خاوێن... گوزارشت لە حەقیقەتی فیترەی ڕەسەنی خۆی دەکات، خۆشەویستی لە فیترەتی مرۆڤەوەیەوە، زۆر جاریتر پەرستنشە، هەستی خۆشەویستیی دیاری پەروەردگارە، نادروستە ئایین ڕێگری ئەم هەستانە بکات.

ڕێگریکردن کەوتنە نێوان دوو دڵ وەک تاوانێکی مەترسیدارە
پەیامبەری باوک ڕێگری لە چیرۆکی ئەوینی
نێوان زەینەب و ئەبی عاس نەگرت
عاس لەسەر ئایینی خۆی بوو

توورە نەبوو لەوەی زەینەب داڵدەی داوە
لە حاڵێکدا هاوسەریشی نەبوو
لۆمەی نەکرد لە دانی فیدیەی
گەرچی هاوسەرەکەی جەنگاوەری دوژمنان بوو
خۆشەویستیی شوورەیی نییە
تا هەوڵی داپۆشینی بدەین
تاوانێک نییە
ئەنجامدەرەکەی لەسەری سزا بدرێت
خۆشەویستی و ئەوین کاری دڵە
ئەو دڵەی لە نێوانی پەنجەکانی پەروەردگاردایە
خۆشەویستیی سنووری خۆی هەیە
ئیسلامیش وەک ئایین مافی خۆی هەیە
زەینەب دەیزانی چی لەسەرە و دەبێت چی بکات
عەودالی ئەویندارەکەی بوو
تا ئەو سنوورەی ئایین ڕێگەی دابوو
ئیمان و خۆشەویستی پێکەوە بوون
لەنێو دڵی زەینەبدا ئۆقرەیان گرتبوو
بێ ئەوەی لێکدژییەک لەنێوانیاندا هەبێت
زۆر جار خۆشەویستیی جۆرێکە لە ئیمان
دڵسۆزیی زەینەب بۆ خۆشەویستەکەی
نەبووە ڕێگر لە پاراستنی سنووری دینەکەی

زەینەب دەیتوانی دوای دابڕانی لە ئەبی عاس جارێکی تر هاوسەرگیری بکاتەوە. شەش ساڵی دابڕان بەس بوو بۆ ئەوەی خۆشەویستەکەی لە یاد بکات و سەرلەنوێ دەست پێ بکاتەوە.

ئەوین کارێک دەکا لە تەواوی مرۆڤەکانی سەر زەوی
بە یەکچاوی و یەکسانی بڕوانین
تەنها ئەو مەحبووبەی
لەنێو دڵمان نیشتەجێیە
ئەوین کارێک دەکات چاوی دڵ
جگە لە مەحبووب کەسی تر نەبینێت
چاوانمان جگە لەو کەسێکی تر نابینێت
کارێک دەکات
گشت ڕێگاکانی ژیانمان
بچنەوە سەر ڕێی خۆشەویست
ئەوینداری هەستێکت پێ دەبەخشێت
گشت کات بەهانە بۆ هەڵەی مەحبووب دەهێنیتەوە
حافز گوتەنی:
عاشقی ڕاست بە تیری دۆست نامرێت
زەهری تاڵم بدەرێ
وەک ئاوی سەرچاوەی
سازگارە بۆم
لە هەموو کردارێکی خۆشەویست تێدەگەین
لەگەڵ هەموو دابڕانێک چاوەڕوانی گەڕانەوەی دەکەین
ئومێد ئەوەیە لەوپەڕی لووتکەی
ئاماژەکانی بێئومێدیدا
چاوەڕێی خۆشەویستەکەت بکەیت.
ئەبی عاس تەنانەت دوای جیابوونەوەی
لە زەینەب هەر هاودەمی بوو
هاودەمی ڕۆحی

هاودەمی ڕێگەی چاوەڕوانی
تا ئەو کاتەی گەڕایەوە لای.

## وانەی چوارەم

هەڵوێستی کچێکی پڕ لە ئەوینی قوربانیدەر و هۆگر بە ئەوینداری، لەولایشەوە هەڵوێستی باوکێکی ژیر و خاوەن هۆش، ڕووداوێکی سەرنجڕاکێشە... ئەو ملوانکەیەی هاوسەرەکەی بەخشیویەتە کچەکەی، وەک فیدیەی سەربازێکی سوپای دوژمن دێتە بەردەستی جەنگاوەرێک لە مەیداندا، شیروتیری لە دژیان سوی، بە سەختی لە دژی جەنگدا دڵی دەجۆشێت بە دڵ و چاوی باوکایەتی دەڕوانێت، باوکایەتی زاڵ نەبوو بەسەر بەرپرسیارێتی و دادپەروەریدا، ڕووی کردە هاوەڵانی، ئەوانەی کە بەوپەڕی تواناوە بەرگرییان لە ئایینەکەیان کردبوو، گوتی: چی دەڵێن ئەگەر دیلەکەی بۆ ئازاد بکەین و فیدیەکەی پێ بدەینەوە.

جگەرگۆشەکەی سەرپشک کرد، ناچاری نەکرد لە هاوسەرەکەی جیا ببێتەوە، مادام تا ئەو کات ئایین نەبووە ڕێگر. کیژی نەسەندەوە لەو پیاوەی هەتا ئەو کات بانگەوازی خودای قبوڵ نەبوو.

دەسەڵاتی باوکایەتیی خۆی نەخستە گەڕ
بۆ جیاکردنەوەی نێوانی دوو ئەویندار
باوکایەتی مانای ئەوە نییە
لەبریی منداڵەکانت بڕیار بدەیت
واتای ئەوە نییە تەنها فەرمان دەربکەیت
بۆچوونەکانت بسەپێنی
پێتوابێت تەنها بۆچوونەکانی تۆ دروستە
باوکایەتی هونەرە

جیاواز لە تەواوی هونەرەکانی تر
تێگەیشتنە، ئەخلاقی جوانە
هەستکردنە بە پێداویستی منداڵەکان
پاراستنیان و ڕاستکردنەوەیان بەبێ شکان
ئەو کاتەی هەست دەکەیت هەڵەن
گشت مرۆڤێک مافی ئەنجامدانی هەڵەی تایبەتی خۆی هەیە
فێری ئەزموونەکان نابین تا ئەو کاتەی دەکەوینە هەڵەوە
زۆر جار پێویستمان بە ئەزموونە بۆ ئەوەی تێبگەین
زۆر جار ئامۆژگارییە تیۆرییەکان گرینگییەکی ئەوتۆیان نییە
ئامۆژگاریی کرداری ئەزموونی سەرکەوتوو دەبەخشێت
کاتێ بە توندی ڕێگری دەکەیت
لەو کارەی منداڵەکانت دەیانەوێت بیکەن
دڵنیا بە لە پشتی تۆوە دەیکەن
هەڵەکانیان ئەو وانانەن فێری ئەزموونی ژیانیان دەکەن
نەک ئەو هەڵانەی کە دەبنە مایەی کارەسات بۆیان
کاری لە پێشینەی باوکە
لە ئامادەسازیکردنی منداڵەکانی بۆ چوونە نێو کێبڕکێی ژیان و دەربازبوونیان لێی بە کەمترین هەڵە
باوکایەتی واتای بێبەشکردنی منداڵەکان نەبێت لە ژیان
با گوزارشت بێت لە ڕاستکردنەوەی هەڵەکانیان لە کاتی گونجاودا
باوکی سەرکەوتوو ڕێگری لە ئەزموونی تایبەتی منداڵەکانی ناکات
کاری باوک یارمەتیدانی منداڵەکانیەتی لە سوودوەرگرتن لە تەواوی ئەزموونەکانی ژیان

دەستگرتنی منداڵەکان بۆ ئەوەی نەکەون
بە تەنها کاری باوک نییە
ئەرکی باوکە بۆ ئەوەی دەستی بکاتە دیوار
بۆ هەستانەوەی جارێکی تری منداڵەکان
هەموو ئەمانە بە هاوار و فەرزکردنی بۆچوون ناکرێت
بە زمانی هێمن و پڕ لە سۆز
باوکان دەتوانن ئامۆژگارییەکانیان
لەسەر دڵی مندڵەکان هەڵبکۆڵن
تێگەیشتنی باوک گرنگە لەوەی
چ کاتێک منداڵەکەی پێویستی بە ئامۆژگارییە
باوکێک بە، منداڵەکانت لێت ڕانەکەن، بۆت ڕابکەن.
ئەو دیوارە بە کاتێک منداڵەکانت
لە ڕاکەڕاکی نێو کۆڵانەکانی ژیان ماندوو دەبن
بۆ حەوانەوەی ساتێکیان پاڵت پێوە بدەن.

خۆشەویست نموونەی میهرەبانترین باوکی مێژووە لەنێو ئەو مزگەوتەی کە تێدا پێشنوێژیی بۆ مسوڵمانان دەکات، کچەکەی بە دەنگی بەرز هاوار دەکات، هاوسەری پێشووی و دوژمنی سەرسەختی مسوڵمانانی داڵدە داوە... نوێژەکەی کۆتایی پێ دەهێنێت، بۆیان ڕوون دەکاتەوە کە بە هیچ شێوەیەک ئاگای لە کارێکی لەو شێوە نییە.

پاشان بەوپەڕی لەسەرخۆییەوە، ڕێنمایی پێویست بە کچەکەی دەدات، سەرکۆنەی نەکرد لەبەر ئەوەی لەنێو خەڵکدا نیگەرانی کردووە، لەنێو خەڵکیدا ئیزنی لێ نەخواستووە

تۆمەتی نەخستە پاڵی بەهۆی ئەوەی پیاوێکی بێگانەی لە ماڵەکەی خۆیدا داڵدە داوە.

بە بێمتمانەیی خۆی هەستی متمانەی زەینەبی نەشکاند، زەینەب بووە خاوەنی ئازایەتی و حەقبێژیی زیاتر لەگەڵ بوونی دونیایەک سۆز و خۆشەویستی لای زەینەب، بەڵام ئەو سنوورەکانی خۆی بە باشی دەناسی.

## وانەی پێنجەم

خۆشەویستی هەڵوێستە
قسە و بانگەشەی بریقەدار نییە
لە خۆشگوزەرانیدا هەمووان دەتوانن ئەویندار بن
گەر بە وشە و ڕستە بێت...
تەواوی شاعیران ئەویندارن
هەر گا ئەوین لە دڵدا جێگیر بوو،
تەواوی ئەم سنوورانە دەبەزێنێت
سنووری وشەکان، بەرەو کردار تێدەپەڕێنیت.
لە ساتەکانی هەڵوێستدا
سیحربازانی دونیای وشە
هەڵوێستێکیان نامێنێت
ئەویندارە پۆڵایینە بێدەنگەکان
هەڵوێستیان مەزنتر و باڵاترە لە دەربڕینیان
بوونی تۆ لای زۆرێک لە خەڵکی
شایستەی تاکە قوربانیدانێک نییە
لە دڵیاندا جێگەی ڕاستەقینە بۆ تۆ نییە
وەک ئەوەی بیرت لێ دەکردەوە
لە دڵی ئەواندا جێگەیەکت نییە
کەوایە شایستە نین

له دڵی تۆدا بۆ بوونیان شوێن و ساتێک هەبێت
کاتێ خۆشبار و گونجاویت لەگەڵیان
به جوانترین شێوه لێت دەڕوانن
هەر شەقاوێک له ڕێ لاتدا
هەزار جێگرەوەت بۆ دەبیننەوە
له سەختەییەکاندا دۆسته ڕاستەقینەکانت بۆ دەردەکەوێت
تێدەگەیت لەوەی کێ به ڕاستی خۆشی دەوێیت
خۆشەویستیی ئەو هەستەی ڕۆحت
ئاگری تێبەردەبێت
دەبێته قەقنەس
کاتێ مەحبووب ئازاری پێ دەگات
عاشقی پاکدۆستی دوور له چاوانی
لەنێو دڵیدا نیشتەجێ دەکات
وێنای دۆستی دوور
له چاوانی تەواوی ئەوانی تردا بەدی دەکات
چەنده قەشەنگه ئەو ئەوینەی
له لووتکەی ساتەکانی سەرقاڵیدا
شەوقی دڵت بۆی دەگرێت
خەیاڵێکی دۆستانەی دەکەیت
فرمێسک، یان زەردەخەنەیەکی بۆ دەچرێت
خۆشەویستیی ڕاستەقینەیه وای له زەینەب کرد
ملوانکەی یادگاریی
دایکی ئازیزی بکاته قوربانی
چاوەڕوانی گەڕانەوەی دەکات له جەنگی باوکی
دواتر بەوپەڕی دڵنیاییەوە

لەنێو ئاپۆڕای خەڵکدا
هاواری پەنادانی دەکات
دوای چەندین ساڵ لە جودایی دڵسووتانی
ئامادە نییە جگە لەو
هیچ کەسی تر ببێتە هاوژینی ژیانی
لەگەڵ مەقامی بەرزی زینەب
هەڵوێستێکی لەم شێوەیە نامۆ نییە
لە بازاڕی ئەوینداری
ئافرەتان لە پیاوان بەهێزترن
خۆڕاگرترن لە شاردنەوەی هەستی پاکیان
ئارام دەگرن تا دواسنوور دڵسۆز دەبن

لەم ڕووداوەدا هەڵوێستی ئەبی عاس جێگەی سەرسوورمانە، چەندین ساڵ دووری لە زەینەب لەگەڵ ئەوەی قورەیشییەکان پێشنیاری جوانترین و خانەدانترین ئافرەتانانی هۆزەکەیان بۆ کرد، بەڵام دڵی نەبەخشییە هیچ ئافرەتێکی تر، بە وەڵامێکی پڕ لە خۆشەویستی و بێ دوودڵی گوتی: سوێند بێت، دەست لە هاوەڵەکەم هەڵناگرم، نایگۆڕمەوە بە هیچ ئافرەتێکی قورەیش، شەرمی نەکرد لەنێو گەورە پیاوانی قورەیشدا خۆشەویستی بۆ زەینەبی کۆنە هاوسەری دووپات کردەوە.

لووتبەرزی نەیگرت، نەیگوت ئایینی باووباپیرانی گۆڕیوە، منی شەرمەزاری لای هۆزەکەم کرد. نەیگوت لەبەر ئەوەی دڵی زەینەبی لە هەموو سەرانی هۆزەکەی بە لاوە گرینگتر بوو.

چەندە سەیرە ئەبی عاس هیچ کات زەینەبی لە یاد نەکرد!
ئەوینێکی چەند بەپێزە
دوای شەش ساڵ لە دابڕانیان

چاوی دڵی جگە لە زەینەب هیچ ئافرەتێکی تری نەبینی.
سەرقاڵی ئاه و ناڵەی دڵی بوو،
کاتێکش گەڕایەوە، بۆ لای زەینەب... گەڕایەوە.

## وانەی شەشەم

دەخیلت بم بێئومێد نەبی
دڵە ئاسنینەکان نەرم دەبن
دوورەکانیش جارێکی تر دێنەوە
مەحاڵ پێویستی بە هەندێک کاتی کەمە بۆ ئەوەی ببێتە مومکین
سەختەکان لەگەڵ ئارامگریدا
ئاسان دەبن و دێنە ڕاستە.
ئەوەی ئەمڕۆ کە پێتوایە
هیچ کات بۆت دەست نایە
ڕۆژگارێک دێت بە ئاسانی دێتە چنگت
جوانترینەکان ئەو شتانەن
درەنگتر پێمان دەگەن
بە دڵنیاییەوە هەر دەگەن
ساتە قەشەنگەکانی دوای چاوەڕوانی
سالآنی پڕ سوێی چاوەڕوانی
دەکەن بە شادی.
لە بیر نەکەی بزانە چی شایستەی چاوەڕوانیی تۆیە
وەستانت لە پشتی دەرگای ئەو کەسەی
ئامادە نییە بۆت واڵا بکا
خۆکوشتنە، کاتکوشتنە
هەڵەیەکی کوشندەیە

سەرەتا بزانە چیت دەوێت
ڕێگەی دروستی خۆت بگرە بەر
لا مەکەرەوە... ئاوڕ مەدەرەوە
زۆر ئاستەنگ دێنە ڕێت
ڕێت دەکەوێت لە بنبەستی ڕێگاکان
ڕێت دەکەوێت لە هەڵدێرەکان
زۆر ئاماژەی بێئومێدیت پێ دەگات
زۆر جار هێندە ماندوو دەبیت
پێتوایە ئیتر کاری خۆبەدەستەوەدانە
وریا بە ڕێگاکە هێندەی نەماوە
دەزانیت کەی دەستپێشخەری دەکەیت
کەی چاوەڕوان دەبیت
کەی هەنگاوەکانت هەڵدەگریت
کەی رادەوەستیت
چ کات ئارام دەگریت
هەندێک جار ڕێگا لە گەیشتن بەچێژترە.

## وانەی حەوتەم

عەرەبەکان پێش ئیسلام خاوەنی چەندین بەهای بەرز و ئەخلاقی بالا بوون، هەموو شتیان دەکردە قوربانی لەپێناو تەنها پەیمانێکدا کە داویانە لە ڕابردوودا، جگە لە پەیمانی زارەکی، بەڵگەیەک نەبوو بۆ پەیمانەکانی نێوانیان پەیمانشکاندن لای ئەوان یەکێک بوو لە قێزەونترین کارەکان. مرۆڤی پەیمانشکێن بە پیاو حیساب نەدەکرا، هەموو شتیان دەکردە قوربانی لەپێناو بەها بالاکاندا، چەند چیرۆکی سەرسوڕهێنەری لەم جۆرە تۆمار کراون.

لەوانە چیرۆکی خۆراگری و بەرخودانی هانی کوڕی مەسعوودی شەیبانی لە بەرانبەر هەڕەشە و مەترسییەکانی ئیمپراتۆریەتی فارسیدا.

بەهۆی ئەو پەیمانەی کە دابووی بە پاراستنی کەسوکاری نوعمانی کوڕی مونزیر و ئەمانەتەکەی نموونەی (سەمەوئەل)، لەبارەی وەفا و پەیمانەوە وەک لە پەندی عەرەبییەدا دەگوترێت: (بەوەفاترە لە سەمەوئەل)، ئیمرولقەیسی شاعیر، قەڵغان و شمشێرەکەی لا جێهێشت و چوو بۆ لای قەیسەر، قەدەری خودا بوو لەو سەفەردا ئیمرولقەیس کۆچی دوایی کرد، دواتر حارسی کوڕی شەمەری غەسسانی خزمی سەمەوئەل ئەم دەرفەتەی بە هەل زانی، داوای کرد لە (سەمەوئەل) کە ئەو قەڵغان و چەکانەی بداتێ.

سەمەوئەل داواکەی ڕەت کردەوە لە قەڵاکەی خۆی لە (تیما) خۆی قایم کرد. کوڕەکەی لە دەرەوەی کۆشک لە لایەن شەمەری غەسسانییەوە دەستگیر کرا، کەوتە گفتوگۆ، هەڕەشەی کوشتنی کوڕەکەی لێ کرد، ئەگەر بە دەم داواکەیەوە نەچێ، سەمەوئەل بە هیچ شێوەیەک نەهاتە ژێر بار، تەنانەت بە سەربڕینی کوڕەکەیشی لە پێش چاوی. کابرا کوڕەکەی سەر بڕی، بەڵام سەمەوئەل هەر ئامادە نەبوو چەک و قەڵغانەکانی ڕادەست بکات، دوای ماوەیەک سەمەوئەل قەڵغان و چەکە ئەمانەتیەکانی گێڕایەوە بۆ میراتگرانی ئیمرولقەیس.

چیرۆکەکانی عەرەب لەم بارەیەوە زۆرن، دەرفەتی باسکردنیان نییە، کاتێک ئیسلام هات، زۆرێک لە ڕەوشتەکانی عەرەبی پشتڕاست کردەوە و بە پەسەندی زانی، لە نموونەی ئازایەتی و بەدەمەچوونی ئەوانی تر و ڕێزگرتن لە میوان، داڵدەدانی کەسانی لێقەوماو و

ڕێزگرتن لە حورمەتی ماڵ و عیزەتی و نەفس و هتد... بوونی ئەم بەها جوانانە پێش ئیسلام لای عەرەبەکان وامان لێ دەکەن، لەنێو خۆماندا بۆیان بگەڕێین، ڕۆژگارێکی سەیرە، لێقەوماوان زۆر و داڵدەدران کەم.

تەنانەت بەها باڵاکانی عەرەبمان لا نەماوە

بە شێوەیەک بە شەرمەوە باس لە بەها ئەخلاقییەکانی عەرەب دەکرێت

دوورکەوتنەوە لە ڕەسەنایەتیمان کردووەتە عادەت

لەژێر ناوی زمانی سەردەم

لەپێناو کۆمەڵێک زاراوەی وشک و بێرۆح

پشت لە زمانی ڕەسەنی خۆمان دەکەین.

تەنها بۆ ئەوەی پێمان بگوترێت لە جیهانی ئەمڕۆدا دەژین

پشت لە بەها ڕەسەنەکان دەکەین

بۆ ئەوەی نیشانی دونیای بدەین کە خاوەنی شارستانین.

پشت دەکەین لە براکانمان

بە بیانووی دوورکەوتنەوە لە کێشەکان

لە ئایینەکەمان پشت دەکەین

نەبا پێمان بڵێن تیرۆرستن

بۆ ئەوەی پێمان نەڵێن دەشتەکی

پشت لە جوانترین بە هاکان دەکەین.

## ئەوەی بە خودا سوێندی خوارد

ئەبوداد لـە سونەنەکەی خۆیـدا دەگێڕێتـەوە خۆشەویسـت فەرموویەتی: دوو پیاو لە بەنی ئیسرائیل هـاوڕێ و دۆستی نزیکی یەکتـر بـوون، یەکیـان خوداپەرسـت و کۆشـککار لـە خوداپەرستی، ئـەوی تریـان تاوانبـار و یاخـی.

هاوڕێـی خوداپەرسـت هەمیشـە ئامۆژگاریـی هـاوڕێ یاخییەکـەی دەکـرد تـا ئـەوەی واز لـە تـاوان و بێفەرمانیـی پـەروەردگار بهێنێـت، بـەلام بێفایـدە بـوو.

ڕۆژێـک خوداپەرسـت بینـی هاوڕێکـەی سـەرقاڵی بێفەرمانیـی خودایـە.

گوتی: لە خودا بترسە و واز بهێنە.

هاوڕێکـەی گوتـی: لێمگـەڕێ، لەنێوانـی خـۆم و خـودا، خـۆ خـودا تـۆی نەنـاردوە تـا ببـی بـە چاودێـر بەسـەر منـەوە؟

هاوڕێـی خوداپەرست: سوێند بێت پەروەردگار لێت خۆش نابێت و ناتخاتە بەهەشتەوە.

دوای ئەوەی هەردووکیان مردن و چوونە خزمەتی پەروەردگار.

پـەروەردگار بـە کابـرای خوداپەرسـتی گـوت: تـۆ چـۆن زانیـت نایخەمـە بەهەشـتەوە؟ تـۆ دەسـەڵاتت هەیـە بەسـەر توانـای منـدا؟

دواتر پەروەردگار بە تاوانبارەکەی گوت بە ڕەحمەت و میهری خۆم بچۆرە بەهەشتەوە!

فەرمانی کرد کابرای خوداپەرستیش بەرەو دۆزەخ بەرن!

## وانەی یەکەم

کرداری چاکە و کۆششکردنی زیادە لە پەرستشدا

مرۆڤ لە پایەی بەندایەتییەوە ناگەیەنێتە پلەی خودایەتی.

هەندێک کەس پێی وایە گەر نوێژی کرد و ڕۆژووی گرت، ئیتر بۆی هەیە بە ناوی خوداوە قسە بکات، بەندەکانی خودا پۆلین دەکات بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێت.

پۆلێکیان بۆ بەهەشت و پۆلێکیان بۆ دۆزەخ

وەک ئەوەی بڵێیت کلیلی بەهەشت و دۆزەخ بە دەست ئەوە

وەک ئەوەی بڵێت داوەری ڕۆژی دواییە.

زۆر جار مرۆڤی خوداپەرست

بەهۆی کردارییەوە دووچاری خۆبەزلزانی دێت

بێ خەیاڵ لەوەی ئەویش وەک ئەوانی ترە

لەژێر میهرەبانی پەروەردگاردایە

تەواوی کردارەکان پەیوەستن بە قبووڵبوونیەوە

بە پاداشتی کردەوەمان

ناگەینە ئەعراف، چجای بەهەشتی بەرینی پەروەردگار

وەک ئەوەی بڵێت خودا سەرپشکی کردووە بۆ سەر کاروباری بەندەکانی

وا گومان دەبات گەیشتووەتە ئاستێک

دەتوانێت قسە بکات لە بارەی پەنهانیی

پەیوەست بە حوکمی خوداوە

وەک ئەوی بڵێیت لە دەرگایەکی تایبەتی ئاسمانەوە
دانیشتوانی دۆزەخ و بەهەشت ببێت
هەموان لەژێر میهرەبانی پەروەردگاردایین
گەر ویستی سزامان دەدات
مەیلی کرد لێمان دەبووریت
هەمووان کەمتەرخەم و تاوانبار و پیاوچاک و زاهید
بە ئومێدی بەخشندەیی و میهرەبانییەوە
پەروەردگار دەپەرستین.

## وانەی دووەم

فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە
مانای وا نییە بە شوێن کەموکورتیی ئەوانی تردا وێڵ بین
لە کەمیندا بین بۆ هەڵەکانیان زیاد لەمە واتای ئەوە نییە بەدوای هەڵەی ئەوانی تردا بگەڕێین، هەموو کردەوەکانیان بە هەڵە ڕاڤە بکەین، پێمان وابێت سەرکەوتووین لە دیاریکردنی هەڵەی ئەوانی تر، فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە واتای هۆشیارکردنەوەی خەڵکی لە هەڵە و کەموکورتییە دیارەکانیان بە شێوەیەکی دروست و دوور لە قسەی ڕەق و بریندارکەر.

کاتێک پیاوێک بە خێرایی نوێژ دەکات
لەبری سەرکۆنە گەورەیی و خشوعی بێنەوە یادت
ئافرەتێک دەبینیت شێلگیری دەکات لە باڵاپۆشییەکەی
لەبری وەسفکردنی بە سفور و قولڕووتی
جوانیی حەیا و حورمەت و داپۆشراویی بێنەوە یاد.
لە کۆڕێکدا غەیبەتی تێدا دەکرێت...
لەبریی تێکەوڵاوبوون و هاوبەشییان

ئاگاداریان بکەوە لە سەختیی خواردنی گۆشتی براکەیان
فەرمانکردن بە چاکە
واتای ئەوە نییە خەڵک ناچار بکەیت لەسەر ئەنجامدانی چاکە
بە شێوەیەک دواتر لێیان ببێزرێت
ڕێگری لە خراپە
واتای خۆهەڵقورتاندن نییە
لە پەروەردگاریان
لەکاتێکدا پەروەردگاری خەڵکی
بەبێ ئەنگی ئاوازی (لا اكراه في الدين)
دەداتە گوێی بەندەکانی
ئیتر تۆ کێیت؟
پێمناڵێیت کێیت؟
لەوەی خەڵکی ناچاری عیبادەت و دینداری بکەیت
پەروەردگار بە ترس و خۆشەویستییەوە دەپەرسترێت
بانگەوازکاری ڕاستەقینەی ڕێگەی خودا
میهرەبانی پەروەردگار دەخاتە ڕوو
وریا بە مەبە مایەی دوورخستنەوەی بەندەکان
لە دەرگای گەیشتن بە پەروەردگاریان
هۆشیار بە، بە ناوی بانگەوازی ڕێگەی پەروەردگار
نە بیتە مایەی شکانی دڵی بەندەکانی
ئەو پیاوەی نەوەدونۆ کەسی کوشت
بەهۆی زاهیدێکی تینەگەیشتووەوە
لە میهری خودایی تۆراندی و کردیە سەد
ڕێی لە بانگەشەکارێکی ڕاستەقینەی خودا کەوت
تۆبەی کرد و گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگار

بەهۆی نەزانیتەوە کارە باشەکانت پووچەڵ دەکەیتەوە و
دەبییە مایە داخستنی دەرگاری تۆبە بە ڕووی بەندەکانی پەورەردگاردا
پەروەردگارت بناسە
پێش ئەوەی بانگەوازی بۆ بکەیت
لە نەزانیتەوە هیچ لە بارەی پەروەردگارەوە مەڵێ
بە نەزانی دەرگا دامەخە
بە ڕووی ئەو کەسەی بەشوێن دۆزینەوەی پەروەردگاریدا وێڵە.

## وانەی سێیەم

وریا بە لەو وشانەی بەکاریان دەهێنیت
لەوانەیە وشەیەک بێژەرەکەی
حەفتا ساڵ بباتە نێو ناخی دۆزەخەوە
وەک ئەوەی خۆشەویست دەفەرموێت:

(إِنَّ العبد ليتكلم بالكلمة -مِنْ رضوان الله- لا يلقي لها بالاً، يرفعه الله بها في الجنة, وإن العبد ليتكلم بالكلمة -من سخط الله- لا يلقي لها بالاً، يهوي بها في جهنم) «جاری وا هەیە بەندە بە بێئاگایی قسەیەک دەبێژێ، دەبێتە مایەی ڕەزامەندی پەروەردگار و چەندین پلە لە بەهەشتدا بەرزی دەکاتەوە، جاری وایش هەیە بەندە بە بێئاگایی قسەیەک دەکات، دەبێتە مایەی تووڕەیی پەروەردگار و چەندین پلە دەیخاتە ژێر دۆزەخەوە».

وشە وەک شمێری تیژ وایە
وریا بە بێئاگایی بەکاری مەهێنە
وتەی خراپ مایەی پچراندنی پردی پێوەندیی نێوان تۆ و ئەوانی ترە

وشە جوانەکان و ڕەسەنەکان
پێوەندییە قەشەنگەکان دروست دەکەن.
کارەساتن ئەو وشانەی
دەبنە مایەی تێکدانی پێوەندیی نێوان خودا و بەندەکانی
وشەیەک لە پەروەردگارت نزیک دەکاتەوە
بە وشەیەک لێی دوور دەبیت
جار هەیە مرۆڤ شتانێک دەڵێت
نازانێ لەنێوان ئەو و پەروەردگاردا چی هەیە.
قسە هەیە جەنگ ڕادەگرێت،
قسەیش هەیە سەر لە ناو دەبات.
قسە هەیە خواردنی بۆگەن
دەکات بە ڕۆنی سەر هەنگوین
بەهۆی تاوانێکە مرۆڤێکی تر بە قێزەونی دەبینیت
دەتەوێت چ کارێک بکەیت
نیازت وایە بەندەکان لە سۆز و میهری پەروەردگار دوور بخەیتەوە
پەروەردگار بە زمانی بەزەیی و پڕ میهر و خۆشەویستی
بە بەندەکانی دەفەرموێت: ﴿ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ ﴿٥٣﴾ ﴾ (الزمر)
"نابێ ئێوە لە بەزەیی خودا ناهومێد بن".
تۆ کێیت ئەو مافە بە خۆت دەدەیت
پێچەوانەی پەیامی ئاسمان بدوێیت؟
بە چ مافێک فەتوای بەهەشت و دۆزەخ بۆ ئەوانی تر دەدەیت؟
تۆ کێت بابەتگەلی ناڕەوا دەدەیتە پاڵ پەروەردگار؟
ئەو میهرەبانەی هیچ کات دەرگای میهری
بە ڕووی تاوانباراندا داناخات

گەرچی تاوانەکانیان بگاتە بەرزایی ئاسمان
بەزەیی پەروەردگارە
بەهۆی تێرئاوکردنی سەگێک
لە زیناکارێک خۆش بوو
ئەو خودایەی بە میهری خۆی
وانەی سۆز و میهرەبانیی
فێری پەیامبەری دەکات

وانەی: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ (١٢٨) ﴾ (آل عمران)، «تۆ کارێکت بە کاری ئەوانەوە نییە، چ لەو کارەی کردویانە پەژیوان بن و خودا بیانبورێ، یان لەسەر ناهەقیەکەیان ئازاریان بۆ بڕیار بدا، ئەوان ستەمکارن».
فێری موحەمەد دەکات
دوای ئەمە ئیتر تۆ چی دەڵێیت
بەئاگا هاتی
پەیڤێکت هەیە بۆ گوتن.

## وانەی چوارەم

دۆست دەبێتە ئاوێنەی دۆست
هاوڕێی دڵسۆز
ئەوە نییە هەڵەکانت بۆ جوان دەکات
هاوکاریت دەکات لە بەردەوامی لەسەر هەڵەکانت
دۆستانی باش ئەوانەن
لە ساتی بێئاگاییدا وەئاگات دەهێننەوە
گەر هەڵەت کرد وەبیرت دەهێنێتەوە

سەرت لێ شێوا، ڕێت نیشان دەدا
لە کەوتنەچاڵ دەتپارێزێت
چاکەت کرد، دەستت دەگوشێت
هاوڕێ ئەو قەڵغانەیە لە دوژمنەکانت دەتپارێزێت
گەر ئەو دوژمنە تەنانەت خۆشت بیت
ئەو دوو پیاوە لەو چیرۆکەی ڕابردوودا برای یەک بوون
برایەتیی دۆستایەتی نەک برایەتیی خوێن و گۆشت
تەنها دۆستایەتی و نزیکی
هاوڕێ باشەکەیان ویستی
هاوڕێکەی واز لە تاوانەکانی بهێنێت
لە دڵسۆزیدا زیاد لە پێویست پێداگریی کرد
لە شێوازی بانگەوازەکەیدا هەڵەی کرد

زۆر جار شێوازی ناتەندروست نیەتی باش تێک دەدات، نیەتی باش نابێتە بەهانە بۆ ئاکاری خراپ، بە پێچەوانەوە هەندێک جار ئاکارێکی باش دەبێتە هۆکاری بیرێکی خراپ، مرۆڤ دەتوانێت لە ڕێی ئاکاری جوانەوە خراپترین هرز و بەرنامە بخاتە ڕوو، شێواز و ئاکار بنەمای هەر هزرێکن دەتوانێت بە جوانترین شێوە بیخاتە ڕوو.

بەڵام هیچ کات پێچەوانەکەی ڕوو نادات، هیچ بیرێک ناتوانێت بژی گەر بە خراپی گوزارشتی لێ بکرێت.

خۆشەویستیت بۆ براکەت
دڵسۆزیت بۆ هاوڕێکەت
مافی ئەوەت پێ نادەن سنووری پەروەردگار ببەزێنیت
نیەتی باش شتێکە و
بەهانەهێنانەوە بۆ خراپە بە ناوی نیەتباشتییەوە شتێکی ترە.

## وانەی پێنجەم

پەند بە کۆتایی کارەکانە، بە خۆڕاگریی تا کۆتایی هەمیشە لە نزاکانت

داوای خۆڕاگریی کۆتایی باش بکە

کۆتایی خراپ ماندوویی چەندین ساڵەی مرۆڤ دەسووتێنێت.

عاقیبەتی خێر دەبێتە مایەی لێخۆشبوونی تاوانی چەندن ساڵی ڕابردوو

لە بیری نەکەیت کردارەکانت هیچت پێ نەبەخشن

گەر سۆز و میهری پەروەردگار نەبێت

لە بیری نەکەیت هەرچەندە کردەوەی باش بکەیت لە کۆتاییدا تۆ مرۆڤێکی لاوازی

ئەوە خۆشەویستی خودا، موحەمەدە

پەروەردگار لە تاوانی سەرەتا و کۆتایی خۆش بووە

لە ڕۆژێکدا زیاتر لە سەد جار داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگار دەکات

هیچ کارێک بێ نیازت ناکات لە میهر و لێخۆشووبنی پەروەردگار

بەهۆی میهرەبانی پەروەردگارەوە دەگەیتە لووتکە

کارەکانت نەبنە مایەی لەخۆباییبوون

شانازی مەکە بە چاکی خۆتەوە

پارچەیەک لەناو دڵدا هەیە

ئەگەر چاک و بێوەی بوو، تەواوی ئەندامانی جەستە چاک دەبن

گەر بۆگەن بوو، تەواوی جەستە بۆگەن دەبن.

جێگیری و ناجێگریی دڵ

باشی و خراپی

جێگیری و هەڵدێری

لە نێوانی دوو پەنجەی ڕەحمەتی پەروەردگاردایە.

وەک لە فەرموودەی خۆشەویستدا هاتووە

کەسێک لە ئێوە بەردەوام دەبێت لە کارکردن بە کرداری ئەهلی بەهەشت

تا ئەوەی هەنگاوێک نێوانی ئەو و بەهەشتە

کیتابی لێی هەڵدەگەڕێتەوە

دەبێتە کارکەرانی دۆزەخ و دەچێتە نێو دۆزەخەوە.

بە پێچەوانەوە کەسێک بەردەوام بێت لە کارکردن

بە کرداری ئەهلی دۆزەخ تا ئەوەی هەنگاوێک نێوانی ئەو و دۆزەخە

کیتابی لەسەر دەگۆڕێت و دەبێتە کارکەرانی ئەهلی بەهەشت و دەچێتە بەهەشتەوە.

## وانەی شەشەم

لە دادگای پەروەردگاردا جگە لە دادپەروەری شتێکی تر نابینیت تێیدا، پەروەردگار مافی خاوەن مافەکان وەردەگرێتەوە، وەک لە چیرۆکەکەدا بینیمان بابەتەکە لەنێوان بەندە و پەروەردگاریدا بوو -خاوەن ماف-. لێرەدا پەروەردگارە خاوەنی لێخۆشبوونە، ئەو مرۆڤانە خاوەنی هیچ نین گومانیان لە لێبووردەیی ئەو هەیە.

لە خزمەتیدا دوو مرۆڤ دەوەستن، یەکیان خاوەن کردارێکی زۆر لەگەڵ گومانێکی خراپ بە پەروەردگار (سوێند بێت پەروەردگار لێت خۆش نابێت)، ئەوی تریان تاوانبارە، خاوەن گومانێکی باش بە پەروەردگارە (لێم بگەڕێ لەنێوان من و خودا) هەر ئەوە دەفەرموێت: (من لەگەڵ گومانی بەندەکەمم).

به میهری خۆی مرۆی کردار خراپ و نیەتباش
دەخاتە بەهەشت
مرۆڤی کردار باش و گومان خراپ
بەهۆی گومانی خراپەوە دەخاتە دۆزەخ
لە تەرازووی ئاسمان پەرستشە جەستەییەکان
بێ پەرسشتەکانی دڵ و ناخ قورساییەکیان نییە
باوەڕبوون بە خودا
واتای باوەڕبوون بە داد و میهرەبانی و
پاداشت و سزای پەروەردگار
هەندێک جار ئەو تاوانەی پێی دەشکێت
بەرەو بەهەشت ڕاتدەکێشت
کاری چاکە لە پاڵ خۆبەگەورەزانی
نزیکت دەخاتەوە لە دۆزەخ
بێ ئەوەی بە خۆت بزانی
گومانت باش بێت
بەرانبەر پەروەردگارت

## یەکەمین (قەسامە)[٤] لە جاهلیەتدا

بوخاری دەگێڕێتەوە، خۆشەویست فەرمووی، یەکەم (قەسامە) لە سەردەمی جاهلیەتدا لە ئێمە، بەنی هاشم بوو.

کابرایەکی قورەیشی پیاوێکی لە بەنی هاشم بە کرێ گرت، تاوەکو ئەوەی وشتری لەگەڵدا بلەوەڕێنی.

لەو دەشتە پیاوێکی بینی قوڵفی جەواڵی وشترەکەی دەپچڕێت، هاوار دەبات بۆ کابرای بەنی هاشم، پێوەندێکی بداتێ قوڵفی جەواڵەکەی پێ ببەستێتەوە، ئەویش دەیداتێ، کاتێک وشترەکان لا دەدەن بۆ حەوانەوە، وشترەکان دەبەستنەوە خاوەن وشتر گوتی: پەتی ئەو وشترەیان کوا؟

ئەویش گوتی: پەتی بەستنەوەی نەبوو.

خاوەن وشتر تووڕە بوو، داردەستەکەی تێگرت و خستیە قەراغی مەرگەوە و جێی هێشت، هێشتا گیانی دەرنەچوو، کابرایەکی یەمەنی بە لایدا تێپەڕی.

٤ قەسامە: شێوازێکە لە چارەسەری ئاریشەی خوێن لەناو عەرەبدا، بە کورتی واتای ئەوەی گەر کەسێک لە شوێنێکدا بکوژرایە و بکوژەکەی دیار نەبوایە و بەڵگەیەکی دیار نەبوایە لەسەر کوشتنی، ئەوا (٥٠) پیاوی هۆزی تۆمەتبار سوێندیان دەخوارد کە تۆمەتبار لە هۆزی ئەوان نییە، دواتر هەرکەس لەو پەنجا کەسە ویستبای سوێند نەخوات لە بەرانبەردا دوو وشتری دەدرایە.

بریندارەی سەرەمەرگە بە کابرای یەمەنیی گوت: ئەمساڵ دەچیت بۆ حەج؟

- بەتەما نیم، بەڵام لەوانەیشە بچم.

- هەر کات بۆت ڕێکەوت دەتوانیت پەیامێک لە منەوە بگەیەنیتە مەککە؟

- بەڵێ دەیگەیەنم.

- ئەگەر چوویت هاوار بکە ئەی قورەیش، گەر وەڵامیان دایەوە، بڵێ ئەی ئالی بەنی هاشم، گەر هاتن بە دەنگتەوە، بپرسە ئەبوتالیب کامەیە، هەواڵی پێ بدە، فڵانەکەس لەسەر پەتێکی وشتربەستنەوە منی کوشتووە.

دواتر کابرای بریندار وشترەوان لە بەنی هاشم دەمرێت.

کاتێک کابرای خاوەن وشترەکان دێتەوە، ئەبوتالیب چووە لای و پێی گوت هاوەڵەکەمان چی بەسەر هاتووە.

گوتی نەخۆش کەوت و مرد و منیش بە جوانترین شێوە سەروکاری ناشتن و سپاردنیم کرد.

ئەبوتالیب: کاری ئاوا جوانت لێ چاوەڕێ دەکەم.

ماوەیەکی بە سەردا دەچێت، کابرای ڕاسپێراوی یەمەنی دەچێت بۆ حەج.

هاوار دەکات ئەی قورەیش.

گوتیان: ئەوانە قورەیشن.

بانگی کرد: ئەی ئالی بەنی هاشم.

گوتیان: ئەمانە بەنی هاشمن.

بانگی کرد: ئەبوتالیب لەکوێیە؟

گوتیان: ئەوە ئەبوتالیبە.

گوتی: فڵانە کەس ڕایسپاردم پەیامێکت پێ بگەیەنم «فڵانە کەس

لەسەر پەتێکی وشتربەستنەوە کوشتوویەتی»، ئەبوتالیب چووە لای کابرا و پێی گوت: تۆ هاوەڵەکەی ئێمەت کوشتووە، کەوایە لەم سیانە یەکیان هەڵبژێرە.

پێتخۆشە سەد وشتر بدە، گەر پێتخۆشە پەنجا پیاو لە هۆزەکەت سوێندت بۆ بخۆن کە تۆ نەتکوشتووە،

دەنا لەبری کوژراوەکەمان دەتکوژینەوە. کابرای بکوژ هاتە لای هۆزەکەی و بابەتەکەی پێ ڕاگەیاندن.

هۆزەکەی گوتیان ئێمە سوێند دەخۆین، ئافرەتێکی بەنی هاشم کە ژنی پیاوێک بوو، لە هۆزی کابرای بکوژ، هاتە لای ئەبوتالیب و پێی گوت: ئەی ئەبوتالیب پێمخۆشە پیاوێکی تر بخەیتە شوێنی کوڕەکەی من و پەنجا پیاوەکەی پێ تەواو بکە، کوڕەکەی من سوێند مەدە لە جێیەکدا کە سوێندەکان خاوەنەکانیان دەگرن، ئەبوتالیب داواکەی قەبووڵ کرد و کوڕەکەی ئەوی سوێند نەدا.

دواتر پیاوێکی تر لە هۆزی بابای بکوژ هاتە لای ئەبوتالیب و پێی گوت: ئەی ئەبوتالیب پەنجا کەست دەوێت، لەجیاتی سەد وشتر، سوێند بخوات کە هەریەکەیان دوو سەر وشتری بەردەکەوێت؟ ئەوە دوو وشترەکەی خۆم و سوێندم مەدە، ئەویش دوو وشترەکەی لێ وەرگرت، دواتر چلوهەشت پیاو هاتن سوێندیان خوارد. ئیبن عەبباس (خودا لێیان ڕازی بێت) فەرمووی: بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە، ساڵ نەگەڕایەوە بە سەریاندا، لەو چلوهەشت کەسە چاوتروکێنەریان تێدا نەما، هەموویان مردن و لەناو چوون.

### وانەی یەکەم

قەسامە یەکێکە لە بابەتە جاهلییە باوەکان، ئیسلام دانی پێ دان و کاری پێ کرد،

لەو شوێنانەدا کاری پێ دەکرێت کە بارودۆخی ڕووداوەکان تێیدا ئاڵۆز و ناڕوونن.

پیاوێک کوژرا لە سەرەمەرگدا بە هاوڕێکەی گوت: هەواڵی کوشتنم بدە بە ئەبوتالیب.

لە دۆخێکی ئاوادا بکوژ سێ ڕێگەی لە بەردەمدایە: یەکەم، خوێن بدات (سەد وشتر) وەک ئەوەی لای عەرەبەکان باوە. دووەم: یاخود پەنجا کەس لە کەسوکارەکەی سوێند بخۆن کە ئەو نەیکوشتووە. سێیەم: یان لە سزای کارەکەیدا بکوژرێتەوە. ئیسلام ئەم شێوە داوەریکردنەی پەسەند کرد و لە هەندێک دۆخی تایبەتدا کاری پێ کرد.

وەک ئەوەی پەیامبەر لە داوەریکردنی ئەنسارەکان کاری پێ کرد لە بارەی کوشتنی پیاوێکی ئەنساری کە خستبوویانە گەردنی جووەکانی خەیبەر.

## وانەی دووەم

عەرەبەکان لە کەعبە لەنێوان ڕوکن و مەقام سوێندیان لەسەر خوێن دەخوارد

تەنانەت لە قۆناغی جاهیلیشدا

دەیانەوێت پێمان بڵێن

مرۆڤ هەر مرۆڤن لە هەموو کات و ساتێکدا

زۆربەیان ڕێزیان لە پیرۆزییەکان دەگرت

خوێنی مرۆڤیان بە لاوە گرینگ بوو

ئامادە نەبوون سوێندی لەسەر بخۆن

هەندێک تریان خاوەنی هیچ پەیمانێک نەبوون، سوێندیان لەسەر شتانێکی نادیدە دەخوارد.

هەندێکیان بە درۆ سوێند دەخۆن، وەک ئەوەی لە چیرۆکەکەدا هاتووە، بابای تۆمەتبار دەبوو پەنجا کەس لە هۆزەکەی سوێند لەسەر بێتاوانیی ئەو بخۆن. ئافرەتێکی هاشمی خزمی بکوژ، دوای لە ئەبوتالیب کرد، سوێندی کوڕەکەی لەسەر تاونباریی تۆمەتبار قەبووڵ بکات، پیاوێکی تری بتپەرست ڕەتی کردەوە بە درۆوە سوێند بخوات. باو وابوو هەموو سوێندێک دوو وشتری لە کۆی سەد وشتر کەم دەکردەوە، کابرا سوێندی نەخوارد، لەبریی ئەو، دوو وشتری هێنا بۆ ئەوەی گەردن و بەرپرسیارێتیی خۆی پێ بکڕێتەوە.

بە پێچەوانەوە تەواوی ئەوانەی تر سوێندیان خوارد کە تۆمەتبار بکوژ نییە.

ساڵێک تێنەپەری تەواوی ئەوانەی بە درۆ سوێندیان خوارد، گشتیان مردن.

## وانەی سێیەم

هیچ کات دەمارگیریت نەبێت بۆ هۆز و خانەوادەکەت

خۆشەویستی جودایە لە دەمارگیری

کاری دزێو هەر دزێوە

تەنانەت ئەگەر خۆشەویستانمان بیکەن.

چاکە هەر چاکەیە

تەنانەت ئەگەر نەیارانمان بیکەن.

مرۆڤە ڕەسەنەکان هەمیشە لایەنگریی ئەخلاق و ڕاستین، نەک بۆ خزم و کەسوکارەکانیان

خۆشەویستیت بۆ کچەکەت وات لێ نەکات پشتگیریی بکەیت لە دژی هاوسەرەکەی

خۆشەویستیت بۆ کوڕەکەت وات لێ نەکات ڕازی بیت زوڵم لە هاوسەرەکەی بکات

خۆشەویستیت بۆ هاوڕێکەت واتای ئەوە نییە چاوپۆشی بکەیت لە بەرتیلوەرگرتنی

خۆشەویستیی ڕاستەقینە دەستگرتنی خۆشەویستەکانمانە لەوەی کە ستەم نەکەن

داپۆشین و بێدەنگی و ڕازیبوون واتای بەشدارییە لە تاوانەکانیان وەک ئەوەی خۆشەویست دەفەرموێت: (انصر أخاک ظالما أو مظلوما). گوتیان ئەی پەیامبەری خودا دیارە ئەگەر ستەملێکراو بوو، بەڵام ئەگەر ستەمکار بوو چۆن سەری بخەین؟ فەرمووی: دەستی دەگریت ناهێڵیت ستەم بکات، ئەمە سەرخستنیەتی.

## وانەی چوارەم

دەخیلت بم هیچ کات سوێند بە درۆ نەخۆیت

نەبادا خەڵکی ئەهلی جەهل لە تۆ پارێزراوتر بن

پەروەردگار ڕازی نابێت بێباوەڕێک بە سوێندێکی درۆ ستەم بکات.

ئیتر چۆن ڕازی دەبێت مسوڵمانێک بەهۆیەوە ستەمم بکات.

تەواوی پاڵەوانانی ئەم چیرۆکە بکوژ و کوژراو، شاهیدەکان و کەسوکاری کوژراو، هەموویان لە ڕیزی هاوبەشپەیداکەران بوون. پەروەردگار ڕازی نەبوو کابرای موشریک بە ناوی ئەوەوە ستەم بکات. ساڵێکی نەخایاند تەواوی ئەوانەی بە ناوی خوداوە سوێندیان خوارد، گیانیان لە دەست دا، گەر پەروەردگار لە دونیادا مافەکە نەسەنێتەوە، هیچ کات دۆسیەی ستەم داناخات، ڕۆژی دوایی و دادگایی خودا هیچ لە یاد ناکات.

تەنانەت گەر هێندەی گەردیلەیەک بێت، هیچ کات ئەمەت لە بیر نەچێت

دەربازبوون لە خزمەت داوەریی زەوی و ئاسمانەکان تەواوی ئەندامەکانی جەستە دێنە گۆ

ئەوەت لە پێش چاو بێت

دەربازبوونت لە دونیا دەربازبوونێکی کاتییە

مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە کە لە دادگای دونیا ڕاست دەڵێت

بۆ ئەوەی لە دادگای قیامەت ڕزگاری بێت.

## وانەی پێنجەم

ئیسلام ژیانی عەرەبە پێشینەکانی بە جاهلیەت ناو بردووە، هەڵبەت مەبەست لێی جاهیلیەتی ئایینییە بە تەنها، بەو پێیەی ئەوان بتیان دەپەرست، ڕاستە دیاردەکانی داوێنپیسی و خراپە لە نێوانیان بەربڵاو بوو، بەڵام لە زۆربەی کاروبارەکانیاندا خاوەنی زۆر بەهای جوانی ئەخلاق بوون، وەک ئەوەی خۆشەویست وێنای ئەو حاڵەتە دەکات.

وەک ئەوەی دەفەرموێت: (إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق)، ئەمە دانپێدانانە بەوەی ئەوان خاوەنی کۆمەڵێک بەهای باڵا بوون، دادپەروەریی ئیسلام ئاوایە: دانانان بە ئەخلاقی بەرانبەردا لووتکەی مەردایەتییە، کاتێک ڕقت لە مرۆڤێک بوو ڕەوشتە جوانەکانیت بیر نەچێت، مرۆڤێکت خۆش ویست، هەڵە و کەموکورتییەکانیت لە بیر نەچێت، لووتکەی ئەخلاقە ئەوانی ترمان بە دادپەروەری خۆش بوێت و بە دادپەروەریش ڕقمان لێیان بێت.

قسەکردن لە بارەی ڕەوشت و بەهاکانی عەرەبەوە لە سەردەمی نەفامیدا ڕاماندەکێشێت بۆ ئەوەی چەند چیرۆکێکیان بخەینە ڕوو، کتێبەکەمان بەم چیرۆکە کۆتایی پێ بهێنین.

## چیرۆکی یەکەم

پرسیار کرا لە قەیسی کوڕی سەعد: هیچ کەست بینیوە لە تۆ بەخشندەتر بێت؟

- بەڵێ.

جارێک لەگەڵ هاوسەفەرێکم لە گوندێک بووینە میوانی ئافرەتێک، کە پیاوەکە گەڕایەوە، ئافرەتەکە لە دوورەوە هاواری کرد، دوو میوانمان هاتووە

بۆ کاتی ژەم، وشترێکی هێنا و سەری بڕی. بۆ سبەینێ بە هەمان شێوە وشترێکی تری سەر بڕی.

گوتمان بۆ وا دەکەیت؟ وشترەکەی دوێنێ سەرت بڕی کەمێکمان لێ خواردووە، بۆچی وشترێکی تر سەر دەبڕیت؟

- من خواردنی ماوە ناخەمە بەردەم میوانەکانم.

- بەهۆی دۆخێکی باراناوییەوە چەند ڕۆژێکماینەوە، بۆ هەر ڕۆژێک بەو شێوەیە دووبارەی دەکردەوە

کاتێک ویستمان بڕۆین، مێردەکەی لە ماڵ نەبوو، سەد دینارمان جێهێشت.

بە ئافرەتەکەمان گوت: بە ناوی ئێمەوە داوای لێبووردن لە هاوسەرەکەت بکە. پاشان ڕۆیشتین. کاتێک بووە نیوەڕۆ بینیمان پیاوێک بە هەڵەداون دوامان کەوتووە، پڕ بە دەمی هاواری کرد، بوەستن ئەی بێدەربارینە، کرێی میوانداریتان جێهێشتووە! کاتێک لێمان نزیک بووەوە، گوتی دینارەکانتان وەربگرنەوە، دەنا بەم ڕمەم ورگتان دەدڕم. ناچار پارەکەمان وەرگرتەوە و ڕۆیشتین.

## چیرۆکی دووەم

لە سەردەمی جاهیلیەتدا کابرایەکی دەشتەکی لەناو دەوارەکەیدا دانیشتبوو، لەپڕ گوێی لە دەنگدەنگێک بوو،

بە پەشۆکاوییەوە لە دەوارەکەی دەرپەڕی،

بینیی کۆمەڵێک لە خەڵکی بە دار و کوتەکەوە وەستاون.

گوتی: ئەوە چی بووە؟ سەرقاڵی چین؟

گوتیان: بەدوای کونی ئەو کوللەیەدا وێڵین، لە دەستمان دەرچوو، هاتووەتە دەوارەکەتەوە، ئێمەیش دەمانەوێت بیگرین،

کابرای دەشتەکی خێرا خۆی کردەوە بە دەوارەکەیدا،

شمشێرەکەی هەڵکێشا و گوتی:

کوللەیەک هانای بۆ من هێناوە، چۆن ڕادەستی ئێوەی دەکەم؟

کابرای دەشتەکی پاسەوانی لە کونی کوللەکە کرد، تا کوللە لە کون دەرچوو و فڕی،

دواتر کابرا چووە دەرەوە و بە خەڵکەکەی گوت: فەرموون ئەوەی ئێوە بە دوایدا وێڵ بوون، فڕی و لای من نەما، ئیتر مافی بەسەر منەوە نییە.

لەو ڕۆژە بە دواوە لەناو عەرەبدا بووە باو، هەر کەس جوامێر بوایە، دەیانگوت: جوامێرترە لە کابرای پاسەوانی کوللە.

## چیرۆکی سێیەم

سەعسەعەی باپیری فەرزدەقی شاعیر نازناوی زیندووکەرەوەی زیندبەچاڵانی پێ دراوە.

جارێکیان بە لای پیاوێکدا تێپەڕی، بینیی سەرقاڵی هەڵکەندنی بیرێکە، هاوسەریشی لەولاوە دەگری، سەعسەعە بە ئافرەتەکەی

گوت: بۆچی دەگریت؟

- دەیەوێت ئەم کچەم زیندەبەچاڵ بکات.

بە پیاوەکەی گوت: بۆ ئەم کارە دەکەیت؟

- لەبەر هەژاری.

- زیندەبەچاڵی مەککە، دوو وشترت دەدەمێ بە منی بفرۆشە.

کابرا ڕازی بوو، دوو وشترەکەی وەرگرت و ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە بەخێوی بکات و زیندەبەچاڵی نەکات.

سەعسەعە بە خۆی گوت: پێش من هیچ کەس لە عەرەب ئەم کارە چاکەی نەکردووە، سوێند بێت هەر کچێک بزانم زیندەبەچاڵ دەکرێت، نرخەکەی دەدەم و ڕزگاری دەکەم، تا ئەو کاتەی ئیسلام هات، سەعسەعە فیدیەی سێسەد کچی دابوو.

## چیرۆکی چوارەم

نیعمانی کوڕی مونزیر مەلیکی بەناوبانگی عەرەب، دوو ڕۆژی هەبوو.

ڕۆژی نەگبەتی: لەو ڕۆژەوە ڕێی لە هەر کەس کەوتبا دەیکوشت یا بەلایەکی بەسەر دەهێنا.

ڕۆژی نیعمەت: ڕێی لە هەر کەس کەوتبا چاکەی لەگەڵ دەکرد و دەوڵەمەندی دەکرد.

قەدەر وابوو پیاوێک لە هۆزی (تەیی) بەهۆی کارێکی گرنگەوە لە ماڵ هاتە دەر، دوای کەمێک لووتی تەقی بە لووتی نوعمانەوە. کابرا ترسا و زانیی دەیکوژێت. بە زیرەکیی خۆی گوتی:

سلاو لە مەلیکی گەورەمان، چەند منداڵێکی بچووک و خێزانێکی برسیم هەیە، ئاوی نێو چاوم دەڕژێنم لەپێناو بەدەستهێنانی پاروویەک ناندا.

جەنابتـان هیـچ کێشـەیەکتان بـۆ دروسـت نابێت، سـەرەتای ڕۆژ، یـان کۆتایـی ڕۆژ بمکـوژن.

گـەر جەنابی مەلیک ڕێگەم بدات، ئـەم خواردنەیـان پێ بگەیەنـم، پاشـان بگەڕێمـەوە ئـەو کات بمکـوژە.

مەلیک گوتی: ڕێگـەت پێ نادەم تـا پیاوێـک لـە ئێمـە نەبێتـە کەفیلت، گـەر نەگەڕێتەوە دەیکوژین.

شـەریکی کـوڕی عـەدی کـوڕی شـەرحەبیل لەوێـدا بەزەیـی بـە حاڵـی کابـرای تائییـدا هاتـەوە، گوتـی:

پـەروەردگار کارت ڕاسـت بـکات، خـاوەن قـەدر جەنابـی مەلیـک مـن دەبمـە کەفیلـی.

کابرای تائی بەپەلە گەڕایەوە بۆ لای خێزانەکەی.

کات نزیـک بـووەوە لـە خۆرئـاوا، نوعمـان بـە شـەریکی گـوت، خەریکە ڕۆژ بـەرەو ئاوابوون دەچێت، کەچی هاوەڵەکەت دیار نەبوو.

شـەریک: ڕێککەوتووین لەسـەر ئـەوەی هەتـا خۆرئاوابوون هیچـم لێ نەکەیـت.

خۆر ئاوابوو، نوعمـان بـە شـەریکی گـوت: کاتـت هـات، هەسـتە و خـۆت ئامـادە بکـە بـۆ کوشـتن.

شـەریک گوتـی: ئـەوە پیاوێکـە لـە دوورە دێـت هیـوادارم کابـرای تائـی بێـت، ئەگـەر ئـەو نەبـوو، بفەرمـوون فەرمانەکەتـان جێبەجـێ بکەیـن.

کابرای تائی بە هەڵەداوان هات.

بـە نوعمانـی گـوت: جەنابـی مەلیـک بفەرمـوون بڕیارەکەتـان جێبەجـێ بکـەن.

نوعمان سـەری داخست و بۆ ماوەیەک بێدەنگ بوو، پاشان سـەری بەرز کردەوە و گوتی: سـوێند بێت خەڵکی وەک ئێوە سـەیرم نەبینیوە.

ڕووی کردە کابرای تائی و پێی گوت: بەم کارەت جگە لە خۆت، وەفات بۆ کەسی تر نەهێشتەوە.

ڕووی کردە شەریک و پێی گوت، بەم کارەت مەقامی بەدەمەوەهاتنت بۆ هیچ کەس نەهێشتەوە.

سوێند بێت ئیتر واز لەم کارە بهێنم.

بڕیارم دا لە ئێستاوە ڕۆژی نەگبەتیی خۆم لابەرم و واز لەم خووەم بهێنم.

## چیرۆکی پێنجەم

ئیبن کەسیر لە (البداية والنهاية)دا دەڵێت:

پرسیار کرا لە حاتەمی تائی لەناو عەرەبدا کەس لە تۆ بەخشندەتر هەیە؟

گوتی: هەموو عەرەب لە من بەخشندەترن.

شەوێکیان بوومە میوانی گەنجێک

ئەو گەنجە خاوەنی سەد مەڕ بوو، مەڕێکی بۆ سەر بڕیم

کاتێک خستییە بەر دەستم، گوتم ئەم کەللەسەر و مۆخە چەند بەتامە!

گەنجەکە بە بەردەوامی بۆی دەهێنام، دواتر زانیم هەر سەد سەر مەڕەکەی سەر بڕیوە و هیچی بۆ نەماوەتەوە!

گوتیان ئەی تۆ چیت بۆ کرد؟

- منیش سەد وشترم لە باشترین وشترەکانی خۆم پێ بەخشی.

گوتیان کەوایە تۆ لەو بەخشندەتری.

گوتی نەخێر، ئەو لە من بەخشندەتر بوو، من بەشێک لەوەی هەمبوو دام بەو، بەڵام ئەو هەر چی هەبوو، بەخشییە من.

کۆتایی

ADHAM SHARKAWI

# لەگەڵ پەیامبەر ﷺ

دوای ئەوەی خۆری ئیسلام بەنێو ئاسمانی جیهاندا گەشایەوە، لە بیلالی حەبەشییان پرسی، چۆن ئارامت دەگرت لەسەر ئەو سزا توندانەی ئومەییەی کوڕی خەلەفە؟

بیلال لە وەڵامدا گوتی: «شیرینیی ئیمانم تێکەڵ بە تاڵیی ئازار کرد. ئیتر ئارامم دەگرت!»

ئیمان کەشتییەکی سەرسووڕهێنەرە.

گەر دڵی خەڵکی پێوەی پەیوەست بوو، ئیتر حاڵیان بە تەواوی دەگۆڕێت.

ئارامگریی بیلالی ئیماندار، مایەی سەرسامییەکەی ئەوتۆ نییە.

07501269689
07511408868
hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com
سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک- نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆڵ - دوکانی ژمارە (١١)

٧٠٠٠ دینار
ISBN: 978-9922-626-69-7
9 789922 626697